

# هێزە کاراکانی نەست

یان

## نهێنی کەسێتی سەرکەوتوو

د. عەلی وەردی

وەرگێڕانی: کەمال عەلی



چاپی سێیەم

# هێزە کاراکانی نەست

## یان

## نهێنییەکانی کەسێتی سەرکەوتوو

نووسینی: دکتۆر عەلی وەردی

وەرگێڕانی بۆ کوردی: کەمال عەلی

چاپی سێیەم

٢٠١٢

لەبڵاوكراوەكانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
زنجیرە: (٢٥)

ناسنامەی كتێب:-

ناوی كتێب: هێزە كاراكانی نەست
بابەت: توێژینەوەی سایكۆ _ سۆسیۆلۆژی
ناوی نووسەر: دوكتۆر عەلی وەردی
ناوی وەرگێڕ: كەمال عەلی
تایپ: ژیان مەحمود
هەڵەبڕی كۆمپیوتەر: خودی وەرگێڕ
نەخشەسازی كۆمپیوتەر: فواد كەوڵۆسی
نۆبەتی چاپ: چاپی سێیەم
شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
ساڵی چاپ:٢٠١٢
تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارە سپاردن: ٥٣١ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

ناونیشان
سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.
ژمارەی مۆبایل: ( ٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣ ) ( ٠٧٥٠١١٩١٨٤٧ )

# پێڕست

پێشکەشە :

*بە رۆحی پاك و بێگەردی بـاوکی خوالێخۆشـبووم (علي صالح سعيد) کە تـا هەنووکـەش بـەهیوام لە خەونیشدا بێت بەڕووخـساری شـاد بم و رۆحـی هـەردووکمان ئاشـنـای یـەکتر بێـت ... چـونکە بەداخەوە لەتەمەنی دوو مانگیدا بـووم ماڵئـاوایی لێکردم و وەك هەر خێرنەدیوێکی ئـەم کۆمەڵگایـە بێ بەشکرام لەنازی باوکێنیم.

*بە هەرچوار ئەستێرەی درەوشاوەی ئـاسمانی شەوەزەنگم :-

*سۆما

*سۆنیا

*سەنا

*مارکۆ

## بابەتەکانی ئەم کتێبە:

لەنهێنی و شاراوەییەکانی بلیمەتی (عەبقەریەت) و سەرکەوتنە ناوازەو بێ وێنەکانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، یان ئەو شتەی کە خەڵکی بەکشتی پێی دەڵێن: ((بەخت _ شانس))...

هەروەها لە هێزە کاراو لەڕادەبەدەر و هاندەرەکانی ئەست دەدوێت...

لەبەر رۆشنایی بیردۆز و تیۆرە زانستییەکاندا.

## ئاگادارییەك لەم كتێبەوە:

ئەم كتێبە بۆ ئەو كەسانەی پێگەیشتوون و لە تەمەنێكی بەرەو ژووردان و تاڵی و سوێری ژیانیان زۆر دیوە و تاقیكردنەوەكانی رۆژگاریان لەخۆیاندا بەرجەستە كردووە. ئەوا دەبێتە سەرچاوەیەكی بەسوود و گرنگ بۆیان و دەرگای نهێنییەكانیان بۆ دەخاتە سەر پشت. بەڵام بۆ تازە پیاكەوتوان و خوا پێداو و كۆشكراوی ناو ناز و نیعمەت و ئەوانەی وا ساردی و گەرمی ژیانیان نەچێشتووە و هێشتا لەدەرگای كێشە و هەوراز ونشێوەكانی ژیانیان نەداوە، ئەوا پێم چاكە ئەم كتێبە نەخوێننەوە،بەتایبەتی كەسانیهەرزەكارو مێرد منداڵی تازە پێگەیشتوو چونكە لەوانەیە تەقەی سەریان بێت ،بەبێ بوونی ئاستێكی زانستی، نەبادا خوا نەخواستە ببێتە هۆی زیان پێگەیاندنیان.



# پێشەکی وەرگێڕ

بۆچوونە نێو جیهانە بەرفراوان و چڕ و زەوەندەکەی نووسەری گەورە و بەڕێز مامۆستا دکتۆر عەلی وەردی و تاوتویٚ کردن و هەڵدانەوە و ووردکردنەوە و سەرنج و بۆ چوون و فۆرمەلەکارییەکانی ئەو نووسەرە گەورەیە ناتوانین لەوەها پێشەکییەکی کورتدا نرخی خۆی بدەینیٚ و ویژدانمان ئاسوودە بێت بەڵام تەنها ئەوەندەی دەمانەویٚ راگوزەریانە چەند تیشکیٚ بهاوێینە سەر بەها بەنرخ و توێژینەوە زانستییە پڕ مەعریفییەکانی ئەو نووسەرە بەڕێزە. دیارە کەم تازۆرێك کەسایەتی ئەم توێژەر و نووسەرە گەورەیە لای خوێنەری کورد شاراوە نییە و ئەوانەی کە بەرهەمە ناوازەکانیان خوێندبێتەوە و مشت وماڵیان کردبێت تێدەگەن کە تا چ ئەندازەیەك ئەو نووسەرە رۆچووەتە نێو واقیعی کۆمەڵگاکەی خۆیەوە و لەنزیکەوە گۆشە نیگاکانی ئاراستە دەکاتە سەر چەوت و چەوێڵی کۆمەڵگا و باری نالەباری نێو دەست و پێوەندەکانی دەسەڵات و مشەخۆرانی سەرە نوێلکی مێژوو.

ئەوەی لەم کتێبەدا نووسەر باسیان لێوە دەکات و دەردەدڵەکانی خۆی هەڵدەڕێژێت و پەنجە دەخاتە سەر شوێنی مەبەست و پەلکێشمان دەکات بۆ حاڵی بوون لێی ئەو بابەتانەن کە بەشێوەیەکی ئاوەژوو لە نێو کۆمەڵگادا خەڵکی لێیان تیٚ گەیشتووە و وەك پەندە کوردییەکە دەڵێت: (دێزە بەدەرخۆنە کراوە)، لەنێو ئەو بابەتانەدا کە زۆر گرنگی پێداوە مەسەلەی حاڵەتەکانی ((نەست)) و شتە پەنهان و نهێنییەکانە کە بەشێوەیەکی گشتی لەنێو خەڵکیدا پێی دەڵێن: ((بەخت)) یان شانس و تالع و چارەنووس، لەبەر ئەوە بۆ پەردەلادان لەسەر ئەم گەنجینە شاراوەیە نووسەر زۆر زیرەکانە و وردبینانە مامەڵە لەگەڵ حاڵەتەکاندا دەکات و پەنا دەباتە بەر زانستی نویٚ و پاراسایکۆلۆژی و خەواندنی مۆگناتیسی ((هیبنۆتیزم)) بۆ

روونکردنـەوەی نهێنییـە شـاراوەکان هێنانـە دەرەوەی لەبازنـەی خۆرافـە و تەڵەسـم کـاری. چـونکە ((نەسـت)) ئـەو رووبـەرە فراوانەیـە کـە ئەگـەر زانسـتیانە لێـی نەچیتە پێشەوە ئەوا ناتوانیت دەرك بەو راستیانە بکەیت کە ئـەو بەدەسـتیان دێنێت. لێرەدا بـۆ وردکردنـەوە و باسـکردنی هـەموو ئـەو نهێنی و شـاراوانەی کـە بـەهۆی نەسـتەوە دێنـە سـەر ئـەرزی واقیـع نـاتوانن لـەم پێشەکییە کورتـەدا بخەنـە پـێش چـاو. بـەڵام بەخوێندنـەوەی بابەتـەکانی کتێبەکـە و بەدواداچـوونی هـەموو بڕگـەکانی ئـەو کاتـە خوێنەر خۆی هەست بەوە دەکات کە تا چ رادەیەك ((نەستی مرۆڤ)) کاریگەر و هێزی لـەرادە بـەدەر و کـارە نائاسـاییەکان ئـەنجام دەدات، وە نـەبێ لـەم کتێبـەدا تـەنها بەرەورووی بینەوە بەبابەتەکانی ((نەست)) و کاریگەرییەکانی بەڵکو نووسەر دەمانباتـە بەر دەلاقەی چەند حاڵەتێکی سەیر و سەمەرەی تر و کێشمەکێشی نێوان دوو بەرە، کە بەهۆی بەدحاڵی بوونەوە لەیەك تێناگەن و بگرە دەبنە خوێن خۆری یەك. ئەوەش بەتایبـەتی لەمەسـەلە ئایینییەکانـدا زەق دەبێتـەوە و هەنـدێ جـار لەبـەر مـەرامی تایبـەتی و تاکـە کەسـی پیاوانی ئایین هەڵدەستن بەڕەتکردنـەوەی بەرامبـەر و بابەتـە زانستی و دەروونییەکان و لەڕوانگەی دەقە ئایینییەکانەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکـەن و کۆمـەڵێك گـرێ و گـۆڵ و ئاسـتەنگی و مەکـە و بڤـەی بـەباڵا دا دەبـڕن تـا وای لێـدێت خـودی دەقەکـە بـەئاقارێکی تـردا دەبـەن و پراکتیـزەی دەکـەن کـە دەبێتـە هـۆی زیـان پێگەیاندن و داماڵینی مانا حەقیقیەکەی.

هـەروەها بەشـەکانی تـری کتێبەکـە لـەدەرگای چـەند بابـەتێك دەدەن وەك لۆژیـك و فیکر و ئیرادە و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان و توێژینەوە لەشێوازی بەهەڵە بەکار هێنـانی هـەر یەکـە و لەوانـە لەلایـەن کۆمـەڵگاوە و خـستنە رووی راسـتییەکان و ئامـاژە دان بەلایەنە نیگەتیڤەکانی کۆمەڵگا و دوورکەوتنەوە لێیان.

لێرەدا نامـەوێ زیـاتر درێـژەی پێبـدەم و هـەموو بڕگـە و بابەتـەکانی نێـو کتێبەکـە بەنموونە بهێنمەوە و باسی گرنگیان بکـەم، بـەڵکو دەچـمەوە سـەر هـەمان ئـەو خاڵـەی کە هەر لەپێشەکی ئەم کتێبەدا نووسەر ئامـاژەی پێدەکات و دەڵێت: خوێنەری هێژا و خۆشەویـست ئەگـەر پـاش خوێندنـەوەی ئـەم پێشەکییە هیـچت لـێ حـاڵی نـەبووە و

نەگەیشتوویتە ھیچ ئەنجامێك، ئەوا چاکە دەست ھەڵگری لەخوێندنەوەی بەشەکانی تری کتێبەکە و خۆت لەگەڵیان ماندوو نەکەیت.

دیارە نووسەر لەخۆڕا ئەو قسەیە ناکات و بێگومان قسەکانی کالای لەقەد بالایە. چونکە ئەو لەوێدا لەو پێشەکییە چڕ و پڕەدا ھێند بەجوانی سەلیقەیی چووتەوە نێو باسەکانەوە و وردیان دەکاتەوە بڕوا ناکەم کەسێك یان خوێنەرێکی ژیر و بە ئەزموون لێیان تێنەگات و بنج و بناوانی مەسەلەکان حاڵی نەبێت بەلام ئەوەی جێگەی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە، ئەو داخوازییەی نوسەر لەو ڕوانگەیەوەیە کە دەیەوێت خوێنەری ڕاستەقینە ھەر لەسەرەتای چوونە نێو پێشەکییەکەوە و تێڕامان لەبابەتەکانی بگاتە دەرئەنجامێك. ھەست بەوە بکات بەڕاستی ئەو بابەتانە شایانی خوێندنەوە و لێورد بوونەوەن بەلام بەدیدێکی زانستیانە و دوور لە دەمارگیری ئایینی و نەتەوەیی و چەقبەستووییەکی دۆگماییانەوە. دیسان من لێرەدا و بەش بەحاڵی گرنگی ھەموو بابەتەکانی کتێبەکە نامەوێ ھەمان وتەی نووسەر دووبارە بکەمەوە و تەنھا بەخوێندنەوەی پێشەکییەکە حوکمی تێگەیشتن بدەم بەسەر خوێنەردا. بەلام من دڵنیام لەوەی خوێنەر کە چوویە نێو خوێندنەوە و ھەڵدانەوەی لاپەڕەکانی یەك لەدوای یەکی کتێبەکە ئەوا دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دەست بەرداری کتێبەکە نابێت و وەك دەڵێن: لەنووکەوە دەیخوێنێتەوە، چونکە بەپێزی بابەتەکان و نموونە ھێنانەوە و ھەڵدانەوەی پەردە لەسەر ڕاستییەکان بەشێوەیەکی توێکاری سۆسیۆلۆژیانە و ئەزموون کارییە زانستییەکان ھەست بەوە دەکات کە بەرەوپیر چوون و لەئامێز گرتنی کتێبەکە ئەوە ھەڵدەگرێت کە ماوەیەك بۆ خوێندنەوەی تەرخان بکات و پاشان زۆر بەچاوکراوەییەوە پەی بەشتەکان ببات و تەم و مژی گومانی لا بڕەوێتەوە.

خوێنەری ئازیز لیرەدا دەمەوێ ئەوەت پێ ڕابگەیەنم دەبوایە ساڵی پار واتە ساڵی ٢٠٠٤ بکەوتایەتە بەر دیدەی تۆی بەڕیز و خۆشەویست. چونکی من لەو ساڵەدا ھەموو وەرگێرانەکەم تەواو کردبوو تەنھا مابوویەوە سەر تایپ کردنی کۆمپیوتەری و پاشان ھەڵەبڕی و سەرلەنوێ پێداچوونەوەی کتێبەکە بەلام مەخابن ئەوە بوو لەو ساڵەدا تووشی نەخۆشییەك ھاتم و نەشتەرگەریم بۆ کرا و بۆ نزیکەی دوو مانگ

دابڕام لـەکاری نووسـین و کتێبەکـەش مایـەوە لەچاوەڕوانیدا و نۆرەبڕیـشی لێکـرا لـەکاتی تایـپ کردنەکەیدا. بەڵام هەرچۆنێك بێـت گرنگی کتێبەکـە کۆڵی پـێ نـەدام و دووبارە کەوتمەوە سـەر درێـژەدان بەکارەکـەم و ئێـستا بەتـەواوی لەهـەموو بەربەسـت و ڕێگرەکان قوتاری بووە و دەکەوێتە بەر دەست و دیدەی تۆی زێدە خۆشەویست.

لەکۆتاییـدا ماوەتـەوە بڵـێم هیـوادارم تـوانیبێتم بـەم کـارەم ئـەرکێکی بـچووکی سەرشانم بەجێ هێنابێت و ڕاژەیەکی نەتەوەکەم کردبێت.

و: کەمال عەلی

سلێمانی ئازاری ٢٠٠٥ ی زایینی

# پێشەکی نوسەر

ئـەم کتێبـەی کەلەبەردەسـتدایەو پێـشکەشی ئێوەیخوێنەریدەکـەم، لێکۆڵینـەوەیەکـە کەهـەوڵو مانـدوبونێکی زۆروکـاتێکی بـەنرخ و زۆریـشی لـێ بـردووم، چـونکەمن نـزیکـەی دوساڵە بـەم لێکۆڵینەوەیـەوە خـەریك بـووم و بەڕادەیـەکی وەهـا خـەنی کردبـووم کـەوام لێهاتبوو لەخۆم بترسم لەبارەیەوە.

ئیـدی گەیـشتمە ئـەنجامێك کـە ڕەنگـە بـۆ خوێنـەر سـەیربێت یـان دوور بێـت لـەو زانیاریانەی کەخوێنەر خۆی پێشتر هەی بووە.

بەڕاستی کاتێکەدەستم کرد بەم لێکۆڵینەوەیەو ئەوئەنجامەی کەپێی گەیـشتم هـەرگیز لەخەیاڵما نەبوو.

ڕەنگەزیادەڕۆیی نەکەم گـەربڵێم سـەبارەت بـەم بابەتـە مێـشکم لەهـەموو بیرۆکەیـەکی پێشینە پاکژ بوو.

ئەوەی لەئارادابوو ئەوەبووکـە لـەکاتی گەڕانـەوەم لەئەمـەریکا بەرێکـەوت کتێبێـك لـەم بارەیەوە کەوتە دەستم ، ئیدی ئـەوە یەکـەمیین پاڵنـەربوو کەهانیـدام بـەردەوامبم لەسـەر ئەم لێکۆڵینەوەیە.[1]

ئیترلەخۆش بـەختی یـان بەدبـەختی(خـۆم)دانـەمتوانی وەك خـەڵکی دی خـۆم بەشـتی لابـەلاوە خــەریك بکــەم لەبریــدا بــێ مانــدوو بــوون ســەرم خــستەسەر خوێندنــەوەو لێکۆڵینــەوەی ئـەو کتێبـەی کەباسـم کـرد،وتم بـەڵکو کـەمێك لەوداخـەی کـە بۆگـەنجێتی لەدەست چووم دەمخوارد لەبیر بەرێتەوە، کەبەڕاستی کتێبێکی سەرنج ڕاکێش بوو.

ئیدی پاش گەیشتنەوەم بۆ عێراق بێپسانەوە سەرم خستەسەر ئەم بابەتەو دەستمکرد بەلێکۆڵینەوەی هەمووشتێکی دوور و نزیك کەپەیوەندی بەم بابەتەوە هەبێت .

لێرەدا مەبەستم ئەوەنىيە كەباوەڕ بەخوێنەر بهێنم بەڕاست ودروستى ئەو ئەنجامەى كەپێى گەيشتووم،بەڵكو هێندەم بەسە كە خۆم باوەڕم پێى كرد دواى ئەوەى كەخۆم بەگومان بووم لێى.

هەروەها لەخوێنەريشى ناشارمەوە كاتێ كەدەركم بەبنەماكانى ئەم بابەتەكرد گاڵتەم پێى دەهات ،دەم ووت شتىوا مەحاڵەچونكەمنيش هەروەك لاوانى ئەم نەتەوەيە پێكەنينم بەهەرشتێك دەهات كەنەدەگونجا لەگەڵ ئەوەى كەپێى ڕاهاتبووم يان لەگەڵ نەريتى زاراوە فيكرييەكانى قوتابخانەدا نەگونجابا.

لەسەرەتادا لووت بەرز بووم بەو زاراوە سەرەتاييانەى كەڕاهاتبووم بەخوێندنەوەيان ،چوونكەگاڵتەم بەهەموو ئەوشتانەدەهات كە لەبەراوردوپێوانەلۆژيكىيەكەيدا يەكسان نەبوون لەگەڵ زانيارييە سەرەتايىيەكانمدا .

بۆيە دەست بەجێ بڕيارى مەحاڵبوونم دەدا بەسەر ئەوشتانەى كەپێچەوانەى تێگەيشتنەكانم بوون – پاشان لێوم لێ هەڵدەقرچاندن و خۆم بەلووت بەرز دەزانى – .

لەبەر ئەوە پێموايە لەساتى خوێندنەوەى ئەم پەرتووكەدا هەندێخوێنەر هەروەك جارانى من دەبن ، بەڵام بەهەر حاڵ ئەمە نەريتێكى ئەقڵىيەو هەموو مرۆڤێكى گرتۆتەوەو هيچ ڕێگايەكيش نىيە بۆڕزگار بوون لەم داوە مەگەر بەدەگمەن نەبێت.

ئەوپێوەرانەى كەلەنێو مەحاڵ وشياودا جياكاريان بۆ شتەكان پێدەكەين لەڕاستيدا پێوەرى ڕێژەيين،چونكە هەڵ قوڵاوى نەريت و زاراوە و بابەتە كۆمەڵايەتى يەكانن،كە كەسى تاك لەسەريان ڕاهاتووە.

بۆ نموونە ئەوكەسەى كەپێشتر ڕاديۆى نەديبێت مەحاڵە بڕوابە بەرامبەرەكەى بكات گەر پێى بڵێت ئامێرێك هەيە پێى دەڵێن ڕاديۆ وە لەدوورى هەزاران ميلەوە لەڕێى ئەم ئامێرەوە گوێى لەدەنگى مرۆڤێك يان شتێكى تر دەبێت.[٢]

وەهەروەك (ئيمامى غەزالى) لەكتێبەكانيدا دووبارەى دەكردەوە دەڵێت (مرۆڤ)ئەوشتەى بەلاوە سەيرە كەنەى بيستووە ونەى ديوە.

ئەوەشى گومانى تيانيەئەوەيەهەريەكێك لەئێمە كەم تازۆر لەوكەسانەدەچين كە ئينكارى لەوشتانە دەكەين كەنەمانديوە ونەمان بيستوە هەروەك نمونەى ڕاديۆكە.[٣]

لەڕاستیدا پێکهاتەی عەقڵی مرۆڤ بەخوێندەوارو نەخوێندەوارەوە،واتە بەجیاوازی ئاستی هوشیاریانەوە هاوشێوەیەو لەیەك دەچێت.

چونکە لەعەقڵی هەموو مرۆڤێکدا دووربین یان پەنجەرەیەك هەیەکەلێیانەوە دەڕوانێتە بونەوەرو گەردوون (کەون) .

وەهەر لەبەر ئەوەشە مرۆڤ بڕوا بەوشتانە ناکات کەلە دەرەوەی ئەم دووربین وپەنجەرەیەدان.

بۆنموونە،زۆرکات دو کەس لەسەر یەك حەقیقەت کۆك نین،لەبەرئەوەی ئەمیان بڕوای بە حەقیقەتەکە هەیە هەروەك ئەوەی کەبەچاوی خۆی بینیبێتی و ئەوی دی بەتەواوی ڕەتی دەکاتەوە ، هەرچەندە ڕەنگە هەردوکیشیان لەیەك ئاستی هوشیاری وزیرەکیدابن وهەمان هێزی بیر کردنەوەیان هەبێت ، بەڵام ڕەنگەگۆشەنیگای ئەوپەنجەرەیەی کەلێیەوە دەڕواننە دنیا جیاوازبێت.

کەواتە گێلی یە گەربێت و بمانەوێت بەڕایەك لەڕاکان بڕوا بەکەسێکی دی بهێنین بەهەمان ئەورێگایانەی کەخۆمانی پێباوەڕدار دەکەین.

ئیدی لەبەرئەوە پێویستە یەکەم جار گۆشەنیگای فیکری ئەوکەسە بگۆڕین ئەوکاتە دەبینین کەئامادەگییەکی زۆری لادروست بووە بۆئەوەی گوێ لەبەڵگەکانمان بگرێ.

وەهەر لەبەر ئەم هۆیەشە کەدەڵێم و دوبارەی دەکەمەوە ،کەمەبەستم لەم کتێبەی خۆم نیە بۆئەوەی زۆربەی خوێنەران بڕوای پێبکەن.

چونکە ئەوکەسەی کە جیاواز لەوحەقیقەتە بڕوانێ کەمن لێی دەڕوانم،مەحاڵە بتوانم باوەڕی پێبهێنم هەرچەندە گەر ئەوبەڵگانەشم کەبۆی دەهێنمەوە بەهێزبن.

بەگوتەیەکی دی:نامەوێ‌بەم لێکۆڵینەوەیە بڕوا بەو کەسانە بهێنم کەخۆیان دەیانەوێ باوەڕبهێنن ،بەڵام ئەو خوێنەرەی کەنایەوێ باوەڕبەم لێکۆڵینەوەیە بهێنێت ئەوا ئێمەلەبەرامبەریدا هیچمان پێ ناکرێ .

★ ★ ★

بەم لێکۆڵینەوەیە گەیشتمە ئەنجامێکی جیاواز لەواقعی ئەو هەموو بیروڕایانەی کەماموٚستایان ونووسەران و وتار بێژانی ئەم وڵاتەی خۆمان کەبەردەوام پێمان دەڵێن

ودووبارەی دەکەنەوە. چوونکە ئەوان وایان فێرکردووین کە (ئەوەی بەردەوام هەوڵدات دەگاتە ئەنجام) وەهەمووئەوکسانەی لەسەر ئەم ڕێگە پیرۆزەبن دەگەنە ئەنجام ورزگاری.

هەروەها دەڵێن ئایندەی هەموو کەسێك بەدەست خۆیەتی گەر ئەو کەسە بەپێی ویست وئارەزوی خۆی هەوڵ بدات وخۆی پێك بهێنێت.

لەڕاستیدا ئەم جۆرە ڕاوێژە بۆمنداڵ و قوتابییەکانمان خراپ نییە،چونکە بەهۆیەوە هانیان دەدەین کەماندووبن ولەسەر خوێندن بەردەوام بن بۆئەوەی بیانپارێزین لەتەمبەڵی وبێزاری.

بەلام،گەر بێت وبەتووندرەوی یەوە ئەم ڕاوێژە بدەین بەتەمەن وپێگەیشتووان ئەوا ڕەنگە ئەنجامێکی تەواو پێچەوانەمان بداتێ.

چونکە زۆرجار خۆشمان کەبەتەنگ شتێکەوە دێین وهەوڵی بۆدەدەین ولەپێناویدا بێماندووبوون دەتوێینەوە کەچی دواجار هەرکاتێکەدەمانەوێبەدەستیبهێنین لێمان دووردەکەوێتەوە بەلام کاتێکەپشت گوێی دەخەین ولەبیری دەکەین دەبینین ئەوشتە خۆی وا لەبەردەستمانداو بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئامادەیە.

هەروەك ئەوپەندەی کەدەڵێت(با،بەپێچەوانەی ویستیکەشتییەوە هەڵدەکات)،ئیدی لێرەوە حەزدەکەم بڵێم کەلەماوەیەکی گەنجێتیما نێچیرێك بووم لەنێچیرەکانی ئەوبنەما پووچەبنەمای (ئەوەی هەڵ بدات دەگاتەئەنجام) یان (ئەوەی بگەڕێیت بەدوایدا هەر دەیدۆزیتەوە) .

لەڕاستیدا لەوماوەیەی گەنجێتیما هەر خەریکی کات بەفیڕۆدان بووم،ماوەیەکی زۆر خۆم بەئەنجام گەیاندنی شتێکەوە خەریك دەکرد کاتێکی زۆرم بەپلان وهەوڵدان وکۆڵنەدانەوە بەفیڕۆدەدا،کەچی دواجار شکستم لەوکارەدادەخواردو لەجەنگی ژیاندا زۆربێهێزبووم ،واخۆم دەبینیەوە کەهەڵی سەرکەوتنم لەوانی دی کەمترە بەمەرجێکەئەوکەسانەی دی هەرلەسەر سروشتی خۆیاندەڕۆیشتن بەبێ ئەوەی هیچ ماندوو بونێك بەخۆیانەوە ببینن وهیچهەوڵێکیش بدەن.

خەڵکێکی زۆر باوەڕیان بە(بەخت) هەیەو ڕەنگە ئەوەی کەیارمەتی ئەم باوەڕەیان دابێت (بەخت)خۆیبێت.

چـونکه مـرۆڤ هەمیـشه گـوێی لەومیـه کەسـەرکەوتن بەهـەوڵ ولێـزانین بەدەسـت نیت.ئیـدی لەسـەر ئـەم بنەمایـە هـەوڵی خـۆی دەدات ،بـەڵام دواجـار خـۆی دەبینێتـەوە کەسەرەڕای ئەم هەمووماندوبوونـە لـەکاروان دواکـەوتووەو نەگەیشتوە بـەوەی کەکەسانی دی پێش خۆی پێی گەیشتوون بەمەرجێکەو بێهێزتروو بێ ورەتربوون.

ئیدی ئەویش لەئەنجامدا هۆیئەمە دەگەڕێنێتەوە بۆ (بەخت)و داواجـار دەست دەکـات بەگلەیی وگریان بەسەر بەختی خۆیدا.

ئەوەی کەلێرەدا گومانی تێدانیـە ئـەوەیی کەووشـەی (بـەخت) بەومانایەنییـە کەلـەلای خـەڵکی کەوتۆتـەوە بـەڵکو ڕوونـتر هەنـدێهێزی نەسـتی هەیـە کەلـەقو لأیـی دەروونـەوە هەڵـدەقوڵێت وکاریگەرییـەکی بەرچاویـشی دەبێـت لـە سـەرکەوتنی ئەوکەسـەدا یـان لەپێگەیشتنی دا.

وەئەو جیاوا زی سەرکەوتنەش کەهەنـدێجار لـەنێوان دوو کەسدا دەیبینین سەرەڕای لێك چونیان لەزیرەکی وهەوڵدا ، زۆر جار بەهۆی ئەوەوەیە کە یـەکێکیان زیـاتر لـەوی دی هێزە نەستییەکانی هەڵدقوڵێن وسوودیان لێوەر دەگرێت بەبێ ئەوەی خۆشی ئـەو هۆکـارە بزانێت!!....

کەچی ئەوی تریان هەر خەریکەو هەوڵ دەدات بەڵام بەمکارەی ئـەو هێـزە نەستیانەی خۆی دەچەپێنێ وگوێ لە خورپەو هەستی خـۆی نـاگرێ، لەبـەر ئـەوە دەبیـنین کـە بـەبێ ویستی خۆی لەسەرکەوتن دوور کەوتۆتەوە.

لەڕاســتی دا مەبەســت کــاری وپەلــەکردن وجــەخت کردنــەوە پێــچەوانەی هێزەنەستییەکانەو تێکیان دەدات لەبەشەکانی داهاتودا ئەمانەتان بۆ ڕوون دە کەینەوە.

لەبەرئـەوە ئەوکەسـەی کـەزۆر بەتـەنگی شـتێکەوە دێـت وجـەختی لەسـەر دەکاتـەوە ئەواهەڵـەی زیـاتری تیـا دەکـات وەك لـەوەی ڕاسـت ودرووسـتی تیـا بکـات وەرەنگـە زۆریـش دیاردەکانی سەرکەوتنی لەبەر چاو وون بکات.

لەڕاستیدا زۆربەی هۆکانی سەرکەوتن لـەوەوە دێـت کـەبتوانی هەسـتی خـۆت ئەندێشە بدەیت وگوێ لەسرووشەکانی بگری.

 

وە ئێمە بەمە نامانەوێ لەنرخی ویست وهەوڵدان کە مبکەینەوە یان کاریگەرییەکانیان لەبواری سەرکەوتنی مرۆڤدا بەشتێکی بێ بەها بزانین،بەڵکو دەمانەوێسنووری ئەم شتانە دەستنیشانبکەین وزیادەڕەووی تیا نەکەین وبوارەکانیان

ڕوون بکەینــەوە ، تالەئاسـتی خۆیـان تێنەپەڕن،چـونکە هەنـدێ کـات مـرۆڤ پێویـستی بەهەوڵ وماندو بوونە وکاتی واش هەیە کەمرۆڤ پێویستی بەوەیە لەسەرخۆبێت وجەنجاڵ نەبێت و کەمتر گوێبداتە شتەکان.

(کەسـی بەختـەوەریش ئەوەیـە کـەبتوانێ ئـەم کاتانـە جیـا بکاتـەوەو بـەپێی پێویـست بیانباتە سەر).

وە هیـوا دارم کـە خوێنـەری ئـازیز بزانـێ کەلـەم لێکۆڵینەوەیـەدا هـەوڵی ئـەوە نـادەم کـەهۆکاری ئـابووری پـشت گوێبخـەم وسـوکایەتی بـە سیـستمی ڕامیـاری وکاریگەرییەکـەی لەسەر ژیانی مرۆڤ بکەم ،چـونکە شـتێکی بەڵگـە نەویـستە کەسیـستمی ڕامیـاری وئـابووری گەندەڵ زۆرجار بەهرەکان دەمرێنـێ وبواری ئەوەنادەن کەتاك بەشێوەیەکی دروست هێزە دەروونی یەکانی بقۆزێتەوەو بەکاریان بهێنێ.

بەلأم لەگەڵ ئەوەشا لێرەدا سیستمی ڕامیاری وئابووری بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ناچـنە نـاو چوارچـێوەی لێکۆڵینەوەکانمانەوەچـونکە ئێمـە دەمانـەوێ بـەم لێکۆڵینەوەیـە بـچینە قولأیی دەروونی مرووۆڤایەتی وئەو هۆکارە نەستیانە بزانین کەدەبنە هۆی سەرکەتنی تـاك و لێهاتویی ئەو بەسەر کەسانی دەوروبەریدا کەلەهەمان بارو دۆخ دان.

لەڕاسـتیدا هـەموو سیـستمێکی ڕامیـاری وئـابووری گرروپێکـی زۆر خـەڵکی لـەخۆ دەگرن،کەلەنێو ئەمانەدا تاکی سەرکەوتوو هەیەو تاکی شکستخواردووش هەیە.

کەواتە ئێمە لێکۆڵینەوەمان لەسەر ئـەو هۆکـارە دەروونیانـە چڕ دەکەینـەوە کەچیـیە وادەکات لەناو سیستمێکی دیاری کراودا ئەم( تاك)ە سەر کـەوتوو بێـت و ئـەوی دی شکـست خواردوو بێت.؟

لەڕاستیدا لە هەرجۆرە سیستمێکی ژیاودا سەرکەوتن ولێهاتویی شتێکی دەگمەنەو کـەم کەس لەو پلەیەدان .خۆ ئەگەر هەموو خەڵکی سەرکەوتوو بن وبەیەك پلـە لێهاتوبن ئـەوا پەرەسەندنی کۆمەلأیـەتی دەوەسـتاو مـرۆڤیش وەك ئەوکۆمەڵـە هەنگەی لێـدێت کەخانـە

دروست دەكەن وهەنگوین كۆدەكەنەوە و هەر هەنگێك لێهاتووە لەكارەكەیداو بەجۆرێك،كەهیچ خەوش و كەموكورییەك لەوەی كەدەیكەن نابینرێت.

لەڕاستیدا پەرەسەندنی كۆمەلگای مرۆڤایەتی لەم پێشبڕكێ یەوە سەری هەلداوە كەپاڵ بەتاكەوە دەنێ بۆئەوەی سەركەوتن بەدەست بهێنێت ولەچاو ئەوانی دی وهاوتەمەنانیدا لێهاتوو تر بێت.

كەواتە پەرەسەندن بەندە لەسەركۆمەلە تەرمی نێچیرەكان تەرمی ئەوانەی كەشكست دەخۆن لەژیاندا .

ئێمە لێرەدا باس لەهۆكارەكانی ئەو سەركەوتنە ساختەیە ناكین كەلەڕێی واسیتەو خزم خزمێنەو ماستاو كردن وخۆبردنەپێشەوەوە دێت، چونكە ئەمانە ئەوڕێگایانەن كەنەفس نزمەكان دەیكەن بۆئەوەی بگەنە سەركەوتن و،وەئێمە ئەوە بەسەركەوتنێكی ڕاست ودروست نازانین.

بەلأم ئەو سەركەوتنەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە كە تاك وكۆمەڵ بەیەكەوە سوودی لێ دەبینن ئائەمەیە ئەو سەركەوتنەی كەكاریگەری بۆ چەندین نەوە دەمێنێتەوە ، ئەوە سەركەوتنی زاناو داهێنەرو لێكۆلەرەوەو مامۆستاو هونەرمەندو ئەدیب و دكتۆرو ئەندازیارو پارێزەرو بەڕێوەبەرو وتار بێژو ...هتد...كەهەمو ڕۆژێك شتێكی دیكە ونوێ دەدۆزنەوەو دەیخەنە سەر كەلتووری مرۆڤایەتی .

وە برێكی زۆر لەو دەسكەوتە نەمرانەیكەئەم جۆرە كەسانە كردوویانە بەشێوەیەكی زانستیانە سەلێنراوە ئەمەش هەمووی لەئەنجامی ئەو سروشەی كەلەقولأیی دەروون ونەستی ئەوكەسانەدا هەلقولأون وتوانیویانە سوودی لێببینن وبیخەنەكار.

كەلەبەشەكانی داهاتوودا بەتێرو تەسەلی باسی دەكەین .



لەڕاستیدا ،بابەتی هێزەدەرونییەكان بابەتێكی زۆر نوێیەو شێوە ئەزمونییەكەی كەئێستا هەیە لەسالی(١٩٣٠ز)دا دەستی پێكردووە چونكە لەم سالەدا كەدەكرێ بەخالی وەرچەرخانی دابنێین لەمێژووی فیكری مرۆڤایەتیدا چەند هەنگاوێكی گرنگ نرا، بۆنمونە لەزانكۆی(دیوك) لە ئەمەریكا لقێكی تایبەتی دامەزراند بۆ لێكۆلینەوەی ئەم

جۆرە هێزانە لەتاقیگەكانـدا ولـەژێر سەرپەرشـتی پرۆفیـسۆر(ڕایـن) كـە ئـەم پرۆفیـسۆرە چەند كتێبێكی نوسیوە وتیایدا ئەنجامی لێكۆڵینەوەكانی بەشێوەیەك پوختـەكرد كـەبووە هۆی هەرایەكی زۆر لەنێوەندە زانستیی یەكاندا.

لەسـەرەتادا زانایـانی ئـەو سـەردەمە ئەمبابەتـەیان بەگاڵتەجاڕوبێبایـەخ دایـە قەڵـەم وزۆریـان پێیـان وابـوو كەئەمەشكـستێكە لەپـەرە سـەندنی زانـستداو گەڕانەوەیـە بـەرەو ساویلكەیی‌و ئەفسانەكاری بەراییەكانبەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانكۆی (دیـوك) هـەر بـەردەوام بوو لەسەر پلانەكەی خۆی‌و هـانی لێكۆڵینـەوەی ئـەم بابەتـەی دەدا تادواجـار ئـەم هەرایـە لەسەر پرۆفیسۆر كەم بووەوە ، دوای ئەوەی زانایان سەیری ئەنجامی ئەزموونـەكانیان كـرد ئیـدی بەچاوی بایەخەوە سەیری ئـەم بابەتـەیان دەكـرد ،پاشان چـەند زانكۆیـەكی دیكـە هەمان ڕەوتی زانكۆی(دیوك)یان گرتەبەر،وەك زانكۆی (ئۆكسفۆرد و كامبرج)كە پێشتر ئـەم دوو زانكۆیە زۆر دژی ئەم بابەتە بوون.

ڕەنگـە زیـادە ڕەوی نەكـەین گـەر بڵـێین بابـەتی هێـزە دەروونیـەكان ئـەمڕۆ بووەتـە بابـەتێكی ئەزموونگـەرایی ورێـزلێگیراو كەچـەند پرۆفیـسۆرێكی بـەناوبانگ لەسەرئاسـتی جیهاندا پێوەی خەریكن وتاقیگەكانیش كارئلسانی بۆ دەكەن وكتێبی زانكۆیی لەسـەر بـڵاو دەكەنەوە.

زۆریشم لەلا گرانە كەجیهانی خۆمان لەبارەی ئەم پەرەسەندنەوە دوور دەبینم چونكە تاكو ئێستاش ڕوناك بیرانمان بێئاگان لەم بابەتە.

جارێكیان لەگەڵ یەكێك لە ڕوناك بیرە گەورەكانمان لەمبارەیە گفتوگۆم دەكرد، باسی ئەوەم بۆكرد كەچۆن مرۆڤ لەناخی خۆی ولەعەقڵی نادیاریدا (العقـل البـاطن) خـا وەنی هێزی لەڕادە بەدەرەو دەتوانێ لەمپەرەكانی كات وشوێنی پێ‌ببڕێ.! كەچی بەداخەوە قسەكانی منی بەدڵ نەبوو سەرەڕای ئەمـەش بـەدرۆی دەخـستنەوەو گلـەیی لـەمن دەكـردو دەیوت ئەی باشە چۆن تۆ بـڕوات بـەم قسە هەلـەق ومەلەقانـە هەیـە كەلەگـەڵپێوەرەكانی عـەقڵ ولۆژیـك ناگونجێن،بـەڵام منـیش لەلایـەن خۆمـەوە گلـەییم لێكـرد وپـێم ووت چـۆن دەبێـت ڕونـاك بیرێكـی وەك تـۆ باوەڕبـەو هـەموو ئـەزمون و تاقیكردنەوانـە نـەكات كـە لەگـەورە زانكۆكـانی جیهانـدا ئـەنجام دراون و سـەلمێنراون،لەبەر هـیچ نـا لەبـەر ئـەوەی كەگوایە لەگەڵ عەقڵی مۆدێرندا ناگونجێن.

بەهەرحاڵ ئەو ڕوناك بیرە نازانێ كەئەم پێوەرانە (ڕێژە)ین وپشت دەبەستن بـەزاراوەو نەریتە كەلتوری وشارستانی یە كان و ئەمانەش بەپێی كات دەگۆڕێن .

كەواتە چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەم ڕوناك بیرەو ئـەو نەخوێنـدەوارە دەمـارگیرەی كە دەسكەوتەكانی زانستی مۆدێرن ڕەت دەكاتەوە هەرتەنها لەبەرئەوەی كەجیاوازە لەگـەڵ ئەو بیرو باوەڕو نەریتانەی كەلەسەریان ڕاهاتووە،بەلاَم بەهەر حاڵ ناكرێ بەتوندی گلـەیی لەو ڕوناك بیرە بكەین چونكە وەك پێشتر باسمان كرد هەموو مرۆڤێـك مـەیل دەدا بـەڕەت كردنەوەی هەموو ئەوشتانەی كەلەگەڵ بیرو باوەڕیا ناگونجێ.

لەڕاسـتیدا بابـەتی هێـزە دەرونیـەكان بەشـێوەیەكی سروشـتی خـۆی لەخۆیـدا جێـی سەرسـوڕمان وگومانــە گــەربێت وبــۆ بیرمەنــدێكی باســكەین كەپێــشتر ئــەو بیرمەنــدە زانیارییەكی سەرەتایی وپێشینەی لەو بارەیەوە نەبێت،چونكە بەڕاستی بابـەتێكی سـەیرە لەچـاو ئــەو چــەمك وگووتەلۆژیكیانــەی كەلەقوتابخانەكانــدا فێــری بــوین ولەســەریان ڕاهاتووین.

ئەوكەسەی كە بەوردوربینـەی(گـالیلۆ ، نیـوتن ، داروین ، لـویس پاستۆر...هتـد)بۆیـان دروســت كــردوین ســەیری گــەردوون بكــات ، ناتوانێوابەئاســنی بــڕوا بــەو هێــزە لــەڕادە بەدەرانــەی نەســت ودەروون بهێنێــت كــە والــەمرۆڤ دەكـات بتـوانێ بـیری بەرامبەرەكـەی بخوێنێتــەوە یــان بتـوانێ لەپـشت دیـوارەوە شـتەكان ببینێـت یـان پێشبینی ئـەو مەسـەلەو ڕوداوانە بكات كەلەئایندەدا ڕودەدەن.

هەنـدێ كـەس هـەبوون كەباسـی ئـەم بابەتـەم لـەلاكردون بەسەرسوڕمانەوە بـەمنیان وتووە كەناتوانن بڕوا بەمەبكەن وعەقڵیان شـتی وا قبـوڵ ناكـات ،چـونكە لەدیـدی ئەوانـدا وەك فاڵ وجادو تەڵەكەبازی وایە.

كاتیكیش كەلەوانم دەپرسی بۆچی وادەڵێن وەلأمیان لەلانەبوو.

بۆنمونە گەر یەكێك پـێش دۆزینـەوەی(تیـشكی× سینی)بهاتایـەبۆلایان وئـەوەی بۆبـاس بكردنایە كەئامێرێك هەیە یارمـەتی دكتۆرەكـان دەدات بـۆ بینینـی ئەنـدام وئۆرگانـەكانی ناو جەستەی مرۆڤ ، ئەوا لەوانەیە بە درۆزن ناویان ببردایە.

كەچی ئەمڕۆ( تیشكی×) بەلایانەوە شتێكی ئاسا یی یەو هیچ جێی سەرسوڕمانیان نـی یە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی كە پێشتر پێی ڕاهاتوون وبەكاریانهێناوە.

وەرەنگە زۆر لەخەڵکی باوەڕبە هێزە لەرادەبەدەرەکانی دەروون بهێنن وئەمەش دوای ئەوەی کەئەمبابەتە لەئاییندەدا کۆن دەبێت ودەکەونە ناو میتۆدەکانی خویندنەوە ، هەروەك چۆن بابەتەکانی کیمیاو فیزیاو...هتد. کەوتنە ناو میتۆدەکانی خوێندنەوە .بەڕاستی پێم سەیرە کاتێ کە ،کەسێك دەبینم بڕوای بە تیشکی × و ڕادارو تەلەفیزیۆن هەیەو کەچی بڕوای بەهێزە لەرادەبەدەرەکان نیە.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کەئەو کەسە بڕوای بە ئۆتۆمۆبێل هەیە کەمرۆڤ سواری دەبێت بەڵام بڕوای بەمرۆڤەکە خۆی نیە.

زاناکان دەستیان کردووە بەدۆزینەوەی شتە شاراوەکانی ناوجەستەی مرۆڤ کەپڕە لە سەیرو سەمەرەی کارەباو شەپۆلە کارەباییەکان بەڕادەیەکی وا کەهەموویانی سەرسام کردووە ،وەرەنگە لە ئایندەشا بتوانن چەند جۆرە ئامێرێکی وردی کۆئەندامی دەمار(مێشك) بدۆزنەوە وئامێرەکانی وەك ڕادیۆو ڕادارو تەلەفیزیۆن هیچ نەبن لەچاویاندا.

دەگێڕنەوە کە کاتێ لەسەدەی هەڤدەهەمدا (ولیام هارفی ) سوڕی خوێنی دۆزیەوە و بەجیهانی ڕاگەیاند کەدڵ وەك پەمپێك وایە ولەڕێی چەند بۆرییەکەوە پاڵ بەخوێنەوە دەنێ بەناو هەمو جەستەی مرۆڤدا، خەڵکی ئەو سەردەمە ئەمەیان بەگاڵتە جاڕی ونەرێ کردنەوە(نفی)وەرگرت و بەرەنگاری بوونەوە و نەیان توانی بڕوا بەبوونی جۆرە ئامێرێکی وا لەجەستەی مرۆڤدا بکەن. [٤]

کەچی ئەمڕۆ دوای ئەوەی کەزانستی فیزیۆلۆژی پەرەی سەندووەخەڵکی ئامێری تریان دۆزیوەتەوە کەزۆر لەدڵ ووردترو باشتر ئیش دەکەن وەمن بێگومانم لەوەی کەزانایان بەردەوام شتی سەیر تر لەم جەستەیەدا دەدۆزنەوە،کێدەڵێ ڕەنگە لەم تەنە بچوکەدا هەموو گەردوون شاراوەبێت؟!..



مێژووی هێزە لەرا بەدەرەکانی گەردوون زۆرکۆنە وبەهۆی بەدواداهاتنی سەردەمەکانەوە زۆر خاڵی لاوازو گۆڕانکاریان بەسەرداهاتووە.

 

وەگرفتی سەرەکی لەمێژووی ئەم دیاردەیەدا لەوەوە هاتووە کەلەزۆربەی کات وتوێنەکاندا لەلایەن جادووگەران وپیاوەئاینییەکانەوە بەکار هاتووەولەمەشەوە تێکەڵ بەفاڵ وجادوو فرت و فێڵ بووە.

کاتێک کەلەسەدەکانی ناوەڕاست دا ڕێنسانسی زانستی مۆدێرن سەری هەڵدا بەرچەکردارێکی توند دژی بڕوا هێنان بەوهێزانە لەنێو ناوەندە زانستییەکانی ئەو سەردەمەدا ڕویدا.

چونکە زانایانی ئەو سەردەمە هەر خەمی ئەوەیان بوو کەخەڵکی لە بیرو ڕای پووچ وغەیبی دور بخەنەوە ، لەبەرئەوەی بڕواهێنان بەهێزە لەڕادەبەدەرەکان لەوکاتەدا شتێکی خورافی بوو ئەوا ئاستەم بوو بۆیان کەهەموو ڕێگایەك بگرنەبەر بۆئەوەی خەڵکی لێ دورخەنەوەو بەرەو ئەوزانستە نوێ یانەی خۆیان بەرن کەئەوکاتە هەبوون.ئیدی‌دەمارگیری دژی هێزە دەروونی‌یەکان لەسەدەی نۆزدەهەمدا گەیشتنە ترۆپك و زانایانیش بەو ئەنجامەی‌کە لەدۆزینەوەی تیۆرەکانی زانستی سروشتیدا پێی گەیشتبوون بەڕادەیەك فریویان خوارد کەوایان دەزانی هەموو نهێنیی‌یەکانی گەردوونیان دۆزیوەتەوەو هیچ نەماوە نادیارو نەزانراو بێت هەندێ‌شتی‌لابەلا نەبێ کەدەیان ووت ڕۆژێك لەڕۆژان ئەوانەش دەدۆزینەوە.

دەشێ سەدەی نۆزدەهەم بەسەدەی لووت بەرزی دابنرێ لەبواری زانستدا،وەسەیر لەوەدایە کە ڕوناك بیرانمان تاهەنووکەش هەر لە عەقڵیەتی ئەو سەردەمەدا دەژین و ئاگایانلەوە نی‌یە کە ئەم عەقڵییەتە ئێستا بووەتە شتێکی کۆن وزانایانی ئەم سەدەیەی خۆشمان پێکەنینیان دێت بەو سەردەمە.

زانایانی سەدەی نۆزدە بەڕادەیەك باوەڕیان بەماددە کردبوو کە پێیان وابوو هیچ شتێك جگە لەماددە بوونی نی‌یە،لەبەر ئەوە گەر هەر شتێك تەفسیرێکی(ڕاڤە)یەکی ماددی بۆ نەکرایە ئەوا ڕەتیان دەکردەوە.

هەر لەناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا زانا(بۆخنەر)کتێبێکی بەناوی((هێزوماددە))[٥] نوسی وتیایدا هەوڵی‌دا هەموو گەردون لەئاسانترین شتەوە بۆگرانترین شت بەهۆی کارلێکی ماددەو جوڵەوە ڕاڤە بکات.

 

ئیدی ئەم كتێبە بووە سەرچاوەی هەرە گرنگی مادديەكان،كەبەئینجیلی خۆیانیان دادەناو هیچ لاریەكیان نەبوو بۆ بەڵگەكانی ،بەهەرحاڵ گرفتی ماددیەكان لەتوند ڕەوییانەوە نەبو بۆ تیۆری ماددە بەڵك وگرفتی ئەوان لەوەوە سەری هەڵدا كە بەهەڵە لەماددە گەیشتبوون،وەك لەم دواییانەدا كەزانست شتی تری لەبارەی ماددەوە دۆزیوەتەوە كە هەرگیز بەبیری ئەواندا نەهاتووە...

وەلەبەر ئەوەی وایان دەزانی كەماددە شتێكە پێناسەی ناوێ، گەر بهاتایەو لەوسەردەمەدا پرسیاری ئەوەت لێبكردنایە كەماددە چییە؟. ئەوا بەم پرسیارە سەرسام دەبوون..!

هەرچەندە ئەوان گەیشتبوونە (تیۆری ئەتۆم) بەلاَم‌ئەمەیان لەتیۆرێكی یۆنانی كۆنەوە داڕشتبوو ، كەواتە لەناوە ڕۆكدا ئەوەش جیاوازی نەبوو لەگەڵ ئەو تیۆرەی باوو باپیرانی‌عەرەبمان پێیان دەگوت تیۆری (جەوهەری تاك).

ئەوان دەیان گوت: ماددە لەئەتۆم وتەنی زۆر بچوك پێك هاتووە ، لەبەر ئەوە پێكهاتەی ئەتۆم لەدیدی ئەواندا هیچ جیاوازییەكی نەبوو لەگەڵ هەر پارچە ماددەیەكی دی،تەنها ئەوە نەبێت كەئەتۆم زۆر بچوكەوناكرێ‌پارچەپارچە بكرێ.

بەلاَم ئەم تیۆرەیە تاڕادەیەك سوودی بەوان گەیاند،چونكە بەهۆیەوە توانیان هەندێ دیاردەی كیمیاوی ڕاڤە بكەن بەلاَم لەڕوی زانینیان بۆ نهێنی‌ماددەو پێكهاتە بنچینەییەكەی ئەوا هیچ سودێكی بەرچاوی پێنەگەیاندن.

زانایان تا ساڵی ١٨٩٦ حەقیقەتی ماددەیان بۆ دەرنەكەوتبوو،بەلاَم لەو ساڵەدا یەكەم هەنگاو نرا بۆ دۆزینەوەی ناواخنی ئەتۆم كەپڕبوو لەنهێنی مەزن،ئەم هەنگاوەش بەهەوڵی زانایەك دەستی پێكرد كەناوی(هنری بكریل) بووكە لەمانگی شوباتی(١٨٩٦ز)دا جۆرەتیشكێكی بەدیكرد كەلەگیراوەیەكی كیمیاویەوە دروست ببوو [٦] . وەدوای ئەوە دۆزینەوە زانستییەكان بەخێرایی بەدوای یەكدا هاتن و لەوكاتەوە بەردەوام شتی نوێ‌تر دەدۆزرێتەوە.

وەبۆدواجار زانایان بۆیان دەركەوت كە ئەو ئەتۆمەی وایان دەزانی پەرت ودابەش نابێت بریتییە لەجیهانێكی سیخناخ بەهێزی لەڕادە بەدەروو پێكهاتووە لەشەپۆلی

كارەباییو بەنەخشێكی سەیر بەدەوری ناوكدا دەسوڕێتەوە هەروەك چۆن هەسارەكان بەدەوری خۆردا دەسوڕێنەوە.

ئەم دۆزینەوە نوێ یەی پێكهاتەی ئەتۆم خۆی لەخۆیدا فكری مرۆڤایەتی یەكڕاست پێچەوانە كردەوە بەپلەی( ١٨٠)پلەوزاناو فەیلە سوفەكانی خستە سەرسامیەوە.

زانافیزیایی‌یەكانی ئەمڕۆ لە خۆشییەكی بێسنووردان ومەدەكرێبلێین كەفیزیای سەدەی بیست بەهێندەی جیاوازی ڕادار لەدووربینەكەی ناپلیۆن جیاوازە لەفیزیای سەدەی نۆزدە،پیاوی ئاسایی كەبۆ یەكەم جار تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی بیست سەرسام بوو بەلاَم لەراستیدا تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی شتێكی بێ بایەخە لەچاو ئەو تەقینەوەیەی كەلەعقلی زاناو فەیلەسوفەكاندا ڕویدا لەبارەی دیدی‌ئەوان بۆگەردوون وەگەر گریمانەی ئەوەبكەین كەئەمڕۆ زانایەكی سەدەی نۆزدە زیندو بێتەوە ونەو پێش كەوتنەی لەبواری ماددەو پێكهاتنەكانی یەوە ببینێ ئەوا لەهۆش خۆی دەچێ ورەنگە خێرا بەبەهانەی مەحالّ بوون بەدرۆیان لەقەلّەم بدات.

هێندەی نەمابوو زانایانی سەدەی بیستهەم كۆكبن وبلّێن ماددە هەر بەتەنها ماددە نی یەبەلّكو ئەوماددەیەی كەدەستی لێوە دەدەین هیچ نییەجگە لەوەهمێك لەوەهمەكانی هەست .بەلّكو ماددە بریتی‌یەلەچەند شەپۆلێكی كارەبایی كەلەبۆشایی‌یەكی تەسكدا كۆبۆتەوە.

هەندێ زانایان دەلّێن جیاوازی‌یەكی ئەوتۆ نی‌یە لەنێوان ئەوماددەیەی كەدەستی لێ دەدەین وئەوتیشكەی كەبەچاوی خۆمان دەیبینین ،چونكە هەردوكیان بریتین لەشەپۆلی كارەباییو ئەو جیاوازیەی كەلەنێوانیاندا دەردەكەوێت بریتی‌یە لەوەی كە شەپۆلەكارەباییەكانی ماددە چڕو قەتیسن ولەچەند بازنەیەكی بچوكی ناوئەتۆمدا دەی‌سوڕێنەوە،بەلام شەپۆلەكانی تیشك شەپۆلی سەربەستن ولەئاسماندا بەخێراییەكی لەرادەبەدەر دەڕۆن. [٧]

ئەم چەمكە نوێ یەی ماددە تارادەیەكی زۆر لەلووت بەرزی زانایانی كەم كردەوەو سەرسامی كردن.

زانایانی سەدەی نۆزدەهەم بڕوایان بەهیچ نەدەكرد جگەلەوشتانەی كەهەستی پێ دەكرێ بەوەی كەهەست تەنها پێوەرە كەحەق وناحەق لەشتەكاندا جیادەكاتەوە.

 

بـەڵام ، زانایـانی ئـەم سـەدەیە بـەگومانن لـەپێوەری هەسـت سـەرەڕای ئەمـەش کاتێکـەدرکیان بەودیووهەسـتیش کردئەوجیهانـە مەزنـەی کـەناکرێ بیگـەینێ تـەنها لەرێگەی هاوکێشە ماتماتیکی یەکانەوە نەبێت.

هەردو زانا(بلانك) و(ئەنیشتاین)چەند تیۆرەیەکیان بۆ سروشتی ماددە داناوە کەعەقڵ بەئاسـانیپەیپێنابات ،چـونکە لەواقعـدا ئەوتیۆرانەپێـچەوانەی ئەویاسـا لۆژیکیانـەن کەلەبیرکردنەوەکانمانا بەکاریان دەهێنین،ئەمەش وامان لێدەکات

کەلۆژیکێکی نوێ دابنێین بۆدیدو بۆچونەکانمان لەبارەی گەردوونەوە.

وەلەسەیرو سەمەرەی رێکەوتەکانا ئەومیە کاتێکەزانایانی فیزیاو ماتماتیك دەچونەناو قولآیی ماددەو هەندێ لەنهێنیەکایان دۆزیەوە لەهەمان کاتـدازانایانی تـر خـەریك بـوون بەچـونەناوناخی دەرونـەوەو ئـەو هێـزە لـەڕادە بەدەرانـەیان دەدۆزیـەوە کـەباوەڕپێکردنی ئەستەم بوو.

کەواتـە دوو کودەتـای مـەزن لەسـەرەتای سـەدەی (بیـست )دا ڕووی دا یـەکێکیان لەدۆزینەوەی (ماددە) و ئەوی تریان لە(دەروون)دا .

ئەوەی سەیرەلەمەدا ئەومیە کەهەردووکودەتاکە ئامـاژە بەیـەك ئـەنجام دەدەن چـونکە دوای ئەوەی کە زانایانی فیزیا زانیان کەماددە بریتی یەلەچەند شـەپۆلێکی کارەبـایی ئـەوا زانایـانی دەروون ودەروون ناسـان گەیـشتنە دۆزینـەوەی چـەند شـەپۆلێك کەلـەو شـەپۆلە کارەباییانە دەچێت.

وەمن پێم وایە کەدەروون وماددە دووڕوی یەك حەقیقەتن ئەویش کارەبایە.

وەگرفتی مەزنی ئەم سەدەیەمان ئەومیە کەبزانین کارەبا چی یە؟؟

لەگاڵتـە جارەکـانی قـەدەریش ئەومیـە کەئێمـە شـتێکی نـەزانراو بەشـتێکی نـەزانراو پێناسە دەکەین.!

لەواقعا کارەبا لەهەموو شتێکی تر سەیرترە،وەرەنگەدوای ماوەیەکی زۆر بتوانین هەموو سمبولـەکانی گـەردوون بـەکارەبا شـیکار بکـەین....ئیـدی دەگەینـە ئـەو ڕادەیـەی کەتیایـدا عەقڵ وبیرەکان هەمووی وێران دەبێت.!



دەوترێ كەگەردوون (٣٠٠)بلیۆن پەیزەی كارەبایی لەخۆ گرتوە و ئێمەش ناتوانین لەراست ودروستی ئەم ژمارەیە دڵنیا بین ، بەلآم بەهەر حاڵ شتێكی لەوشەپۆلە بێ ژمارانە بەرِوونی تیا بەدی دەكەین...

ئەگەربچینەوە بۆ سەدەی رِا بردوو ئەوا بۆمان دەردەكەوێ كەزانایانی ئەو كاتە تەنها حەوت پەیزەیان لەو پەیزەكارەباییانە دۆزیوەتەوە ئەوانیش بریتین لەشەپۆ لە رِەنگ كاتێك كەتیشك بەسێگۆشەیەكی شوشەیی ( ئاوێزە)دا تێپەرِدەبێت حەوت رِەنگی لێدەبێتەوە، تەنانەت تاناوەرِاستی ئەو سەدەیەش نەیان توانی بگەنە سروشتیشەپۆلی ئەو رِەنگانە هەتا زانا(ماكسویل)هات وتیۆرەناسراوەكەی خۆی لەبارەی سروشتە كارەباییەكەی تیشكەوە بلآوكردەوە.[٨]

ئیدی لەوكاتەوە زانایان یەك لەدوای یەكشەپۆلی كارەبایی نوێ یان دەدۆزییەوە،بۆنمونە (هرتز) لەساڵی(١٨٨٣)زدا

شەپۆلە بێوایەرەكانی دۆزیەوە ، هەروەها زانا(رِۆنتنجن) لەساڵی(١٨٩٥)زدا تیشكی سینی واتە تیشكیئێكس دۆزیەوە .

وەلەساڵی(١٩٠٠)زدا زانا (مادام كۆری)كەئافرەتێكی ئەمەریكی بوو (توخمی رِادیۆمی) دۆزیەوە كەدواتر دەركەوت ئەم توخمە سێ جۆر تیشكی هەیە گرنگترینیان بەتیشكی گاما ناودەبرێ وەدوای ئەو زانا(ملیكان) توانی شەپۆلە گەردوونییەكان بدۆزێتەوە.....وەرِەنگە زانایان بتوانن بێكۆتا شەپۆلی دی بدۆزنەوە.

زانایانی ئەمرِۆ باوەریان وایە ئەم گەردون وئاسمانەی تیایدا دەژین پرِە لەشەپۆلی نەبینراو كەبێ شومارن وهەموو چركەیەك بەر جەستەمان دەكەون وبەناوماندا تێدەپەرِن بەبێ ئەوەی هەستیان پێبكەین یان رِادەی ئەو كاریگەریەیدەرك بكەین كەچ گۆرِانێك لەهێزە دەروونیەكانمان دەكات.[٩]

ئەوكاتەیكە(ماكسوێل) شەپۆلە رِەنگەكانی دۆزیەوە زانایان بەسەرسامی یەوە دەیان پرسی چۆن بتوانن دەرچوونی ئەم شەپۆلانە لەنێو بۆشایی ئاسماندا رِاڤە بكەن وئەم سەرسامی یەیان بووەهۆی ئەوەی كە شیمانەی شتێكی وەهمی بكەن وناویان نا (اثیر-ئەسیر) وبۆشایی ئاسمانیان پێ پرِكردەوەو هەموو سیفەتە هاودژەكانیان كۆكردەوە بۆئەوەی بەهۆی ئەمەوە

دەرچونی تیشك ڕون بکەنەوە کەچۆن ئەو نێوەندو ماوە فراوانە دەبڕێت بەبێ ئەوەی هچ لەوزەکەی کەم بکاتەوە، ودەیان وت کە ئەم(اثیر)ە،چڕیەکەی لەهەمووگازەکانی تر کەم ترەولە ئاسنیش ڕەقترەو هەروەها نەرمەو بەرگری هیچ شتێك ناکات کەپیایدا تێپەڕببێت...ومئەم(ئەسیر)ە ئەوبۆشایی یە پڕدەکاتەوە کەلەنێوهەسارەکانی گەردونا هەیەو هەروەها بۆشایی‌نێو گەردەکانی ماددەش پڕدەکاتەوە.

بەلأم دواجار(ئەنیشتاین) هات وئەم شیمانەیەی لەبنەڕەتەوە بەدرۆ خستەوە،(ئەنیشتاین دەڵێ (پێویستیمان پێویستمان بی‌بیرۆکەی (ئەسیر) نیە بۆ ئەوەی بزانین چۆن شەپۆلە ڕەنگی یەکان وشەپۆلەکانی دی بەبۆشایدا تێپەڕ دەبن،بەلکو ئەو دەڵێت:

خودی بۆشایی بونیادو سیفاتی تایبەت بەخۆی هەیە) چونکە ئەو بۆشایی یەی کەلەنێو گەردووناهەیە بەوواتایەنی یە

کەتێی گەیشتووین، بەلکو ڕونتر نەومیە کەشتێکی حەقیقیەو بونی خۆی هەیەو چواردوریشی تێدایە کەبریتین لە(درێژی ، پانی ، بەرزی ، دووری)وە کات و شوێن لەمانەدا یەك دەگرنەوە.[١٠]

بەلأم عەقلی مرۆڤ ناتوانێ پرویر لەم تیۆرمیە تێبگات،چونکە مرۆڤ ڕاهاتووە کە کات وشوێن لە یەك جیا بکاتەوە وهەر یەکەیان بە بوونێکی سەربەخۆ دادەنێت بەلأم ئەنیشتاین پێی وایە کە (کات وشوێن) مادەی بنەڕەتی گەردوون پێك دەهێنن ولەیەك جیانابنەوە، چونکە یەك گرتنەوەی ئەم دوانە چوار ڕەهەندەکە پێك دەهێنن.

ومبەپشت بەستن بەم تیۆرە(ئەنیشتاین) توانی سروشتی شەپۆلەکان ڕون بکاتەوە،وەلێرەدا دەتوانین شەپۆلەکارەبایی یەکانی ناو گەردوون بەوشەپۆلانەی کەلەسەر ڕوی دەریا ڕودەدەن وێنا بکەین ،بەلأم بەبوونی جیاوازیەکی کەم ئەویش جیاوازی نێوان کات وشوێن و سروشتی‌سەر ڕوی ئاوە.

چونکە ئەو شەپۆلانەی لەسەر ڕوی ناو ڕودەدەن دو دووریان هەیە ئەویش(درێژی وپانی)یە بەلأم شەپۆلە کارەبا یی یەکان لەشوێنێکدا ڕوودەدەن کەسێ ڕەهەندیان هەیە ئەویش(درێژی‌وپانی‌وبەرزیە) خالی بەرکەوتنیان(کات)ە کەبەمە دەبێتە ڕەهەندی چوارهەم.[١١]

بەهەر حاڵ ئێمە دەتوانین بوونی جیاوازیە جۆراوجۆرەکانی نێو بۆشایی یەك وبۆشاییەکی تر شیمانە بکین،ڕەنگە ئێمە بەهەڵەدا نەچین کەئەم بۆشاییەی ئێرە جیاوازە لەبۆشایی گەردوون چونکە لق وپۆپ ولەنگەلەنگی ناوبۆشایی گەردوون جیاوازە لەحاڵەکانی‌دا،ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوشەپۆلە هەمەجۆرەی کەتیایدایە.

وەئێمەش کاتێ دەڕوانینە ڕوی دەریاو سەرمان دەسوڕمێ لەوهەموو ئەوشەپۆلە هەمەجۆرانەی کەلەسەری ڕوودەدەن وەلەبەرئەوەی سەر ڕوی ئاو هیچ کات ئارام نیەوناوەستێ‌ئەوابۆشایی گەردوونیش لەڕوییەك لەڕووەکانەوە لەسەر ڕوی‌ئاودەچێت،خۆگەربێت وهەستی دیکەمان هەبێت وبەهۆیانەوە بتوانین دەرك بەشەپۆلەگەردوونیەکان بکەین هەروەك هەستی بینین کەشەپۆلەڕەنگییەکانی پێ‌دەبینین ئەوا لەڕەهەندەکانی ئەم بۆشاییەدا شتی وادەبینین کەتوشی شۆکمان دەکات.

وە گەرئەو تیۆرەیەی کەدەڵێت هێزەدەرونیەکان شەپۆلی جۆراوجۆرن لەگەڵ تیۆرەکەی(ئەنیشتان) بەراورد بکەین‌ئەوادەشێ هەمان وێنای ئەم گەردونەی بدەینێ کەدەوری داوین وبەهۆی‌لقەکانی‌یەوە کاردەکەنەسەرمرۆڤ و شتەکان بەشێوەیەك کە تاك و ئێستاش زانست پێی نەگەشتووە .

وەئەمڕۆ ئێمە چاوەڕێی ئەوەین کەبزانین زانست چی دیکەمان لەسروشتی شەپۆلەماددی ودەروونیەکان بۆ دەدۆزێتەوە، وەڕەنگەئەولێکۆلینەوانەی کەلەم دواییانەدا دەکرێن بتوانن کلیلی هێزەدەروونیەکانمان بخەنەدەست هەروەك چۆن کلیلی وزەی ئەتۆمیان خستەدەستمان....وەلەبەرئەوە ئێمە چاوەڕێین..

وەك پێشتر باسمانکرد،دووکودەتای مەزن لەمێژوی بیری مرۆڤایەتی‌دا دەبینین یەکێکیان دۆزینەوەی هێزی ئەتۆمی‌یەو ئەوی‌تریان دۆزینەوەی هێزەدەروونی‌یەکانە.

وەڕەنگە لێکۆڵینەوەکان ببنەهۆی ئەوەی کەیەك سەرچاوەبۆ ئەم دووهێزە بدۆزنەوە،وەبەهەرحاڵ بابەتی هێزە دەرونی‌یەکان

ئەمڕۆ بووە بەجێی گرنگی پێدانی زانایان ولەزۆربەی ولآتانی جیهاندا پێش دەکەوێت.[12]

لەم دوایی‌یەدا هەندێ کتێب لەبارەی ئەم بابەتەوە دەرکەوتن کەبەداخەوە کەمو کوڕیان زۆرەو زۆربەی نوسەرەکانیشی بڕوایان بە(غەیب) هەیە،کەدیاردەی ئەم هێزە

 

بەجیهانی ڕۆحەوە دەبەستنەوە یان دەیبەستنەوە بە میتا ماددەوە ،وەمن پێم خۆشە کەبەخوێنەری ڕابگەیەنم کەمن مەیلم بەڕەت کردنەوەی ڕۆح نیە هەروەها مەیلم بەباوەڕپێهێنانیشی نیە وەباشترین نمونە لەمبارەیەوە دوبارەکردنەوەی ئەم ئایەتەیە(یسالونك عن الروح قل الروح من امر ربە وماوتیتم من العلم الا قلیلا) واتە (لەبارەی ڕۆحەوە لێت دەپرسن بلێ هەرخوادەزانێ ڕۆح چیە ئێوەش زانستێکی کەمتان هەیە).

زانستی مۆدێرن هیچ لەبارەی (ڕۆح)وە نالێت وڕەنگە تاماوەیەکی زۆریش هیچی لەبارەوە نەلێت.بەهەرحاڵ ئەوەی ڕۆح ڕەت دەکاتەوە وەك ئەوە وایە کەباوەڕی پێی هەبێت.

وەئێمە بۆمان نیە بۆ بۆچونێك لەبۆچونەکان دەمارگیربین هەرچەندە ئەگەر ئەوڕایەبەهێزیش بێت وپڕبێت لەبەلگەی بەهێز ،وەك پێشتر باسمان کرد بەلگەکان شیمانەیین وبەگۆڕانی کات دەگۆڕێن ،چونکە ئەوبەلگەیەی ئەمڕۆ پەسەندی دەکەین ڕنگە سبەی ڕەدی بکەینەوە وەئێمە بەم بنەمایە لەسەر بابەتی هێزە دەرونیەکان دەدوێین ،وەدەمەوێ ئەوە بلێم کەلەم کتێبەدا مەیلم بۆ هیچ لایەك نیەو هەروەها ئەم کتێبە لەوکتێبانەی دی کەپێشتر باسمکردن جیاوازە بەدوخاڵ:

١......لەم کتێبەدا هەوڵم داوە بابەتەکە لەڕوی ئاین و ڕۆحەوە بێلایەن بێت چونکە مەبەستم بووە پشت ببەستم بەنوێترین ئەوپێشکەوتنانەی کەلەم بوارەدا بەدەست هێنراوە هەر لەفەلسەفەو لێکۆڵینەوە دەرونیەکان وزانستی فیزیادا.

٢......نەم ویستووە لەم کتێبەدا تەنها باسی هێزە دەروونیە کان بکەم بەلکو هەوڵم داوە وەك ئەزموون لەسەر واقعی

ڕۆژانەماندا بەکاریان بهێنم وڕێ ڕۆ شن بکەم بۆ ئەو کارو بارانەی کەوا لەتاك دەکات لەئەندێشەوهەڵس وکەتەکانیا کەبەندە بەچارەنوسی یەوە ئەزموون بکەم کەدواجار وادەکات ئەم تاکە سەرکەوتوو بێت یان نەبێت.

★ ★ ★

ڕەنگە هەڵە نەبم گەر بڵێم هەریەکێك لەئێمە هەست بەڕۆڵی هێزە دەروونی یەکان دەکات لەژیانی داو هەندێکمان مەیلمان بۆ ڕستی ئەم بابەتە هەیە بەڵام هەر کە لەنێو کۆمەڵە کەسێکدا خۆی بینی یەوە ئەوا خێرا ڕەتیان دەکاتەوەو دەڵێت ئەمانە ڕاست نین و دوورن لەلۆژیکەوە. [١٣]

پێم وایە کە لێکۆڵینەوەی هێزە دەرونیەکان بۆ زۆرمان بەسوود بێت چونکەئەو گەنجینەیەی کەلەناخی دەروونماندا هەیە دەیخاتە ڕوو ،وەزۆربەی کات بەهۆی پشت گوێ خستنیانەوە توشی زیان ونەهامەتی وای کردوین کەلەکاری ئێمە دوور بووە لەڕاستی دا ئەم هێزە دەروونیانە لەهەموو مرۆڤێك دا هەیە بەڵام بەڕادەو پلەی جیاواز ،لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵکی خاوەنی برێکی کەمن لەم هێزە کەبەئاستەم هەستی پێدەکەن ورەنگە بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن سوودی لێوەرگرن هەروەك لەدواتردا باسی لێوە دەکەین بەڵام بەهەرحاڵ لەلای هەندێکەسی ناوازە زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت بەجۆرێك کە شتی سەیرو سەمەرەو لەڕادە بەدەری پێ ئەنجام دەدەن،وەك وتمان ئەم جۆرە کەسانە ناوازەن ودەرکەوتنیان لەمێژووی جیهاندا بەڕادەیەکی وا کە لەهەر نەوەیەکدا ژمارەیان لەپەنجەکانی دەست وپێ تێ پەڕنەبووە،لەنموونەی ئەو کەسانەش ـ

ئەوانەی کەبەپێی پەتی بەسەر ئاگردا دەڕۆن وئەوانەی لەدوورەوە شتەکان بەبێدەست لێوەدان دەجوڵێنن وئەوانەی بیری بەرامبەر دەخوێننەوە (تێلەپاسی)وئەوانەی تێبینی هەندێ ڕوداوی ئاینده دەکەن و....هتد....

وەلەلای خەڵك پەنهان نیيە کەئەم جۆرە کەسانە ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە لەمێژوودا لەوانە ژمارەیەکی زۆر لەپەیام بەران وسۆفی وپیاوە پیرۆزەکان وجادووگەران وبلیمەتەکان....هتد....تەنانەت فەیلەسوفی عەقڵانی(برجسۆن) و(تویبنی) وچەندانی دی وای بۆدەچن کەزۆربەیبازدانە شارستانیيەکان ئەم جۆرە کەسانە کردبێتیان... [١٤]

وەمن خۆم پێم وایە کەئەم جۆرەکەسانە بەو هێزەی کەهەیان بووە توانیویانە مرۆڤایەتی چ بۆپێشەوە یان بەرەو دواوە بەرن،کەواتە ئەم هێزە لەڕادەبەدەرانە هەروەك بەهرەکانی دیکەی مرۆڤ دەکرێ چ بۆ خێرو چ بۆشەڕ بەکار بهێنرێن. [١٥]

وتمان کەهێزە لەڕادە بەدەرەکان لەهەموو مرۆڤێکدا هەیەو ئەو جیاوازیەشی کەلەنێو هەندێ کەس وهەندێکیتردا بەدی دەکەین لەپلەی هێزەکەدایە نەك لەجۆرەکەی

دابەگووتەیەكى دى هەریەك لەئێمە تاڕادەیەك پەیام بەرێكە یان جادووگەرێكە ،چونكە پەیام بەرێتى وجادووگەرێتى لەناخى دەروونماندا هەیە،بەلآم بەپلەى جیاواز، وەزۆر جار لەژیانى ڕۆژانەماندا بەبێئەوەى پێى بزانین یان بەخۆمان بزانین سوودى لێوەردەگرین .

لەڕاستیدا،ئەزموونە تاقیگەییەكان كەزانا(ڕاین) وزانایانى دى پێى هەستان لەسەرسەدان هەزاران مرۆڤدا ئەوئەنجامەى بەخشى كە هەموو كەسێك لەناخیا دەرونێكى كاریگەرو ئەفراندناوى هەڵدەقولێ ، بۆنمونە گەرهەریەكێك لەئێمە دراوێكى هەوایى (١٠٠)سەد جار بەهەوادا هەڵبدات(لەلاى خۆمان بەشێرو خەت ناودەبرێ) وەپێش ئەوەى بكەوێتەسەر زەوى پێشبینى ئەوەبكات بەچ ڕوویەكدا دەكەوێتەوە و دواجار ئەگەر پێشبینى یەكانى زیاتر بوون لە٥٠٪. ئەوا دەلالەت لەوەدەكات كەئەو كەسە هێزێكى دەروونى باشى هەیەو واى لێدەكات تاڕادەیەك بتوانێپێشبینى لەڕوداوەكانى ئایندە بكات بەلآم ئەگەر ئەنجامەكانى لەسەدا پەنجا كەمتر بوون ئەوا ئەوكەسە لەپێشبینیدا لاوازە.

وەگەورەترین گرفت كەلەم ڕێگایەدا بەرەو ڕومان دەبێتەوە ئەوەیە كە خوێندەوارەكانمان فێر بوون هەر لەسەر بنچینەى لۆژیكى كۆن دەڕواننە شتەكان ،كەئەمەش ناودەبرێت بەلۆ ژیكى دوو لایەن لۆژیكى دوو ئاست[١٦] چونكە لەدیدى ئەواندا ئەوشتە یان هەمووى ڕاست ودروستە یان هەمووى درۆو پووچە كەئەمە ناكرێ نێوەندى هەردووكیان وەربگرن لەبەر ئەوەى ئەوان هەمیشە دەیانەوێ هەموو هێزە دەروونى یەكان ڕاست دەربچن تاكو بڕواى پێبكەن وپەسەندى بكەن .

بۆنموونە ئەگەر تەنها جارێكیش لەو شێرو خەتەدا كەباسمان كرد هەڵە بكەین ئەوا هەر زوو ڕوى خۆیانى لێ وەردەگێڕن ودەڵێن ئەمە هەمووى فێڵ وجادووە،بەلآم لەڕاستیدا هێزە لەڕادەبەدەرەكانى دەروون ناتوانێ لەهەموو ئەو نیشانەى كەپێى دەكرێ ڕاست بكەوێتەوە چونكە ئەم هێزە هەروەك هەموو بەهرەكانى دیكەى مرۆڤ شتێكى ڕەهانىیە بەڵكو كەم وكوڕى وهەڵەو نادروستىگەر بەدەگمەنیش بێت هەرتیا هەڵدەكەوێ.

ئەو تاقیكردنەوانەى ئەمڕۆ توێژەرەوەكان دەیكەن لەسەر هێزە دەروونییەكان مەرج نیە هەمیشە ڕاستییەكان بێنێتە دى. لەوانەیە ڕێژەى سەركەوتن تیایاندا لەبەرزیدا بێت جا كەمبێت یان زۆر لەڕێژەى ئەو سەركەوتنەى كە بەدەستدەهێنرێت لەئەنجامى ڕێكەوتەوە. بۆنموونە ئەگەر هاتوو ڕێژەى ڕاستى لەو گومانەدا كەبنیاتنراوە لەسەر

 

ڕێکەوت٥٠٪ بوو پاشان توانیت ڕێژەی ٦٠٪ لەگومانەکەت بەدەست بێنیت لەراستێتی ئەوا بێگومان ئەو کاتە تۆ خاوەنی هێزێکی دەروونی لەرادەبەدەرو کاریگەری.

(راین) بەسەرهاتێکی کچێکی تەمەن نۆ ساڵەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ناوی (لیلیان)ە ئەو کچە رۆشتووە بۆ تاقیگەکانی هێزە دەرونیەکان لەزانکۆی (دیوك) بۆ تاقیکردنەوەی هێزە لەرادەبەدەرەکانی لەپەیبردن و هەڵهێنان یان زانیندا، بۆیە (راین) لەبارەیەوە دەڵێت لەزانین و پەی بردنەکانیدا بە پلەیەکی سەرسوڕهێنەر شتەکانی ئەنجامداوە. لەهەموو جارێك لەجارەکانی تاقیکردنەوە بەسەریدا ئەو کچە پشتی دەکردە مێزی تاقیکردنەوەکان و بەشێوەیەك بۆ ماوەی چرکەیەك چاوی دەنوقاندو پاشان وەردەسوڕایەوەو رووی لەمێزەکە دەکردەوەو دەمی دەجوڵاندەوە هەروەك ئەوەی شتێك بڵێت یان وێردێك بخوێنێ، لەوکاتەشدا کە دەست دەگرا بە تاقیکردنەوەکان بەسەریدا ئەوا هەموو جارێك بەراستی وەڵامەکانی دەزانی و کەموکوڕی نەبوو لەهیچ شتێکداو نەدەکەوتە هەڵەوە هەرگیزاوهەرگیز[17]. بەراستی ئەمە بێگومان شتێکی دەگمەنەو هەموو کەسێك ناتوانێت ئەم ئەنجامە بە دەست بێنێت، لەوانەیە (لیلیان) خۆشی نەتوانێت لەهەموو کاتێکدا ئەم کارانە ئەنجام بدات.

لەراستیدا هێزە دەروونییەکان بەدەست ویست و داخوازی کەسەکە خۆیەوە نیە بەوەی ئەو کەسە بیەوێت زیادی کات یان کەمی کات کاتێك بیەوێت لەدەروونی خۆیدا پەرەی پێبدات. چونکە ئەوە هێزێکی ناهەستیەو لەقوڵایی عەقڵی ناوەوە دەردەچێت، بەڵکو بیرکردنەوەو راهێنان و فێربوون دەبنە ئاستەنگ و لەمپەر لەبەرامبەریدا. ئەوانەی کە جێگەی متمانەن هەندێ بەسەرهاتمان بۆ دەگێڕنەوە لەبارەی ئەو کەسانەوە کە خاوەنی هێزێکی دەروونی گەورەبوون لەسەرەتای ژیانیانداو پاشان ئەو (فریشتە- هێزە دەروونیە)یان لێ وون بووەو لەدەستیانداوە پاش ئەوەی چوونەتە قوتابخانەو مومارەسەی بیرکردنەوە چڕوپڕەکانیان کردووەو راهێنانیان کردووە لەکردەوە عەقڵییەکانیاندا.

ئەوانە بەو کەسانە دەچن کە لەپێشاندا بەرووخۆشی و نەرمونیانی و زمان پاراوی سروشتییەوە قسەیان دەکردو پاشان زمانەکەیان شێوا دوای ئەوەی دەستوورو ڕێزمان فێربوون و مومارەسەی ئەو ڕێزمان و دەستورە زمانەوانییە قورسەیانکرد. وەك بڵێیت ئەو (فریشتە- هێزە دەروونییە)ی وا لەقوڵایی ناخی عەقڵی شاراوەوە دێنە دەرەوەو نەمێنن و

بەرەو کەم بوونەوە بچن ئەگەر هاتوو عەقڵی دیار تێکەڵ بوو بەعەقڵی نادیارو بوویە لەمپەر لەبەردەمیداو بنەماکانی بیرکردنەوەی بەکارهێنا.

بۆیە ئەم کتێبەم ناونا ((هێزە لەڕادەبەدەرەکانی نەست)) یان ((نهێنییەکانی کەسێتی سەرکەوتوو)) چونکە بەم کارەم من دەمەوێت خوێنەر ئاوڕێك بداتەوە لەلایەنی کەسایەتی مرۆڤایەتیکە لەوانەیە بێئاگا بێت لێی: ئەوەش لایەنی (نەست)ە یان هەندێجار ناودەبرێت بە ((عەقڵی ناوەوە- عەقڵی نادیار)).

دەشێ عەقڵی مرۆڤایەتی بچوێنین بە شاخێکی سەهۆڵبەندانی رووت لەدەریاکانی قوتبیدا بە جۆرێك هیچ شتێکی لێوە دیارنەبێت تەنها بەشێکی بچوك نەبێت لەسەر ڕووی ئاوەکە، بەڵام بەشە گەورەکەی بەتەواوی نقووم بووبێت لەئاوەکەدا بە چەشنێك هیچی لێوە دیار نەبێت.

زۆربەی هەڵسوکەوت و جموجوڵەکانی مرۆڤ ئەو بەشە نقووم بووە لەعەقڵ بەڕێوەی دەبات و عەقڵی دیاریش هیچی ترنیە تەنها فێڵکردن و هەڵخەڵەتاندن نەبێت و مەبەستێکە لەچاوڕاوو رازاندنەوەو باق و بریق لەسەر حەقیقەتی شتەکان.

من حەزدەکەم لەم کتێبەمدا کە دەیخەمە بەردەستی خوێنەر هاوارێکی پڕ دەمی درێژ خایەن دروستبکەم لەدژی ئەم نایینە چەق بەستووە بێ خێرەدا کە لەناو گەنجە خوێندەوارەکانماندا لەم رۆژانەدا پەرەی سەندووەو وای لێکردوون باوەڕیان هێناوە بە عەقڵ و هەروەك خواوەندێك دەیپەرستن.

وەك ئەو روداوەی کە (رۆبسبیر) پاڵەوانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسی بەخۆی و سەماکەرێکەوە هات لەسەردەمی توندوتیژیداو فەرمانیدا بە پاریسییەکان تا ئەو سەماکەرە بپەرستن بەو ئیعتیبارەی کە سومبولی عەقڵی مرۆڤایەتییە. بەم کارەی دەیویست خواوەند لەعەرشەکەی داگرێت و عەقڵ بخاتە جێگەکەی. بەمەش دەیەوێت ئەوە بسەلێنێت کە ئەمە (داهێنان)ێکی فکرییەو لەگەڵ رۆحی شۆڕشی فەرەنسیدا هاتووە... بۆ نەگبەتی و بەدبەختی ئەم (داهێنان)ە لەگەڵ سوپاکەی ناپلیۆندا گوێزرایەوە بۆ میسرو لەوێ مایەوەو پاشان تەشەنەی کردو بڵاوبوویەوە بە وڵاتە عەرەبییەکانی تریشدا.

لەوانەیە زیادەڕەوی نەبێت ئەگەر وتمان زۆربەی لاوە تازەکانمان کاریان تێکراوە بەم حاڵەتەو ملکەچن و گوێڕایەڵن بۆ فێربوونی بە گوێڕایەڵبوونێکی نەستیانە. تۆ ناتوانیت

 

لەگەڵ یەکێکدا بکەویتە گفتوگۆوە لەبارەی کەسایەتی مرۆڤو ئەو هۆکارە کاریگەرانەی لەپێکهاتنیدا رۆڵیان هەیە، تەنانەت دەبینیت بەجۆریك ئەو حەماس دەیگرێت و دێتەوە بەرووتداو لەسەر بنەمایەکی والێکیدەداتەوە کە شانازی دەبەخشێتە عەقڵو کەسایەتیش وا دەبینێت کە لەسەر ئەو عەقڵە جێگیربووە لەهەموو شێوازو رواڵەتە جیاوازەکاندا. چونکە ئەو بڕوایەکی تەواو چەسپاوی هەیە بەوەی مرۆڤ ئەگەر هاتوو عەقڵی خۆی بەکارهێناو کارەکانی خۆی پێ بەڕێوەبرد ئەوا بێگومان ئەو کاتە کەسایەتی پەسەندو ناوداری دەبێت[18].

من لەم ئامۆژگارییەدا هیچ نابینم جگە لەبێ مانایی و هیچوپوچی. هەروەها ئەوانەشی بڕوایان بەم ئامۆژگارییە هەیە هەروەك ئەو گێلو گاوارانە وان کە بۆ یەکەمجار لەژیاندا فڕۆکەیان بینی نیشتەوە لەنزیکی کوخەکانیانەوەو بە سەرسامییەوە دەیانڕوانییە هەردوو لاقی کابرای فڕۆکەوانو بەواق وڕماویەوە کەوتنە پرسیارکردن لەفڕۆکەوانەکەو پێیان وت چۆن تۆ دەتوانیت بەو دوولاقە لاوازەوە ئەو فڕۆکە گەورەو زەبەلاحە بەرزکەیتەوە لەهەوا، ئەوان لەخەیاڵی خۆیاندا وای بۆ دەچوون کە فڕۆکەوانەکە فڕۆکەکە بەرزدەکاتەوە لەسەر هەردوو لاقی خۆیو پاشان دەفڕێت لەهەوادا هەروەك چۆن یەکێك لەخۆیان شتێکی قورس بەرزبکاتەوە لەهەواداو بێ ئاگابوون لەوەی کە چی هەیە لەفڕۆکەکەداو لەبزوێنەرو ئامێرە جۆربەجۆرەکانی تری کە لێی پێکهاتووە.

توێژینەوە دەروونییەکانی ئەم دواییە لەوانەیە ئاماژە بەوەبدەن کە مرۆڤ لەزۆربەی کارەکانیدا ئیجبار کراوەو ئیختیار لەدەستی خۆیدا نەبووە، لەقوڵیی دەروونی مرۆڤایەتیدا لەهۆکارە شاراوەو نادیارەکان لەوانەیە وەکو ئەو ئامێرە هەمە جۆرە شاراوانەی ناوەوەی فڕۆکەکە وابن دیسان زیادەڕەویمان نەکردووە ئەگەر بڵێین زانایانی ئەمڕۆمان بەلای ئەو قسەیەدا دەیشکێننەوە کە ئەمە ((جەبر))ە لەبابەتی کەسایەتی مرۆڤایەتیدا، بەڵام ئەوەی شایانی باسە بەم بۆنەیەوە بوترێت ئەوەیە کە ئەو چەمکی جەبرەی ئەم زانایانە دەیڵێن جیاوازە لەو چەمکەی وا زانایانی عیلمی کەلام زاراوەیان بۆ داناوە لەئیسلامدا، چونکە ئەوە جەبرێکی میتافیزیکی یان پەنهان نیە بەڵکو روونتر بڵێین ئەوە جەبرێکی نەستیە (ناهەستیە)، کە سەرهەڵدانی هۆکارەکانی لەنێو قوڵایی عەقڵی شاراوەوە سەرچاوە دەگرێت.

مرۆڤ یەکەمجار بە عەقڵی نادیار دەچێ بەڕێوە پاشان عەقڵی دیار سەرهەڵدەداتو دەدەکەوێت بۆئەوەی پاساوی ئەو شتانە بداتەوە کە مرۆڤ دەیکاتو زاخاویان بداتەوەو دایانبڕێژێتەوە لەبەردەم خەڵکیدا تا بەشێوەیەکی شایستەو ڕواڵەتێکی پەسەندکراو دەربکەون.

بۆیە دەگونجێت بڵێین مرۆڤ ئیش دەکات پاشان بیردەکاتەوە، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کەپێشینان دەرکیان پێکردووە، چونکە ئەو دەڕۆیشت بەرەو ئاڕاستەی شتەکەو پاش ئەوە بیری لێ دەکردەوە، وەك ئەو شەوکوێرەی لێ دێت کە پێ دەنێت بەسەگێکدا بەبێ ئەوەی بیبینێت پاشان دەڵێت: من دەمەوێت بیکوژم.

هەربۆیە پێشینان لەو بڕوایەدان کە مرۆڤ ئاژەڵێکی ئاوەزدارە (عاقڵە)، لەواقیعدا ئاژەڵ تێگەیشتووە، بەڵام مرۆڤ تێگەیشتووە نەك عاقڵ بە دیمەن وا دەردەکەوێت کە عاقڵە بەڵام لەڕاستیدا شێتە.... بەشێوەیەك لەشێوەکان.



لەوانەیە خوێنەر بپرسێت: کامەیە ئەو عاقڵە نادیارە (شاراوە)یە کە مرۆڤ لەسەری دەڕوات لەزۆربەی کارو کردەوەکانیدا؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆر زەحمەتە. چونکە عەقڵی نادیار حاڵەتێکە لەو حاڵەتانەی وا لێکۆڵەرەوەکان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەریو لەچەند دیدو بۆچوونێکەوە دەیدەنە بەر لێکۆڵینەوە تا لەدواجاردا ئەوە دەرکەوت کە زانایان سەرپێچی لەبوونی دەکەن بەسەرپێچیکردنێکی تەواو یەکجارەکی.

ئێمە لێرەدا نامانەوێت بچینە ناو ئەم مشتومڕەوە یان بڕیاری لەبارەوە بدەین. ئەوەی دەمانەوێت خوێنەری لێ تێبگەیەنین ئەوەیە کە عەقڵی شاراوە یان -ناهەست- [١٩] زاراوەیەکە دەتوانین بەهۆیەوە ئاماژە بەو ڕووداوە ناوەکیانەی دەروونی پێ بکەین کاتێك ڕوودەدەنو فیکر هەستیان پێ ناکاتو ناچنە بواری هۆشیاریو تێڕامانیشەوە.

ئەوانەی سەرپێچی عەقڵی نادیار دەکەن لەمرۆڤدا ناتوانن لەگەڵ ئەو سەرپێچی کردنەشیاندا سەرپێچی لەو دەبەنگی لاوازیە بەرچاوەی عەقڵی دیاردا نەکەن کە دەبینرێت لەناڕاستەکردنی ئیشو کارەکانی تاکدا. جا ئیتر ئەو کەسە لەشوێنکەوتوانی (پافلۆف) بێت یان لەشوێنکەوتوانی (ماکدۆیل) بێت لەبۆچوونە زانستییەکەیدا چونکە ئەوە بەرگری لێ

ـکات لەو دانپیانانەی کە هەیەتی لەو بوارانەدا وا دەروونی تێدا نقوم بووەو هەست پێی
ـازانێتو تێرامانی بۆی نیە مەگەر بە دەگمەن نەبێت.

لەوانەیە لەجێگەی خۆیدابێ بڵێین: تیۆری عەقڵی نادیار لەسەر پەیوەندییەکانی خۆی
ـۆرشێکی گەورەی بەرپاکردووە لەمێژووی بیری مرۆڤایەتیدا.

فرۆید لەو سەرمەشقانەیە کە خزمەتێکی گەورەی وای پێشکەشی مرۆڤایەتیکردووە بە
داهێنانەکانی لەبواری تیۆری نەستدا کە مەزەندە ناکرێت.

بیرمەندانی ئەمڕۆ خۆ نادەن بەدەستەوەو بڕواناکەن بە تیۆری عەقڵی شاراوە هەر
وەك چۆن فرۆید هێناویەتییە ئاراوەو بڕوای پێی هەبووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم
بیرمەندانە هەست بە گەورەیی ئەو کاریگەریانە دەکەن کە ئەو بیردۆزە (تیۆرە) جێی
هێشتووە لەسەر سروشتی توێژینەوە دەرونییەکانیان. بەڵام بیریارانی پێش (فرۆید)
کاریگەر بوون بە فەلسەفەی کۆن ئەو فەلسەفەیەی کە بڕوای بە عەقڵی دیارهەبوو بە
هەموو مانایەکی بڕواپێبوونەوەو دایدەنا بە زاڵترینو گەورەترین چاودێر بەسەر
هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤدا. بەڵام ئاگایان لەوە نەبوو کە لەناوەوەی دەرووندا ناوچەیەکی
ناهۆشیار (نا ئاگا)هەیە کاردەکاتو کاریگەریشی هەیە بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێ بکات.
بۆیە لەسەر ئەم پێودانگە هەموو هەڵسانو دانیشتنێکی(هەڵس و کەوتێکی) مرۆڤیان
ڕاڤەدەکرد لەخوو ڕەوشتی مرۆڤدا بە ڕاڤەکردنێکی لۆژیکانەی پشت بەستوو بەئاگاییو
بیرکردنەوە.

لەکاتێکدا ئەگەر فەرمانیان بدایە بە هۆکاری ژیربێژی لەکردەوەیەك لەکردەوەکانی
مرۆڤدا ئەوا ئیختیراعێکیان بۆ دەکرد لەکردنی شتە باشەکانداو بەگژداچونەوەیەکیشیان
بۆ دادەنا لەکردنی شتە ناپەسەندو خراپەکاندا بۆ نموونە ئەگەر پیاوێکی بەخشندەو
چاکەخوازیان بدیایە ئەوا یەکسەر فەرمانیان دەدا بەوەی کە ئەو بەخشندەو
چاکەخوازییەی لەئەنجامی زیرەکیو بیرکردنەوەی خۆیدا بەدەستهێناوە، بەڵام ئەگەر
تاوانبارێکیان بدیایە ئەوا ڕاڤەی ئەو تاوانکردنەیان بەوە لێکدەدایەوە کە گوایە ئەو کەسە
بیرکردنەوەی لاوازە یان بیرکردنەوەکانی ئاڵۆزو شێواوە.

بەڵام ئەگەر شێتێکیان بدیایە ئەوا هەوڵیاندەدا قەناعەتی پێ بکەن بە سەلماندنە
ژیربێژییەکان تائەو کاتەی عاقڵ دەبێت، وە ئەگەر بێتو بهاتایە ئەو شێتە نەهاتایەتە ژێر

بارو بۆیان کەوی نەکرایە لەسەلماندنەکانیاندا ئەوا رقیان لێ هەڵدەگرت و لێی دەچوون بەقینداو دەکەوتنە ویزەی بەلێدان و سزادان و تۆڵەیان لێ دەکردەوە، ئەوان بەم کارمیان لەوپوو لاوە زوڵمیان لێ دەکرد: لەلایەکەوە سزایان دەدا لەسەر تاوانێك کە دەستی ئەوی تێدانەبوو لەلایەکی تریشەوە توشیاندەکرد بە نەخۆشی دەروونی وەك لەوەی چاکی کەنەوەو دەرمانی بدەنێ بەلام گیرۆدەیان دەکردو ئیتر دەردی دەرمان نەدەکرا. هەروەها بەهەمان شێوە سزای توندیان دەدا بەسەر تاوانباردا لەسەر ئەو بنەمایەی گوایە مرۆڤ وازدێنێت لەتاوانکردن ئەگەر هاتوو سزای توندو سەختت دابەسەریا- بەلام ئەوەیان لەبیرچووبوو ئەگەر هاتوو مرۆڤ تاوانی زۆری ئەنجامدا مانای ئەوەیە پەلکێشکراوە بە هۆکارە نائاگاییەکان و هیچ پەیوەندییەکی نیە بەسەلماندنی فیکر یان لۆژیکەوە.

ئەوەبوو لەدواجاردا فرۆید هاتوو بۆمبا پرشنگدارەکەی خۆی تەقاندو وتی: مرۆڤ دوو عەقڵی هەیە: دیارو نادیار (دەرەوەو ناوەوە)، زۆربەی ئیش و کارەکانی مرۆڤ لەسەر ئەو هۆکارە هەڵقوڵاوانە دەڕوات بەرێوە کە لەعەقڵی ناوەوە دێنە دەرەوەو مرۆڤ هەستیان پێ ناکات وە نازانێت چۆن روودەدەن. دەگونجێ تیۆرەکەی (فرۆید) دابنرێت بە خاڵی وەرچەرخان لەمێژووی لێکۆڵینەوە دەروونییەکاندا، ژمارەیەکی زۆریش لەتوێژەرەوان ئەمڕۆ تیۆری عەقڵی نادیار بەهەند وەردەگرن و بادەدەنەوە بەلایدا سەرەڕای ئەو جیاوازییەیان لەگەڵ (فرۆید)دا لەسەر ناوەڕۆکەکانی ئەم عەقڵە. بە دەربڕینێکی تر: بیریارانی ئەمڕۆ تەبان لەگەڵ (فرۆید)دا لەسەر پەیکەری عەقڵی نادیارو جیاوازن لەگەڵ فرۆیددا لەسەر ئەو سروشتەی کە لەناوەوەی ناوەڕۆکەکانی ئەم پەیکەرەدایەو رەخنەی لێدەگرن لەسەر ئەو لەڕادە دەرچوونەی لەپێداگیری هۆکاری سێکسیدا هەیەتی[20]. چونکە بەدیدی ئەوان عەقڵی نادیار دانانرێت بە گەنجینەیەك تەنها بۆ ئارەزووە سێکسییە سەرکوتکراوەکان هەروەك (فرۆید) وێنەی دەکات، عەقڵی نادیار دادەنرێت بە شیاوترین شوێنگەی هەموو ئارەزووە سەرکوتکراوەکان، سێکسی بن یان ناسێکسی.

ئەگەر پیاوێك سوکایەتی پێکردیت یان دەستدرێژی کردە سەرت بەشێوەیەك بەهۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە نەتوانی بەرپەرچی سوکایەتییەکەی بدەیتەوە، بەلام لەو کاتەدا ئارەزووی تۆڵە دەچێتە عەقڵی نادیارتەوەو لەوێدا دەمێنێتەوە بە حەشاردراوی و هەوڵی خۆ دەرخستن و هاتنەدەرەوە دەدات لەخودی خۆیدا بەزۆر شێوەو رەنگی جیاواز، تا وای لێ

ـێت تۆ رێدەکەیت لەسەر ژیانی خۆت بە جۆرێك كە هەست ناکەیت بەو ئارەزووە ـەراوەیە لەقوڵایی دەروونتاو لەوانەیە هەر لەبیریشت نەمابێت رووداوی ئەو دەستدرێژیکردنە بەتایبەتی ئەگەر لەتەمەنی منداڵیدا رووی دابێتو پاشەکشێت لێ کردبێت بەهۆی رۆژانی داهاتوو بەسەریداو سەرقاڵی ژیانتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەرییەکی ناهەستی لەسەر بەجێ هێشتووی بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانی بۆیە لەوانەیە پیاوێکی تر ببینیت لەشێوەی هەمان پیاودابێت کە سوکایەتیو دەستدرێژییەکەی کردیتە سەر ئەوا بەشێوەیەك لەشێوەکان هەست بەرق لێ بوونی دەکەیتو تەنانەت ئارەزووی ئەوە دەکەیت کە تۆڵەی خۆتی لێ بکەیتەوە. ئەگەر پرسیارت لێ بکەن لەبارەی ئەو رق لێبوونەت لەو پیاوە بەبێ زانینی ئەو پێشینەیەی رابردوو ئەوا لەوانەیە لەوەڵامدا بڵێیت: ((لەخواوەیە ئەو رق لێ بوونەوەم لێی))، کەواتە بەم کارەشت زوڵمێکت دایە پاڵ خوا کە بەهۆی ئەو کاریگەرییەی عەقڵی نادیاری خەفەکراوتەوە پێی هەستایت!.

ئەوەی شایانی باسە لەم بوارەدا بوترێت ئەوەیە کە ئەوانەی سەرقاڵن بە توێژینەوەی هێزە دەروونییە لەرادەبەدەرەکانەوە دەکرێن بەدوو کۆمەڵەی دژ بە یەکەوە لەبەردەم تیۆری عەقڵی نادیاردا:-

کۆمەڵێکیان بڕوایان بەرۆحیەتی ئەو هێزانە هەیەو نایبەستنەوە بە بوونی عەقڵی شاراوەوەو وای دادەنێن ئەو هێزانە لەسە رچاوەیەکی دەرەوەی دەروونی مرۆڤایەتییەوە هەڵدەقوڵێن یان لەدیدی ئەواندا ئەو هێزانە لەرۆحی بوونەوەرەوە ویان لەنهێنی خواوەندەوە دەردەچنو سەرچاوە دەگرن.

بەڵام کۆمەڵەکەی تریان ئەوانەن کە ئەو هێزانە دادەنێن بە تایبەتمەندێتییەکانی کەسێتی مرۆڤایەتی بەوەی پێداگیری دەکەن لەسەر بوونی عەقڵی نادیارو سوورن لەسەر ئەوەی کە عەقڵی نادیار سەرچاوەی هەڵقوڵینی ئەو هێزانەیە.

کۆمەڵی یەکەم وێناکردنیان بۆ عەقڵی مرۆڤایەتی بەو ئاقارەدا دەبەن کە دەیگەرێننەوە بۆ چینە شاراوەو نادیارەکان بەرەو سەرەوە رووەو ئاسمان یان بەواتایەکی تر بەرەو مەلەکوتی خواوەند یان رۆح، بەڵام کۆمەڵی دووەم بەپێچەوانەی ئەمانەوە لەو بڕوایەدان عەقڵ ئاراستەیە رووەو خوارەوە بەشێوەیەك رۆدەچێتە چینە شاراوەکانی

ژێرەوەی قولایی دەروون، کۆمەڵەی یەکەم ئەوانەن کە بڕوایان بەخوا هەیەو کۆمەڵەی دووەمیش ئەوانەن بڕوایان بە مرۆڤ هەیە! ئەوەشمان لەبیر نەچێت لەوانەیە خواو مرۆڤ هەردووکیان یەك شت بن، بۆیە هەر لەم ڕوانگەیەوە یەکێ لەژیرو دانا (حەکیم)ە کۆنەکان دەڵێت: ((ئەوەی خۆی ناسیبێت ئەوا خوای خۆی ناسیوە))[٢١]. بە هەرحاڵ زۆربەی توێژەرەوان لەم بابەتەدا بەلای ئەوەدا دەڕۆن و ئارەزوویان لەبڕواکردنە بە بوونی عەقڵی ناوەوەو دای دەنێن بە سەرچاوەی هێزە دەروونییە کاریگەرەکان. ئەمەش بەو مانایە دێت کە عەقڵی نادیار لەدیدی ئەو توێژەرەوانەدا بووە بە بوارێك بۆ دوو جۆر لەهێزە شاراوەکان: ئەوەش ئەو گەنجینەیە بوو بۆ ئارەزووە سەرکوتکراوەکان لەلایەکەوە هەروەك لەمەوپێش ئاماژەمان بۆ کرد، لەلایەکی تریشەوە بریتییە لەسەرچاوەی هێزە کاریگەرو لەڕادەبەدەرەکان[٢٢]. کەواتە دووبارە ئەو شوێنەیە هەم بۆ خواوەندو هەم بۆ ئەهریمەن پێکەوە. ئەوەش پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت جاروبار لەپێناوی چاکەو داهێناندا، لەلایەکی ترەوە پاڵپێوەنانی مرۆڤە لەپێناوی خراپەو دەستدرێژیکردندا هەندێ جار.

(مایرز)دەڵێ: عەقڵی شاراوە پێکهاتووە لە((کانێکی ئاڵتوون و هەروەها سەرەنوێلکێکی پیس و بۆگەن))[٢٣].

لێرەدا ڕەخنەگرێك ڕەخنەدەگرێت و دەڵێت: ئەگەر عەقڵی شاراوە هەروەك دەوترێت چاوگەی دوو جۆری جیاوازی هاندان بێت، یەکێیان باش و ئەویتریان خراپ، چۆن کەسێکی سادە دەتوانێت جیاوازی لەنێوانیاندا بکات بۆئەوەی بتوانێت ڕێ بکات لەسەر ئەو ڕێگایەی کە دەبێتە ئامانجی لەپێناوی سەرکەوتندا؟

لەواقیعدا ئەمە یەکێکە لەو کێشە گەورانەی دێنە ڕێمان لەم توێژینەوەیەدا بەوەی ئەگەر هاتوو ئامۆژگاری کەسێکمانکرد گوێڕایەڵی هاندەرە ناهەستییەکانی خۆی بێت بەبێ جیاوازیکردن لەنێوانیانداو هەمیشە پشتیان پێ ببەستێت لەژیانی کردەییدا، لەوانەیە بیخەینە هەڵەو سەرلێشێوان و تێوەبگلێت: بەوەی کە بکەوێتە شوێن ڕێنماییەکانی ئێمە لەپێناوی تێرکردنی ئارەزووە خەفەکراوەکانیداو گرێکوێرە شاراوەکانی ناخی پاڵپێوەنەری بن بەشێوە یە کی هەڵەشەو سەرچڵ.

لەوانەشە بە بارەگەی تردا بکەوێتە ئازاردانی خەڵك و هێرش بکاتە سەریان بەو خەیاڵ پلاوییەی کە هەست دەکات بەو هاندەرە ناهەستیەو ئەو هاندەرەشە کە پەلکێشی دەکات بۆ ئەو کارە.

مرۆڤ پێویستە خۆ بپارێزێت بە هەموو مانایەکی خۆپاراستن لەهاندەرەکانی عەقڵی ناوەوەی، نابێت خێرا هەمووی رامالێت بە ئیحایەك کە بۆی دێت بەڕامالێنێکی تەواو. زۆر جار دێت بە خەیاڵی مرۆڤدا یان لەبیریدا چەکەرە دەکات و لەوکاتەدا ئەو کەسە دۆشدادەمێنێت و سەرسام دەبێت و نازانێت ئایا ئەم خەیاڵە لەهێزە ئاشکراو دیارەکانەوە هەڵقوڵاوە یان لەئارەزووە سەرکوتکراوەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە ئەم کەسە لەم حاڵەتەدا دووبارە پێویستی بە کلیلێکە بۆ کردنەوەی ئەم تەلەسمەو جیاوازی کردن لەنێوان چاکەو خراپە لەهاندەرە نەستییەکانیدا. بۆ نموونە تۆ بۆ یەکەم جار کەسێك دەبینیت لەژیانتداو یەکسەر رقت لێیەتی و قێزت لێی دێتەوەو خۆشت نازانیت چی پاڵیپێوە ناوی بۆ ئەوەی رق لێ بوون و بوغزاندنە کتوپڕە. لەم کاتەدا تۆ بەسەرسامی و دوو دڵییەوە لەنێوان دوو راڤەکردندا وەستاویت:- لەوانەیە ئەم کەسە قێزەونە لەهەمان ئەو کەسە بچێت کە لەرابردوودا ئازاری داویت و زیانی پێ گەیاندوویت لەرۆژانی رابردوو داو ئەو ئێش و ئازارەی لەقولایی عەقڵی شاراوەتدا گرێکوێرەیەکی جێهێشتبێت و وای لێکردبیت رقت لەهەر کەسێك بێتەوە کە لەشێوەی ئەودا بێت، یان لەوانەیە ئەو رق لێبوونەت لەئەو لەهەمان ئەو کاتەدا بێت کە ئەویش رقی لەتۆیەو بەجۆرێك بۆتە هۆی روودانی رووبەڕووبونەوەیەکی ناهەستی لەنێوانتاندا، وەلەوانەشە ئەو دەست پێشخەر بووبێت لەو هەستکردن بە بوغزاندن و رق لێ بوونەو گوێزرابێتەوە بۆ تۆش ئەو جۆرە هەستکردنە لەرێگای شەپۆلە دەروونییەکانەوە یان لەرێگای (ئاڵوگۆڕی بیروڕا)وە هەروەك جاروبار بەم ناوەش ناوزەد دەکرێت.

لەڕاستیدا کێشەیەکی زەحمەتەو من بانگەشەی ئەوە ناکەم بتوانم زاڵبم بەسەر چارەسەرکردنیدا بە چارەسەرکردنێکی راست و دروست. بەڵام ئەوە سوود بەخشە کە لێرەدا بتوانم بیڵێم ئەویش ئەوەیە: کەسێك یان تاکێك دەتوانێت پاش مومارەسەکردنێکی بەردەوام بۆ ئەم کێشەیە چارەسەرێکی تایبەتی بۆ بدۆزێتەوە. کەسی پێگەیشتوو دەتوانێت سنورێك دانێت بۆ ئەو دۆزینەوانەی وا لەعەقڵی ناوەوەیدایە لەگرێ و ئارەزووە

سەرکوتکراوەکان، پاشان ئەو کەسە دوای تێپەڕبوونی تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکان بەسەریدا دەتوانێت جیاوازی بکات کەم یان زۆر لەنێوان سوود بەخشو زیان بەخش لەهاندەرەکانی دەروونیدا.

لەوانەیە ئەو وتەیە ڕاست بێت کە دەڵێت:- تاك هەرچەندە گرێ دەروونییەکانی کەم بێت زیاتر دەتوانێت سوودمەند بێت لەهێزە کاریگەرەکانی خۆی. ئەوەشی کە دەروونی پڕبێت لەگرێو گۆڵو ئارەزووە سەرکوتکراوەکان ئەوا زەحمەتە سەرکەوتن وەدەستبێنێت لەکاتی هەڵسوکەوتیدا لەگەڵ خەڵکیدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە هێزە کاریگەرەکانی پاڵفتە یان ئازاد نییە لەکارەکانیدا بەوەی کە پیس بووەو تێکەڵبووە لەگەڵ گرێکوێرەو سۆزدارییە هەڵەکانەوە بەمەش سەر لەخاوەنەکەی دەشێوێنێتو نایەڵێت داهێنان بدۆزێتەوەو بەرهەمی بێنێت یان بە شایستەیی کارەکانی ئەنجام بدات.

دەڵێن پێغەمبەری ئیسلام محمد (د.خ) هێزی ناسینەوەو دەستنیشانکردنی بەهێز بووە بۆ دەستنیشانکردنی باشترین هاوەڵو یارویاوەرانو شوێنکەوتوانی ئەمەش هۆیەکە لەهۆیە گەورەکانی سەرکەوتن لەژیانیدا. من بەش بەحاڵی خۆم بۆم دەرکەوتووە ئەم پەیبردنو دەستنیشانکردنەی (محمد) بەڕێکەوت نەبووە، هەروەك لەبارەیەوە دەیگێڕنەوە، بەڵکو لەپاکژیو دڵنیایی دەروونییەوە بووە بەوەی کەهیچ رقو کینەیەکی نەبووە بەرامبەر بە کەس، وە ئەم پاکژیو بێگەردییەی دەروونی بێگومان بووە بەهۆی باشتر بەرهەمهێنانی هێزە کاریگەرو نائاساییەکانیو بەهۆیەوە نهێنییەکانی دەروونی خەڵکی زانیوەو پێشبینی کردووە چی لەسروشت و نیەتیاندایە. کەسی دەروون ئاڵۆز لەسەر بنەمایەکی نادروست خەڵکی خۆش دەوێتو رقیشی لەخەڵك دەبێتەوە. چونکە بە دوای سۆزە سەرکوتو خەفەکراوەکانیدا دەڕواتو ناتوانێت لەڕاستییەکانی خەڵك تێ بگات یان بچێتە نێو قوڵایی دەروونیانەوە. لەبەرئەوە شوێنکەوتەی رسواییو نوشوستی دەبێتو هەڵدێت لەلێهاتوویيو تێگەیشتن بۆیە بەم کارەی گوڕ بۆ خۆی هەڵدەکەنێتو بەسمەکڕێ دەڕوات بەرەو پیری مەرگ[24].

# پوختەی ئەم پێشەکییە

لەڕۆچوونی نەستدا هێزی داهێنەر هەیە دەتوانێت جڵەوگیری تاك بكات لەپێناوی سەرکەوتندا ئەگەر بێت و بەرهەمهێنانی باش بێت و پاکی کاتەوە لەهەموو ئەو پێوە لکاوانەی کە لەسۆزداری و ئارەزووی ناشایستەوە سەرهەڵدەدەن. من بۆ خۆم گومانم هەیە لەوەی کەپێی دەڵێن (بەخت) لەناو خەڵکدا بەگشتی، وای تێدەگەم بەرهەمهێنراوی ئەم هێزە لەڕادەبەدەرە نەستیانەیە. زۆرینەی خەڵك سوودمەندن لەم هێزانە لەژیانیاندا بەبێ ئەوەی هیچ لەبارەی سەرچاوەکەیەوە بزانن یان لەماهیەتی تێبگەن و دەیدەنەپاڵ بەخت و چارەنووس بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی هەبێت بە بەختەوە، بەڵکو ئەو جوڵەو هاندان و قەڵەمبازانەیە کە لە ناوەوەی دەروونەوە هەڵدەقوڵێن و خەڵکیش لەوبڕوایەدان کە لەدەرەوە هاتووە...



من ئەمەوێت لێرەدا کۆتایی بەم پێشەکیە بێنم بە داوای لێبووردنەوە لەخوێنەری بەڕێز بەوەی کە درێژەم پێدا. بەو مەبەستەی پوختەکەی بخەمە بەردەستی خوێنەرو پاشان لەبەشەکانی تری کتێبەکەدا بەدرێژی لەهەموو بەش و بابەتەکان دەدوێین.

چونکە ئەو حسابەشمکردووە هەندێ لەخوێنەران کاتیان بەدەستەوە نییە تا بتوانن کتێبەکە هەمووی بخوێننەوە، بۆیە لەوانەیە بەخوێندنەوەی تەنها پێشەکییەکە سوودمەندبن لەپوختەو مەبەستی بابەتە کان.

داواش لەوخوێنەرانە دەکەم کە توانای تێگەیشتنیان نییە لەم توێژینەوەیە با لێرەدا بووەستن و خۆیان ماندوونەکەن... تەنها ئەوەیان بەسە کە لەپێشەکییەکەدا خوێندوویانەتەوەو لێی نەگشتوون لەبەرئەوە با پشووبدەن و ئاسوودەبن....

بەڵام ئەوانەش کە دەیانەوێت درێژە بە خوێندنەوەی کتێبەکە بدەن و تێبگەن ئەوا من بەشەکانی تریان دەخەمە بەردەست و سەرپشکن لەخوێندنەوەی هەرچەندە لەوانەیە لەچەند بەشێکیدا دووبارەبوونەوەو پێکەوە نەگونجان و سەفسەتە هەبێت بەڵام ئەمە مەبەستێکە گاڵتەی پێ ناکرێت. پۆزشم هەیە لەوەدا کە من لەدەرگای توێژینەوەیەکم داوە کە پێشتر کەس بەم شێوەیە لێی نەداوە، لەوانەیە سەرکەوتووبم لەمەو پاش بە رێکخستن و بەپێتی بابەتەکان دیارە بەو کارەشم رەزامەندی خوێنەران بەدەست دێنم.

## پەراوێزەکانی ئەم پێشەکییە

١. کتێبەکەش بریتییە لە: Tyrrell, the Rersonality of man.

٢. ئەم حاڵەتەمان بینیوە لەکاتێکدا کە بۆ یەکەم جار رادیۆ هاتە عێراقەوە, چۆن زۆرینەی خەڵك ئەو شتەیان بەدرۆدەخستەوەو بڕوایان پێ نەدەکرد هەروەها هەندێ لەو کەسانە مانەوە لەسەر کەللە رەقی خۆیانو دووره پەرێزبوون لەوەی کە بڕوا بکەن بەو کارە تا ماوەیەك لەمەوبەریش... بەراستی هەرچی هەوڵو تەقەلایەك دەدرا بۆ قەناعەت پێکردنیان سوودی نەبوو هەمووی بەبا رۆیشت لەو پێناوەدا.

٣. بڕوانە: سلێمان دنیا، الحقیقه ‌فی النقر الغزالی، ص١٤٥.

٤. بڕوانە: Wilson, Great men of science, ch.

٥. بڕوانە: Ross (ed), outline of Modern Know ledge, p.٣٦-٣٧.

٦. Dampier, Ahistort of Science, p.٢٨٤.

٧. بڕوانە: Jeans, The Mysterius Universe, p.٩٣.

٨. بڕوانە: Wilson, op. p.٣٤٦-٤٧.

٩. بەهەرحاڵ پێویستە لەسەرمان دەمارگیر نەبین بەرامبەر دۆزینەوەکان لەسەدەی بیستەمدا هەروەك چۆن هاورێکانمان دەمارگیرو دڕدۆنگ بوون لەبەرامبەر دۆزینەوەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا. چونکە دەمارگیریو بەدرۆخستنەوە بەهەموو جۆرەکانییەوە دەرگای لێکۆڵینەوە دادەخاتو زیهن وا لێ دەکات تەنها لەیەك لایەنەوە لێکۆڵینەوە بکاتو لایەنەکانی تر هەموو پشت گوێ بخات. زۆر ڕێی تێدەچێت کە زاناکان لەسەدەی بیستو یەکدا ڕاستییە زانستییەکان بدۆزنەوەو وایان لێ بکات ئەم بیرو ڕایەی ئێستایان بگۆڕێتو گاڵتەیان پێ بێت بەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە لەسەری دەڕۆین لەوەدا کە تەنها لەفەلسەفەیەکی دیاریکراو یان بۆچوونێکی تایبەتەوە دەڕوانین بۆ بوونەوەر(کەون). ئەم ڕووداوەش هەندێ لەزانایانی ئێستا بەشێوەی پراکتیکی تووشی سەر سوڕمانکردووە سەبارەت

بـەگرنگی هێـزە دەروونییـەکان لەسـەر بنـەمای ئـەو روونکردنەوانـەی کـە دەرکـەوتووە لەدیاردە سەرسوڕهێنەرەکان کەیاسای شـەپۆلەکان نایانگرێتـەوەو بەسـەریاندا ناچەسـپێت، هەروەك لەمەولا باسی لێوە دەکەین، دەبێ ئەوەش بـزانین لەوانەیـە زانایـان لـەو توانایـەدا بـن (زووبێـت یـان درەنـگ) زاڵبن بەسـەر ئـەم مەسـەلە پـڕ گـرێو گۆڵـەداو جیهانێکی تـر بدۆزنەوە لەبوونەوەردا جیاواز بێت لەجیهانی شەپۆلەکان!..

بەهـەر حـاڵ پێویـستە ئامـادەبین بـۆ ڕوانـین لەهـەر بـیرو بۆچـوونێکی نـوێ بەچـاوی لایەنگیرییەوە. چونکە ئەوە ئەو ڕێگایەیە کە دەمانگەیەنێتە راستییەکان هەرچـەندە لـەو ڕێگایەدا زۆرمان پـێ بـچێتو وەختێکـی زۆری بوێـت. بـەڵام دەمـارگیریو لـەخۆبایی بـوون زانیاریمان پێ نابەخشێتو نامان گەیەنێتە هیچ ئـەنجامێك تـەنها ئـەوە نـەبێت گومڕامـان دەکات وەك گومڕاییەکانی نەزانو سەرەتاییەکان.

١٠. زۆربەی نوسەران لەوەدا بەهەڵەدا دەچن کە ئەو گووتەیە دەدەنە پاڵ (ئەنیـشتاین) کە دەڵێ: کات دووری چوارەمی شوێنە. لەڕاستیدا (ئەنیشتاین) ئەمەی نـەووتووە هـەروەك لەدوایـدا ئەمــەمان بینــی. چـونکە کـات لەپێناسـەی (ئەنیـشتاین)دا بریتییـە لـەدووری چــوارەمی (شــوێنکات) کــە ئــەوە پێکهــاتووە لەبەیەکگەیــشتنی (کــات)و (شــوێن) بەیەکگەیشتنێکی تەواوەتیو جیابوونەوە قبوڵ ناکات.

ئـەم (کـات)ە لەبیردۆزەکـەی (ئەنیـشتاین)دا لەوانەیـە هاوشـێوەی تێگەیـشتنی چـەمکی ((شتێك لـە خـودی خـۆدا))بێـت لەفەلـسەفەی (کـات)دا یـان تێگەیـشتنی چـەمکی ((بـوونی پێویست)) یان ((خوا)) لای زانایانی رەوانشوناسی لەئیسلامدا.

١١. بەهـەرحاڵ ئـەم ئاسـانکاریو سـادەکردنەوەیە زیـان دەگەیـەنێت بـە بیردۆزەکـەی (ئەنیشتاین)و بگرە دەیشێوێنێت، من داواکارم ئەوانەی بەهەڵە تێگەیـشتوون لـەم بـیردۆزە بەتێگەیشتنێکی بیرکاریانە، ئەوا لێم ببوورن بـۆ ئـەم ئاسـانکارییە نادروسـتە لـەم بـوارەدا. لەوانەیـە بتـوانین لەبەشـی داهـاتوودا لـەبارەی بیردۆزەکـەی (ئەنیـشتاین)ەوە توێژینـەوە ئەنجام بدەین بەشێوەیەکی وردترو گونجاوتر.

١٢. بڕوانە: ولیم سرجیوس، القوی الخفیه، ص٥ ومابعدها.

١٣. ئــەم دیاردەیــە یەکێکــە لــەدیاردەکانی دوو فــاقی کەســایەتی (دوو ڕوویــی) لەوڵاتەکەماندا هەروەك لای خوێنەری هێژا شاراوە نییە.

١٤. بڕوانە: .Toynbee, Astudy of history, vol.٢.

١٥. لەمەدا (ئیخوان صەفا)و (غەزالی)و (ئیبن خەلدون)و ئەوانە تریش وای بۆ دەچن کە جیاوازییەکی جەوهەری نیە لەنێوان ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەر هێنای و ئەو سەرسوڕمانەی (عاجبایەتیە)ی کە ساحیر پێی هەڵدەستێت، چونکە هەردوو حاڵەتەکە لەدیدی ئەم بیرمەندانەوە سەرچاوەی تەنها (دەروونی مرۆڤایەتیە)، ئەگەر هاتوو (دەروون) بەخشندەو چاکە خوازبوو دەکرێ خاوەنەکەشی پێغەمبەر یان پیاو چاکێك بێت، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو دەروونە شەڕخوازو خراپ بوو دەکرێ خاوەنەکشی کاهینێك بێت یان ساحیر بێت...

١٦. لەبەشی داهاتوودا دێینە سەرباسی لۆژیکی کۆن و دەبینین کە چۆن ئەم لۆژیکە بووە بە ڕێگر لەبەردەم ناسین و زانیاری پەیداکردن لەسەر ئەم هێزانەو سوود لێوەرگرتنیان.

١٧. بڕوانە: .Rhine, The Reach of Mind

١٨. ئەگەر ئەوانە بینیان کەسێك شکستی خواردووە لەژیانیدا ئەوا یەکسەر پێی دەڵێن ئەوە بیرکردنەوەکانی باش نەبووە هەرچەندە ئەو کەسە ڕۆشتووە بەرەو پیری کارەکانی لەسەر بیرکردنەوەیەکی ڕاست و ئارەزوومەند بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی حەتمی. بەڵام ئەم بیرو ڕایە بیرو ڕای ئەو دەروێشانەمان بەبیردێنێتەوە کە چارەسەری نەخۆشەکان دەکەن بە (ئیمان) بەڵام ئەگەر هاتوو نەخۆشەکە چاك نەبوویەوە ئەوا لەبارەیەوە دەڵێن:- ئیمانەکەی لاوازە، نەخۆشەکەش ناتوانێت بەرپەرچیان بداتەوە.

١٩. زاراوەی (عەقڵی ناوەوە) نوسەری ناسراوی میسری بەناوبانگ (سلامە موسی) هێنایە ناو عەرەبییەوە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو شانازیە گەورەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم نوسەرە بەڕێزە لەبەر ئەو بڵاوبوونەوە گەورەو فراوانەی کە بەدەستی هێنا. بەڵام لەم دواییانەدا هەر ئەم نوسەرە ناوێکی تری دۆزیەوە بۆ ئەم زاراوەو ناوی دەبات بە زاراوەی (عەقڵی شاراوە) لەجیاتی (عەقڵی ناوەوە) لەسەر ئەو ئیعتیبارەی کە سیفەتی بوونەوەرو هاندان و هەوڵی دەرکەوتنی تیایە. بەڵام ئێمە لێرەدا حەزدەکەین هەر لەسەر زاراوە کۆنەکە بمێنینەوە لەبەر چەند هۆیەکی دیاریکراو کە دەکرێ خوێنەری بەڕێز چاو بەهەندێکیاندا بخشێنێت لەوانەی وا لەمەولا دەیانخەینە پێش چاو.

بەڵام زاراوەی (نەست) کە لەم دواییانەدا شوێنی زاراوەی (عەقڵی ناوەوە)ی گرتەوە بریتییە لەوەرگێڕانی حەرفی (Unconcious) لەزمانی ئینگلیزیدا، ئێمەش جاروبار پەنا دەبەینە بەر بەکارهێنانی لەجیاتی ئەوەی کە زاراوەی (عەقڵی ناوەوە) بەکاربێنین ئەمەش لەبەر ئاسانیو سادەیی بەکارهێنانی.

٢٠. دەردەکەوێت کە (فرۆید) لەسەر دووپاتکردنەوەکانی بە هۆکاری سێکسی ئەو پێداگیریو دووپاتکردنەوە تووندڕەوەییە کە بەهۆی چوارچێوە کۆمەڵایەتیەکەی دەوروبەریەوە کاریگەری لەسەر دروست بووە یان بەشێوەیەکی تر: (چوارچێوە کۆمەڵایەتیەکەی کە ئەوی تیا ژیاوە بوونەتە هۆی دروستکردنی ئەو کاریگەریە تووندڕەوییەی بەرامبەر بە هۆکارە سێکسییەکان دەری بڕیوە). وەك دەبینین لە(ڤییەنا) پێش جەنگی جیهانی یەکەم رۆژێك بوو کە ژنانی چینە خانەدانە ئەرستۆکراتییەکان زۆر تێرو پۆشتەو پەرداخ بوون لەڕووی گوزەرانو خواردنو خۆراکەوە بەڵام تابڵێی برسی بون لەلایەنە سێکسییەکانەوە بە جۆرێك کە لەئەنجامی ئەو برسێتیە سێکسییەدا گیرۆدە بووبوون بە چەند نەخۆشیەکی دەروونی جیاواز، لەبەرئەوە دەرگا ئاوەڵابوو بۆ (فرۆید)ی هاوڕێمان کە چارەسەری ژمارەیەکی زۆر لەو برسیە سێکسیانە بکاتو پەیوەندیان پێوە بکاتو خەونەکانیان بۆ شیتەڵ بکاتەوەو تێیان بگەیەنێت کە هۆکاری سێکسی ئەو هۆکارەیە کە لەقوڵایی نەستەوە هەڵدەقوڵێتو رووبەڕووی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ دەبێتەوەو رەنگدەداتەوە لەژیانیدا. هەرچەندە (فرۆید) لەنێو خێڵەکییەکاندا ژیاوە بۆ نموونە، لەوانەیە وێناکردنی (نەست) لای ئەو پێکهاتبێت لەخۆشەویستی بۆ هێزو ناوبانگ پەیداکردن پاش ئەوەی کە لەبنەڕەتدا خۆی (ئارەزووبازی سێکسی)بووە. هەروەها لەوانەیە ئەو قسەیەش راست بێت کە دەڵێ(عەقڵی ناوەوە) پێکهاتووە لەهەر ئارەزوویەکی سەرکوتکراو جائیتر ئەو ئارەزووە سێکی بێت یان هەر ئارەزوویەکی تر بێت، ئەو شتەشی کە وا دەکات (عەقڵی ناوەوە) جیاوازبێت لەنێوان وڵاتانو ژینگەکاندا ئەوە کۆمەڵگایە بەو کارە هەڵدەسێتو دابوتەریتو ئاکارەکان دەبڕێت بەسەر رۆڵەکانیداو کۆتو بەندیان بۆ دادەنێت.

٢١. زۆربەی سۆفیو متەسەوفەكان لەكاروكردەوەكانیاندا ئەوە بەرجەستە دەكەن كە گوێیە (خوا) تواوەتەوە لەناویاندا یان ئەوانو خواكەیان هەردووكیان بوونەتە یەكو یەكتن. مەنسوری حەللاج دەڵێ:-

((هیچ لەكەوڵەكەمدا نییە تەنها خوا نەبێت)) بۆیە لەئەنجامی ئەو گوتەیەدا كوشتیان. هەروەها (بەستامی) دەڵێ:- ((من خوای بەرزو باڵام))... ((پەروەردگارم ناگا بە پلەوپایەی مندا لەگەورەییدا))..((من ویستم زیارەتی ماڵی خوا بكەم بەدەوریدا بسوڕێمەوە بەڵام كە گەیشتمە ئەوێ بینیم ماڵی خوا زیارەتی من دەكاتو دەسوڕێتەوە بەدەورمدا))... هەر لەم بارەیەوە (تستەری) دەڵێت:- ((من عەرشی خواوەندم)).

هەروەها (عگار) زۆر بەڕاشكاوانە دەڵێ:- ((من خوام. من خوام)). هەروەها دیسان (نیبنولفارج) دەڵێ:- ((من خۆشەویستەكەمەو خۆشەویستەكەشم منە)) بەمەش مەبەستی لەوەیە كە ئەو خۆی خوایەو خواش ئەوە.

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت زۆرینەی سۆفیو متەصەوفەكان لەسەر دەربڕینو گۆشە نیگاكانیان بۆ خواوەند كۆكو تەبان بەڵام حەزناكەن دەریخەن بۆ جەماوەر بۆنەوەی ئەو دژینە رواڵەتییەی لەقسەكانیاندا دەردەكەوێت نەچێتە نێو تێگەیشتنە ئاینییەكەیانەوە.

٢٢. بوونی ئەو دوو جۆرە دژینەیە لەهێزەكان لە(عەقڵی ناوەوە)دا دەبێتە هۆی ئەو تەكینەوەیەمان لەمامۆستا (سلامە موسی) لەناونانەكەیدا بۆ (عەقڵی شاراوە). ئەوەش بەدیدەكرێت كە (سلامە موسی) باوەڕی نییە بە هێزە دەروونیە نائاساییەكان بۆیە نایبینێتەوە لە(عەقڵی ناوەوە)دا جگە لەو ئارەزووە سەركوتكراوو گرێ شاراوانە نەبێت كە لەهەوڵی دەركەوتنندان لەسەر چینی هەستیاریو هۆشیاری بە زۆر شێوەو شێواز.

٢٣. Tyrrell, op . cit . p.٢٦.

٢٤. یەكێ لەشاعیرە كۆنەكان ووتوویە:- ((ئەوەی مەرتەبەو مەقامی بەرزبێت رقو كینە هەڵناگرێت)) ئەوەی بە ئاشكرا دەردەكەوێت ئەوەیە: ئەو كەسەی رقو كینەو بوغز هەڵدەگرێت لەخۆیدا پێش هەموو كەسێك زیان بە خۆی دەگەیەنێت تا زیان بەكەسانی تر بگەیەنێت، ئەو كارەشی دەبێتە رێگر لەبەردەم سەركەوتنیداو هەموو ئەو هێزە هاندەرە داهێنەرانە لەخۆیدا سەركوت دەكات كە لەعەقڵی ناوەوەیدا هەڵدەقوڵێنو دەیانەوێت بێنە دەرەوە.

بەشی یەكەم

# چوارچێوەی فیكری

وەك لەمەوپێش ئاماژەمان پێدا مرۆڤ وا راهاتووە تەماشای گەردوونو بونـەوەر بكـاتو لەچوارچـێوەی فیكـرەوە بـواری ڕوانینـەكانی دیـاری بكـات، بۆیـە بـە لایـەوە سـەیرە یـان سەرپێچی هەر شتێك دەكات كە لەو چوارچێوەیەدا نـەیبینێت، بـەم مانایـە مـرۆڤ دەبێتـە ئەو ئەسپەی عەرەبانە ڕادەكێشێتو تەنها بەردەمی خۆی دەبینێت چونكە لەسەر هـەردوو چـاوی دوو پارچـە قـایش دادەنرێـتو ڕێگـیری ئـەوەی لێ دەكـات بـەملاولادا چـاوبگێڕێو هەمیـشە دەبـێ ئاگـای لەبـەردەمی خـۆی بێـت.هـەروەها ئـەوەشمان وت كـە لێـرەدا هـیچ جیاوازییــەكی بنــچینەیی نیــە لــەنێوان خوێنــدەوارەكانو نەخوێندەوارەكانــدا لــەم تایبەتمەندێتییەدا. بەڵكو جیاوازی – ئەگـەر هـەبێت- ئـەوا جیـاوازی لـە((پلـە))دایـە نـەك لە((جۆر))دا.

پرۆفیسۆر (ولیـەم باریـت) دەڵێـت: (ئەدیـسۆن) كاتـێ گرامـەفۆنی داهێنـاو بۆیەكـەمجار لەئەكادیمیای زانستی لەپاریس پیشانیداو لەوكاتەدا هەموو زانایانی ئامادەبوو لێیانكرد بـە هـەڵلاو دەیـانگوت زۆر ئەسـتەمە دەنگـی مـرۆڤ لەسـەر شـریتێكی كـانزایی (پەپكەیـەكی كانزایی) تۆماربكرێت بەو شێوەیە. بەڵكو لەو كاتەدا بەوە تۆمەتباریاندەكرد گوایە ئـەوەی لەگرامەفۆنەكـە دا قـسە دەكـات پیاوێكـە لـەژێر مێزەكەدایـەو خـۆی حەشـارداوە بـۆ چاوبەستكردنو هەڵخەڵەتاندنی ئامادەبووان. هەروەها تووشی هـەمان هەڵوێـست بوویـەوە پرۆفیـسۆرێكی تـر بـەناوی (تیـت) لـەزانكۆی (ئەدنبـەرە) لەكاتێكـدا هـەواڵی داهێنـانی

تەلەفۆنی بیست، بۆیە وتی: ((حاڵەتێکی لەو جۆرە زرنگانەوەیە، چونکە داهێنانی شتێکی لەم جۆرە کارێکی فیزیایی ئەستەمە))[1].

لەو چیرۆکە بەچێژانەی لەم بارەیەوە بۆمان دەگێڕنەوە ئەو دۆزینەوەیەیە کە (مسمر) دۆزیەوە بەڕێگە ناسراوەکەی لەخەواندنی موگناتیسدا (هیپنۆتیزم) لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمدا ئەو هۆشانەی بەئاگاهێنایەوە بۆ گرنگی ئیحا ئەوەی چارەسەری هەندێ نەخۆشیدا کەچی زانایان بەگاڵتەجاڕیو لاقرتێیەوە پێشوازیان لێکردو ئازاریان دەدا، تەنانەت یەکێ لەرۆژنامە ئینگلیزییەکان لەوکاتەدا وەسفی کرد بە وەسفکردنێکی گاڵتەجاڕی پزیشکی وەك ئەم وەسفەی خوارەوە:

((شکاندنی خەواندنی موگناتیسی: چوار هۆقە لەڕۆنی ترسولەرزو دوو ڕەتڵ لەرۆحی خەیاڵ تێکەڵکەو بیانخەرە بۆتەی ئەنێشەوەو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك وازی لێ بێنەو پاشان هەموو بەیانییەك چل قەترەی لێ بخۆرەوە بەرەو چاکبوونەوە دەچیو هەموو ئێشكو ئازارێك دەپەڕێنی))[2].

دەکرێ بڵێین هەموو داهێنانێك لەزانستدا بەگاڵتەجاڕییەوە پێشوازی لێکراوە لەلایەن خوێندەواران و نەخوێندەوارانیشەوە. مێژووش پڕیەتی لەچیرۆکی ئەو زاناو داهێنەرو دۆزەرەوانەی وا تووشی چەوسانەوەو سوتانو سوکایەتیو بوغزاندن دەبوون هەر لەبەرئەوەی شتێکی تازەو نوێیان هێناوەتە ئاراوە بۆ خزمەتی پەرەپێدانی زانستیو کۆمەڵایەتی.

لێرەدا پێویستە جیاوازی بکەین لەنێوان خوێندەوارو ڕۆشنبیردا، خوێندەوار ئەو کەسەیە چەند شتێك فێربووە کە لەچوارچێوەی فیکری دەرناچێتو لەسەری ڕاهاتووە هەر لەمنداڵییەوەو دەستبەرداری نابێت بە هیچ کلۆجێك. بۆیە هیچ زیادناکات لەزانین تەنها ئەوە نەبێت لەدەمارگیریدا زیادیکردووە لەبواری بینینیشدا تەنگی پێ هەڵچنراوەو بڕوای هێناوە بە بۆچوونێك لەبۆچوونەکان یان بیروباوەڕێك لەبیروباوەڕەکانو دەڕوات لەدوای ئەو زانیارییانەی کە پەسەندی دەکات لەدیدی خۆیداو لەپێناویدا خەبات دەکات. بەڵام ڕۆشنبیر جیادەکرێتەوە بە نەرمونیانی ڕاوبۆچوونیو ئامادەباشی بۆ وەرگرتنی هەموو بیرۆکەیەکی نوێو تێڕامان تێیداو وەرگرتنی ڕووە ڕاستەکان لێوەی.

 

ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە ژمارەی رۆشنبیرانمان كەمن و ژمارەی خوێندەوارانمان زۆرن. هەروەها خوێندەوارەكانمان لەخۆیان بایی بوون و پێوەی دەنازن لەڕادەبەدەرو بە ئاستێكی زیاد لەپێویست. هەر ئەمەشە وایان لێ دەكات كە هیچ كەسێكیان نەتوانێت ڕای بەرامبەری وەرگرێت كە پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی ئەو بێت.

دەڵێن ئەو پێوانەیەی كە رۆشنبیری كەسێكی پێ دەپێورێت هێندەی ئەو برە نییە كە ئەو كەسە تەحەمولی دەكات لەو بۆچوونانەی كە پێچەوانەی بۆچوونەكانی خۆیەتی، دەشێ رۆشنبیری راستەقینە دڵنیانەبێت لەڕاستی بیروباوەڕی خۆی، ئەویش لەبەرئەوەی ئەو پێوەرەی پێوانەی راست و دروستی بیروڕاكانی دەكات جێگیرنییە بەڵایەوەو لەگۆڕاندایە لەكاتێكەوە بۆ كاتێكی تر.

زۆرجار خۆی وا دەبنێتەوە كە قەناعەتی هێناوە بە راوبۆچوونێكی دیاریكراو رۆژێك لەرۆژان پاشان ئەوەندەی بەسەردا ناچێت قەناعەت و دڵنیایی بەرەو لاوازبوون دەچێت بەو بیروڕایە... بگرە هەندێجار بەڕوویدا هەڵدەگەڕێتەوەو لەدژی ڕادەوەستێت.

گەر بتەوێت لێكۆڵینەوەیەك بكەیت لەبارەی پەرەپێدانی بیروبۆچوونی جەماوەری خوێندەوارانەوە لەنێوان كاتێك و كاتێكی تردا ئەوا توشی سەرسوڕمان دەبیت. لەوانەیە ئەمڕۆ بیانبینیت خۆیان تەرخانكردووە بۆ بیرۆكەیەك و پاشان ڕێزی دەگرن و دەیپەرستن لەبەیانیدا، بێت و گەر پرسیاری ئەم ئاوەژووبوونەوە كوتوپڕیەیان لێ بكەیت لەوەڵامدا دەڵێن: ((ئێمە بەدوای راستیدا دەگەڕاین و لەئاكامدا دۆزیمانەوە)). لەوانەیە پاش ماوەیەكی تر جا -كورت بێت یان درێژ- بچنە سەر بیرۆكەیەكی ترو بیپەرستن و لەهەموو قۆناغ و هەنگاوەكانیشیاندا باوەڕی چەسپاویان هەیە بەوەی كە گەیشتونەتە ڕاستی یەكجارەكی و لێی لانادەن هەرگیز.



ئەو چوارچێوە فیكرییەی مرۆڤ لێوەی دەڕوانێت بۆ بوونەوەرو جیهان بەشە گەورەكانی پێكهاتووە لەزاراوەكان و دانراوەكان و گریمانەكان كە كۆمەڵگای پێ گۆشكراوەو چێنراوە لەقوڵایی عەقڵ و ئاوەزی شاراوەیدا.

هەروەها مرۆڤ کاری تێکراوە بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات. ئەو لەکاتێکدا دەڕوانێت بۆ دەوروبەرەکەی دەرك بەوە ناکات روانینو نیگاکانی کۆتکراوو سنوردارن.

بە هەموو دڵنیاییەکەوە ئەو ئازادە لەبیروبۆچوونی خۆی. ئا لێرەدایە مەترسییەکە، چونکە ئەو نابینێت کەسێك پێچەوانەی بۆچوونەکەی بێتو تەنانەت ئامادەیە خەباتی بۆ بکاتو خۆی بدات بەکوشت پارێزگاری لەدوژمنکاری دەکات کە بکرێتە سەر ئەو بیروڕایەی.

ئەو لەکاتێکدا پەلامارو دەستدرێژی دەکاتە سەر پێچەوانەی بیرو بۆچوونەکە خۆی ئەمە بە زوڵمو زۆر نازانێت لەبەرئەوەی ئەو باوەڕی هێناوە بەوەی کە ئەمە تێکۆشانە (جیهاد)ە لەپێناوی حەقیقەتو راستیداو بەگژداچوونەوەی درۆو دەلەسەیە.

زۆربەی چەوسانەوە وجەنگەکان کە مرۆڤ هەڵیگیرساندووە هەندێکیان لەدژی هەندێکی تریان لەپێناوی مەزهەبێك بووە لەمەزهەبە ئاینییەکان یان لەپێناوی ئەو سیاسەتە بەرهەمهاتووەدا بووە کە لەئەنجامی بوونی ئەم چوارچێوە نەستییەی سەر عەقڵی مرۆڤ هاتۆتەکایەوە.

جێگەی سەرسوڕمانە پیاوێك ببینین کەسێك بچەوسێنێتەوە لەپێناوی ئایینەکەیدا یان لەپێناوی بیروڕاکەیداو پاشان دەستبەجێ هەڵگەڕێتەوەو بداتە پاڵ ئەو لایەنەی کە دەیچەوساندەوەو بەرگری لێ بکات بەقەدەر ئەو چەوسانەوەیەی کە پێشتر ئەمی پێ دەچەوساندەوەو بیروڕای بگۆڕێتو پاشان تەنها یەك شتی تێدابمێنێتەوە کە گۆڕانی بەسەردا نەیەت ئەویش چوارچێوە فیکریەکەیەتی.

مرۆڤ ناتوانێت رزگاری بێت لەچوارچێوە فیکرییەکەی مەگەر بە دەگمەن نەبێت. چونکە ئەوە سەپاندنێکەو پێشخواردنەوەی پێ ناوێت. چوارچێوە شتێکی حەشاردراوە لەنەستدا هەروەك جاروبار چاوی پیادەخشێنین. مرۆڤیش ناتوانێت دەربازبێت لەشتێك کە هەستی پێ نەکات.

لەوانەیە چەند کەسانێکی کەمو دەگمەن هەبن لەناو خەڵکدا بتوانن هەست بەو چوارچێوەیە بکەن کە عەقڵیانی لەسەر بەڕێوەدەڕوات، ئەو جۆرە کەسانە لەبیرکردنەوەیاندا لایەنگری ئەوە دەکەن جا زۆربێت یان کەم بەڵام لەهەمانکاتیشدا دەرك بەوە دەکەن کە خۆیان لایەنگری ئەوەیانکردووە. لەبەرئەوەی ئەو جۆرە کەسانە دەرونیان

خاڵییە لەرقوكینەو بوونەتە ئەو كەسانەی كە دەتوانن دۆزینەوەی زانستی ئەنجامبدەنو جاروبار لەسەر دەستیشیاندا زۆر لەو داهێنانو بیردۆزە نوێیانە دەردەكەون.

پێشبینیكردن یان داهێنان ئەو —وەك دێینە سەری- رێكخستنەیە لەنێوان دوو شتی كۆندا. لەبەر ئەم هۆیە زەحمەتە رایەك لەرایەكان یان رێگایەك لەرێگاكان بتوانێت داهێنان یان پێشبینیو نوێكردنەوە ئەنجامبدات. لەبەر ئەم هۆیە دووبارە وتاری وتاربێژە تەقلیدییەكانو توێژینەوەكانیان بەزۆری خاڵییە لەهەموو جوانكاریو داهێنانو بیرۆكەیەكی نوێ، ئەوان هەر قەوانە كۆنەكەی پێشوو لێ دەدەنەوە بە هەمانماناو بەڵام بەدەربڕینێكی نوێ.

توێژەرەوەی (لێكۆڵەر)ی داهێنەر جیادەكرێتەوە لەپیاوی سادەو ئاسایی بەوەی كە بڕوای هێناوە بە چوارچێوە فیكرییەكەی خۆی، بۆیە دەتوانێت رووبەڕووی راستییەكی نوێ ببێتەوە جگە لەوەی خۆی.

سەیرە خەڵكانێك هەن ئینكاری بوونی ئەو چوارچێوەیە دەكەن لەسەر عەقڵیان، بۆیە بەم كارەیان دەیسەلمێنن كە دەمارگیرییەكی زۆر توندیان هەیە. ((مرۆڤ هەرچەندە بیروباوەڕی بەهێزبێتو وابزانێت ئازادە لەبیروبۆچوونی خۆیدا ئەوا بڕواشی زیاتر دەبێت بەو پەرستنە فیكرییەی خۆی)).

(ولیەم جیمس) فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەمریكی لەو بڕوایەدابوو كە عەقڵی مرۆڤایەتی ((بەش بەشو لایەنگرە لەسروشتی خۆیدا)) [٣] بۆیە ئەم فەیلەسوفە وای دەبینێت كە عەقڵ ناتوانێت لەسەر بیرو بۆچوونێكی بەرهەم هێن بێت تەنها ئەگەر لەدیدی خۆیدا جوزئی بێتو لەئاراستەشدا لایەنگربێت. لەبەرئەوەی حەقیقەتی دەرەكی لەبۆچوونی ئەودا زۆرلایەنو بەشو پێكهاتەی جیاجیا لەخۆ دەگرێت. گەربێتو عەقڵ هەموو هۆشو ئاگایەكی خۆی چڕنەكاتەوە لەلایەنێكداو دەستبەرداری لایەنەكانی تر نەبێت ئەوا زەحمەتە بگات بەبیرۆكەیەكی كردەیی روونو ئاشكرا.

(جیمس) دەڵێت: عەقڵ ناتوانێت خاوەن هێزو ئیرادە بێت تەنها بەوە نەبێت خۆی تەرخانكات بۆ ئەو شتەی كە دەیەوێت ئاگای لێی بێتو جگە لەوەش ئەوانی تر وەلاوە نێت، یان ئەگەر وانەبێت ئەوا گۆشە نیگاكانی بەرتەسكو تەنگەبەر دەبن بەوەی كە هێزەكەی دابەش دەبێتو ئەو كاتە بەلاوازی دەمێنێتەوە لەبیرو بۆچونیدا[٤].

ـەر ئـەم بۆچـوونەی (جـيمس) نموونەيـەکی سـادە دێنينـەوە: وای دادەنـێين ـێـاندانێکی گەورە سازدراوە لە(شەقامی رەشيد)لەبەغداو بەجۆرێك وەك دەڵێن کلکی ـێ تيا دەپچڕێتو ژنو پياو هەمووی ڕژاون بە مل يەکداو هاتوهاوارو هوتاف کێشانيش ـێ هەور بەری ئاسمانی داپۆشيوە. دووبارە گريمان هەندێکی تر لەتەماشاچيان بە خوێن ـرخيیەوە راوەستاون لەسـەر بالەکۆنـەو بـەر پەنجـەرەکانی ماڵەکانيانـداو چاودێری ئـەم ـێرند کۆمەڵايەتييە دەکەن.

ئەم ڕووداوە بەنيسبەت ئەمانەوە حەقيقـەتێکی دەرەکييـە، بـەڵام لەديـدی هەموويانـدا ـەها حەقيقەتێك نييـە، چونکە هـەر يـەکێك لەوانـە هۆشو ئاگـای خـۆی خستۆتە سـەر ـێك لەبەشەکانی ئەو خۆپيشاندانەو وەك بڵێی بەشەکانی تـری واز لێ هێنابێت. پاشان ـەانە وازيانهێنا لەتەماشاکردنو سەيرکردنی ئەو خۆپيـشاندانەو هەريەکـەو چوو بـەدەم ـری خۆيەوە. گەر بێتو تۆ لەهـەر يـەکێکيان بپرسـيت سـەبارەت بـەوەی چی بينيـوە لـەو حۆپيشاندانەدا ئەوا بۆت دەردەکەوێت کە بينينو گەواهيدانی هەر يەکەيان جياوازە لەهی ـەوەکەی تريان جا ئيتر کەم بێت يان زۆر ئەو جياوازييە.

بۆ نموونە دەبينيت ئەوەيان گەنجێکـەو سـەرنجی چووە بـەلای جوانیو ئارايشتی ئـەو کچانەی کە بەشداريان لەو خۆپيشاندانەدا کردووە، لەبەر ئەوە ئەم گەنجە هيچ شتێکی تر ـبينێت سـەرنجی ڕاکێـشێت لـەم خۆپيـشاندانەدا تـەنها لايەنـە سێکسييەکە (جنـسی)ەکە ـەبێت، بەشێوەيەك دەبينيت دڵە کوتەيەتی بـۆ کـچێكو خەريکە شـێت ئـەبێ بـۆیو پێـی عەيب نەبێت دەپەڕێتە کۆڵی (پەنا بەخوا). لەو لاشەوە ئـەو ئافرەتـە دەبينيـت کـە لەبـەر پەنجەرەکەيدا وەستابوو تەماشای دەکرد تەنها هيواو ئاواتی هيچی تر نـەبوو ئـەوە نـەبێت کـە ورد دەبوويـــەوەو ڕادەمـــا لـــەجلو بـــەرگی هـــاوڕێو دۆســـتو ناســـياوەکانی لـــەو خۆپيشاندانەداو هەر ئاگای لەوەبوو بزانێت کـە جلوبـەرگی کاميـان لەسـەر ئـاخر مۆديلـەو تـەنوورەی کاميـان زۆر جـوان دوراوە. ئـەوەش پيـاوێکی تـرەو سـەيری دەکـەيت يەکێکـە لەپياوانی سياسەتمەداری ناوخۆيیو هەموو بيرو هۆشی لانەماوە تـەنها ئـەوە نـەبێت واقـی وڕماوە بە ديار خۆپيشاندانەکەوەو هەر لەبيری ئەوەدايە بەڵکو کاريگەرييەکی وای هەبێت ئەو خۆپيشاندانە سا ئەمـە خوايـە کـە ببێـت بـە هـۆی ڕووخانـدنی وەزارەتو يـەکێکی تـر

دابنێن لەجێی وەزیرەکەی‌و کێ ناڵێ نسیبی ئەمی تێ ناکەوێت‌و بچێتە ئەو پۆستەوە بەخەیاڵی خۆی...

ئەوەش ئەدیبێکی داهێنەرو بەتوانایەو گوێ دەگرێ بۆ وتارو هاتوهاوارو هوتافەکان‌و هیچ شتێك سەرنجی راناکێشێت‌و گرنگ نیە بەلایەوە تەنها ئەوە نەبێت خەریکی راستکردنەوەی هەڵە زمانەوانییەکان‌و نەحو صەرفییەکانە چونکە لەدیدو بۆچوونی ئەودا خۆپیشاندانەکە هیچی تر نییە تەنها شانۆگەرییەك نەبێت کە تێیدا ژیانی (سیبویە)و (نفطویة) نمایش دەکرێت... ئەوەش لاوێکی ترەو هەستی نیشتمان پەروەری بە ئاستێکە گەیشتۆتە ئەو پەڕی حەماسەت‌و هەست بە هیچ شتێك ناکات لەو خۆپیشاندانەدا تەنها کڵپەی ئاگر نەبێت کە لەهەناوی بەربووە.

ئەوەش دەبینی لەولاوە شاعیرێکەو ئیلهامی چەند شیعرێکی بۆ هاتووە بەهۆی خۆپیشاندانەکەوەو خەریکی نوسینەوەیەتی لەسەر لەپی دەستی‌و ئاگای لەمەحمودی بێ زەواڵ نیەو خوا خوایەتی ئیلهامە شیعرییەکەی لەبیرنەچێتەوەو ئیتر لەوەلا چی دەبێت بابێت.

ئەوەش یەکێکی ترە کابرایەکی پەیامنێری رۆژنامەنوسییەوە هیچ لەبارەی خۆپیشاندانەکەوە نازانێت تەنها ژمارەی ئەو بریندارو کوژراوانە نەبێت کە لەناودەست‌و پێی خۆپیشاندەراندا کەوتون‌و پلیشاونەتەوە یان ژمارەی ئەو گەنجینەو مەخزەنانەی وا هەمووی تاڵانکران‌و شوشەی پەنجەرەکانی بەساغی نەماو شکان‌و هاڕمیانکردە خوارەوە. جگە لەمانەش ئەوانە دەبینین کە خاوەنی دووکان‌و بازاڕی گەورەن‌و کۆگای گەورە گەورەیان هەیەو چاودێریی بەڕێوەچوونی خۆپیشاندانەکە دەکەن‌و هەردوو دەستیان لەسەر دڵیان داناوەو نازانن ئاخۆ کەی (زوو یا درەنگ) ماڵ‌و سەروەت‌و شتومەکەکانیان تاڵاندەکرێت - فەرهود دەکرێت - لەلایەن ئەو کەسە نیشتمان پەروەرو دڵسۆزە حەماس گرتووانەوە.

پوختەی ئەم حاڵەتە: هەریەکێك بگری لەو هاندەرو تەماشاچیانەی ئەو خۆپیشاندانە دەبینی لەڕوویەکی دیاریکراوەوە دەڕوانێتە خۆپیشاندانەکەو لایەنەکانی تری ناو خۆپیشاندانەکە فەرامۆش دەکات یان هەر یەکێك لەوانە لەچوارچێوەی گۆشەنیگای تایبەتی خۆیەوە بۆی دەڕوانێت‌و هەروەها لەوانەیە هیچ شتێکی تێدا نەبینێت جگە تەنها

لەتیشکۆی ئەو چوارچێوەیە نەبێت –ئەو ئافرەتەی یان ئەو ژنەی هەموو هۆش و گۆشی خۆی خستۆتە سەر شێوەی دووربینی تەنورەکان رقی لەو ئەدیب و نوسەرە دەبێتەوە کە خەریکە بەڕاستکردنەوەی هەڵە زمانەوانییەکان و پێی پێ دەکەنێت.

چونکە ئەو ژنە دەیەوێ ئاگای لەهەڵەکانی درومانکاری بێت و کابرای ئەدیبیش ئەیەوێت وێنەی هەڵەکانی فاعیل و مفعولی بگرێت و ڕاستیانکاتەوە. ئەمە وەك ئەوە وایە ژنەکە لەدۆڵێکدابێت و ئەدیب و نوسەرەکەش لەدۆڵێکی تردا. هەروەها کابرای نیشتمان پەرومرو جۆشوخرۆش هەستاو پێکەنینی دێت بە کابرای سیاسەتمەداری بێ هەڵوێست و دوورِوو، چونکە کابرای سیاسەتمەدار ئەیەوێت ببێت بە وەزیرو ئەمی تریش ئەیەوێت ئەمری باوباپیرانی سەر لەنوێ زیندووکاتەوەو سەردەمی هارونە رەشید بگەڕێنێتەوە بۆ (شەقامی رەشید).

لەواقیعدا هەر مرۆڤێك دنیا بەڕەنگێك دەبینێت کە لەدەروونی خۆیدایەو هەموو شتەکانیش بەو پێوانەیەی خۆی دەپێوێت کە لەسەری گەورە بووەو گەشەی کردووە.

ئەم نموونەیەی کە باسمانکرد لەبارەی ئەم خۆپیشاندانەوە لەوانەیە بچەسپێت بەسەر زۆربەی ڕووداوە دەرونیەکاندا ئەو ڕووداوانەی کە هەموو ڕۆژێك هەموومان بەرەوڕوویان دەبینەوە. یەکێك لەهاوڕێکانت دەخوێنێتەوە زۆر پێی سەرسام دەبێت و بە حەماسەوە بۆت باس دەکات و تۆش وات لێدێت کتێبەکەی لێ وەرگریت و بیخوێنیتەوە بەلام پاش خوێندنەوە تەماشا دەکەیت ئەو جۆرە پیاهەڵدان و حەماسەتە هەڵناگرێت کە ئەو بۆی گێڕایتەوەو لەوانەیە بە پێچەوانەوە تۆ زیاد لەپێویست باسی بێتامی و ناخۆشی و پڕوپوچی ئەو کتێبەت لادروست بووبێت. پاشان ئەم کتێبەش دەبێتە هۆیەك لەهۆیەکانی ناکۆکی نێوان تۆو هاوڕێکەت: ئەو لەبارەیەوە دەڵێت کتێبێکی بەنرخ و گەورەیە، تۆش لەبارەیەوە دەڵێیت: هیچی تیا بەسەر نیەو پڕوپوچە. هۆکاری ئەم جیاوازییەش لەنێوانتاندا بە زۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆشەنیگایەی کە هەر یەکەتان کتێبەکەتان پێ خوێندۆتەوە. لەوانەیە هاوڕێکەت ڕاهاتبێت لەسەر چێژوەرگرتن لەو جۆرە دەربڕین و فۆنەتیك و ئاوازە تایبەتییەی ئەو شێوازە نوسینانە هەیەتی و کەچی تۆ لەم بارەیەوە هیچ چێژێك لەو کتێبە نابینیت و بەڵکو دەتەوێت کە ماناو بیروبۆچوونی تازەی تیا

بخوێنیتەوەو سودی لێ وەربگریت. لەبەرئەوە کتێبەکە لەدیدو بۆچوونی یەکێکتاندا باشەو لەدیدو بۆچوونی ئەویترتاندا خراپە.

جێگای سەرسوڕمان نییە کە خەڵکی جیاوازبن لەزەوق و ئارەزووەکانیاندا بۆ شتەکان بەڵام ئەوە جێگای سەرسوڕمانە کە بە ئازادی و زۆر راشکاوانە دەکەونە ناکۆکی و دووبەرەکی نانەوە لەپێناوی ئەم جیاوازیانەدا.

نموونەیەکی تر ئەوەیە: هاوڕێیەکت دەڕوا بۆ یەکێك لەسینەماکان و سەیری فلیمێك دەکات و پێی سەرسام دەبێت و سەرنجی رادەکێشێت بەڵام تۆ دەڕۆیت بۆ فلیمەکەو پاشان پێی سەرسام نابیت و سەرنجیشت راناکێشێت بەلای خۆیدا، لەوانەیە هۆکاری ئەمە ئەوەبێت کە: هاوڕێکەت ئەو رۆمان و بەسەرهاتە دڵداری و خۆشەویستیانەی بەلاوە خۆش بێت کەپڕن لەسۆزداری و شەرم و شکۆ دەرونیەکان و (مەکەو لاوەی خۆشەویستی) کەچی لەوانەیە تۆ حەزت لەو فیلمانەبێت کە زیاتر کۆمەڵایەتین یان بابەتی شەڕوشۆڕو پۆلیسین یان مێژوویین، وە هەر یەکەشتان لەو بڕوایەدایە کە خۆی باشترە لەهاوڕێکەی و بیروڕای خۆی پەسەندترە وەك لەوەی ئەو.

دوو گەنج لەسەر کچێك لێیان دەبێت بەکێشە: ئایا ئەو کچە جوانە یان نا؟ ئەم مشتومڕە لەنێوانیاندا کۆتایی دێت و کار دەگاتە شەق و زللەو تێهەڵدان و شەڕە بۆکس (بۆکسێن)، هەر یەکەیان خۆی بەڕاست دەزانێت و ئەویتریان دادەنێت بە زەوق مردوو یان بە نیەت پیس، بەڵام لەواقیعدا هەردووکیان هیچ و پوچ و بێ نرخن.

زەوق وەك دیدێکی عەقڵی چوارچێوەیەکی هەیە کە مەوداکەی دیاری دەکات و سنووری بۆ دادەنێت. بۆیە لەم بارەیەوە یەکێك لەتوێژەرەوەکان دەڵێت: هەر پیاوێك ئەو کچەی کە خۆشی دەوێت ئەوا ئەو کچە لەشێوەی دایکی دەچێت. چونکە مەلامحی دایکی دووبارە لەقوڵایی دەروونیدا چوارچێوەیەکی ناهەستی بۆ دروستکردووە بۆیە ناتوانێت چێژ لەجوانی وەرگرێت تەنها لەرێگای ئەوەوە نەبێت.

لەڕاستیدا من سەرسام دەبم کاتێك دەبینم خەڵك ناکۆکی و کێشە دەکەوێتە نێوانیانەوە لەسەر ئەم جۆرە حاڵەتانە بەبێ ئەوەی تەنها چرکەیەك راوەستان و هەڵوەستەیەك بکەن لەسەر ئەو کۆت و بەندە ناهەستیانەی خراوەتە سەر بینین و چێژەکانیان.

ئەوەش جێگای داخە دەبینم دادوەرەکان لەم بارەیەوە ئیعتباری بۆ دانانێن‌و گرنگی نادەن بەو لایەنەو گوێ لەو شایەتیدانە رادەگرن کە دەچێتە بەردەمیان لەوانەی وا ڕووداوێکی دیاریکراویان بینیوە هەر شایەتەو بە جۆرێکی جیاواز لەوی تر گەواهیەکەی پێشکەشدەکات، ئەوانیش واتە دادوەرەکان لەسەر جیاوازییەکی بچوك لەنێوان ئەو شایەتیانەدا سزا دەدات بە سەریاندا چونکە بێ ئاگان لەوەی کە نمایش کردنی ئەو شایەتیانەو چەسپاندنیان هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان کارێکی ناسروشتی‌و نائاساییەو لەوانەشە بەڵگە بێت لەسەر جیاوازی‌و درۆکردن. چونکە هەر شاهیدێك ڕووداوەکەی بینیوە ئەوا لەڕوویەکەوە بینیویەتی کە ئەوی تر لەو ڕووەوە نەیبینیوە مەگەر زۆر بەدەگمەن.

بۆیە هەرچەندە شایەتیەك دەبینین لەسەر ناکۆکی نێوان دوو کەس ئەوا یەکسەر دەستدرێژی لایەکیان دەدەیەن بەسەر لایەکەی تریانداو دەڵێین ئەوەیان ڕاستدەکات لەوەی کە دەیڵێت، لەگەڵ ئەوەشدا شایەتێکی تر دێت‌و دەستدرێژییەکە دەدەین بەسەر کەسی دووەمداو دەڵێین دووبارە ئەویش ڕاست دەکات. بەڵام هەریەکە لەو دووانە لەدیدگاو بۆچوونی سۆزداری‌و ئارەزوو پێوانەکاری ژێربێژی تایبەتی خۆیەوە دەڕوانێت بۆ ئەو مەسەلەیە، چونکە ئەو چاو دەپۆشێت لەو قسە سوك‌و ناڕەوایانەی دێت بەدەمی یەکێك لەدوو لایەنە ناکۆکەدا لەکاتێکدا دڵنیایە لەو وشەیەی کە ئەم بەکاری هێناوە سوکترە لەو وشەیەی لایەنەکەی تر هاتووە بەدەمیا. چونکەلەشایەتییەکەدا لایەنگری ئەوەی خۆیەتی‌و هیچ مەبەستێکی نەبووە یان هەستی نەکردووە بەم لایەن گرییە.

لەبارەی مێژوو نووسە پێشینەکانیشەوە نموونەی لەم جۆرە هەیە. بۆیە دەبینی یەکێ لەکەسایەتییە مێژووییەکان بووە بە خواوەندێك لەدیدو بۆچوونی هەندێکیانداو بەڕادەی پەرستن دەیپەرستن کەچی لەدیدو بۆچوونی هەندێکی تریاندا ئەو مێژوو نووسە دەبێتە کەسێکی فاسق‌و دووڕوویی بێ ئابڕووی سووك بەجۆرێك کە شایانی پیاهەڵدان‌و وەسفکردن نەبێت. لەبەر ئەوە هەر مێژوو نووسێك کاتێك ئەم هەواڵانە دەخوێنێتەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات لەبارەی ئەو کەسایەتیە مێژووییەوە ئەوا تیشکۆی دیدو ڕوانگەی خۆی دەخاتە سەر بەشێکی‌و بەشەکانی تری پشتگوێ دەخات.

ئەو كاتێك تێدەپەڕێت بەسەر ئەو هەواڵانەدا كە پێچەوانەی دیدو بۆچوونی خۆیەتی ئەوا دایدەنێت بەدرۆو وازی لێ دێنێت. ئەگەر پرسیاری لێ بكەیت لەبارەی هۆكاری ئەو وازلێهێنانو وەلاخستنەی هەندێ لەو هەواڵانە ئەوا لەوەڵامدا دەڵێت: چونكە ئەوانە ناشایستەو ناماقوڵن... ئەمەش بەو مانایە دێت كە (لەدەرەوەی چوارچێوە فیكرییەكەی ئەوایە). ئەو پێوەرەش كە پێوانەی جیاوازیی نێوان ماقوڵو ناماقوڵی پێ دەكرێت هەروەك لەمەوپێش باسمانكرد بریتییە لەپێوەری ((خودیو ڕێژەیی)). بەڵام هەندێ لەمێژونوسان (خوایان لێ رازیبێت) دایانناوە بە (رەهاو نەمر). لەبەرئەوە دەیانبینین كە تێنەگەیشتوون لەلێكۆڵینەوەی كەسایەتی مێژوییدا تەنها لەو لایەنەوە نەبێت كە خۆیان ویستویانەو ئارەزوویان لێ بووە.

بۆیە دەبینین جیاوازی لەنێوان بیریاراندا روویداوە هەر لەرۆژانی ئیغریقیە كۆنەكانەوە سەبارەت بە بابەتی بیرۆكە (فیكر)ی مرۆڤایەتی: ئایا فیكر حەقیقەتی دروستكردووە یان حەقیقەت ئەوی دروستكردووە؟ لەمەشدا بیریاران بوونەتە دوو گروپەوە: گروپێكیان ئەوانەن كە هەندێجار ناودەبرێن بە (ئەفلاتونییەكان) ئەمانە دەڵێن عەقڵی مرۆڤایەتی هیچ شتێكی تر نیە تەنها ئاوێنەیەك نەبێت بۆ حەقیقەت بەجۆرێك وێنەكەی پیشاندەداتەوە بەبێ گۆڕانكاریو شێواندن. بەڵام گروپەكەی تر ئارەزوویان لەپێچەوانەی ئەمانەو وای دەبینن كە حەقیقەت عەقڵی دروستكردووەو شتێك نییە لەدەرەوەی حەقیقەت ناوی عەقڵ بێت ئەوانەش كە دەركەوتن لەمەدا ناونران بە(سەفسەتاییەكان) ئەمانەش ئەوانەبوون كە لەبەشی داهاتوودا لەسەریان دەدوێین. لەراوبۆچوونی ئەمانەدا مرۆڤ خۆی پێوەری حەقیقەت بوو[٥]، بەوەی كە دروستی دەكات بەحەزو ئارەزوو بەرژەوەندی خۆی دیارە ئەمەش لەكەسێكەوە بۆ كەسێكی تر دەگۆڕێت یان لەشارستانیەتێكەوە بۆ شارستانیەتێكی تر دەگۆڕێت.ئەوەی ئەمرۆ بەڕاست دادەنرێت ئەوا بەیانی بەهەڵە دادەنرێت، وە ئەوەی بە حەقو راست دادەنرێت لەدیدو بۆچوونی گروپێكدا ئەوا بەهەڵە دادەنرێت لەدیدو بۆچوونی كەسانی تردا....

ئەم دوو گروپەو پێداگیریو تێگەیشتنیان لەحەقیقەت ئەمرۆ هەردووكیان بە هەڵە دادەنرێن. لۆژیكی نوێ ئارەزووی لەوە نیە بڕوا بەرەو لای گروپێكیان بەبێ ئەوی تریان، لەوانەیە ئێستا ئەو لۆژیكە بتوانێت بڕیاربدات كە ئەو حەقیقەتە (خودیو بابەتییە)

 

لەیەك كاتدا: یان حەقیقەت بەپێی ئەم ئیعتیبارە تازەیە ئەوەیە كە فیكر دروستدەكاتو لەهەمان كاتیشدا فیكر ئەو دروستدەكات هەر یەكەیان هۆكاری ئەوی تریانەو هەروەها ئەنجامەكەشیەتی.

(مانهایم) كە یەكێكە لەو پاڵپشتی كەرانەی ئەم قوتابخانە نوێیە لەلۆژیكدا وای دەبینێت لەدیدی خۆیدا كە حەقیقەت لەدەرەوەی عەقڵی مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە، یان راستر دەستكردی ئەم عەقڵە نیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چەند روویەكی هەیە. كاتێك عەقڵ بۆی دەڕوانێت لەزۆرجاردا لەتوانایدا نیە سەیری هەمووی كات تەنها لەسەر رووبەكەوە نەبێت لەبەرنەوە ناتوانێت وێنەیەكی كامڵو تەواوی هەموو رووەكانی بگرێت[٦]. بەدەربڕینێكی تر: عەقڵ بەشێك لەحەقیقەتی دەرەكی وەردەگرێتو پاشان لەلایەن خۆیەوە بەشێكی تری بۆ زیاددەكاتو بەمەش ئەو وێنەیە تەواو دەكات كە دێت بە خەیاڵی خۆیدا. هەر ئەمەشە وایكردووە لەهەریەكێك لەئێمە كە حەقیقەتی تایبەت بە خۆی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت هەروەك چۆن جانتاكەی خۆی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت.

دەكرێت حەقیقەت دابنێین بە هاوشێوەی هەرەمێك كە چەند ڕوویەكی هەبێت بەشێوەیەك مرۆڤ تەنها رووبەكی لێوە دیارە لەیەك كاتدا. بۆیە ئەگەر ئەمڕۆ یەكێكمان رووبەكی دیاریكراوی ئەو هەڕەمەی بینی ئەوا پاشان بەیانی دەگوێزێتەوەو رووبەكی تری هەڕەمەكە دەبینێت: ئەو كەسە لەهەموو رۆژێكدا زیاتر مەغرور دەبێت بەوەی بینیوەیەتیو دەمارگیر دەبێت پێیو هەموو خەڵكی دادەنێت بە هەڵە تەنها خۆی نەبێت.

(جۆن دێوی) پشتگیری ئەم ڕایە دەكات بەپشتگیرییەكی گەورە. ئەم لەم بڕوایەدایە كە عەقڵی مرۆڤایەتی ئاوێنە نیە بۆ حەقیقت هەروەك چۆن پێشینەكان وایان وێنا دەكرد. عەقڵ لەدیدی (جۆن دێوی)دا دروست نەكراوە لەپێناوی حەقیقەتدا، بەڵكو ئامانجێكی تری هەیە گرنگترو سوودمەندترە لەحەقیقەت ئەوەش بریتییە لەسەركەوتن لەناكۆكی مانەوەدا.

پێشینەكان لەو بڕوایەدا بوونو كە عەقڵ بریتییە لەوەرگرتنی حەقو ڕووناكی ڕێنماییو پێوەری حەقیقەت، بەڵام (جۆن دیوی) بەمانە پێدەكەنێتو بە هیچوپوچەكانیان دەژمێردرێت. چونكە لەدیدی ئەودا عەقڵ ئەندامێكە لەمرۆڤدا گەشە دەكاتو پەرەدەسەنێت هەروەك چۆن خەرتومی لوتە درێژەكەی فیلو كەڵبەتیژەكانی

شێرو لاقە گورجوگۆڵەکانی ئاسکەکێوی گەشەدەکەن و چالاکتر دەبن، عەقڵ لەمرۆڤدا پێدەگات و بەرەوپێش دەچێت بۆئەوەی یارمەتی مرۆڤ بدات لەتێکۆشان و خەباتی ژیان و ناکۆکی مانەوەدا، ئەو عەقڵە هیچ تێناگات لەحەقیقەت تەنها ئەو ڕێژەیە نەبێت کە لەم پێناوەدا سودمەند دەبێت لێی. عەقڵ پابەندە بەئارەزووە بزێوییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و سێکسییەکان و ئەوانی ترەوە...

کاتێك کەمرۆڤ کچێکی جوانی خۆش دەوێت یان گرەنتی ئابووری و پایەی کۆمەڵایەتی خۆش دەوێت بەڵام حەقیقەتی خۆش ناوێت تەنها مەگەر لەکاتێکدا نەبێت کە یارمەتیدەری بێت بۆ وەدەستهێنانی شتێك لەم ئامانجە پڕ چێژو پەسەندانە.

لەپەندێکی ڕۆژئاواییدا هاتووەو دەڵێت: ((بزێوی مرۆڤ بگۆڕە بەوە بیرو بۆچوونیشی دەگۆڕیت)). ئەم قسەیە زۆر ڕاستە. چونکە هەزارێکی برسی لەوانەیە هیچ لەحەقیقەت تێنەگات تەنها لەشێوەی ناندا نەبێت.

(جۆن دیوی) دەڵێت: ((عەقڵ ئامرازی ژیانە)) [٧].دووبارە وەك خەرتوومی فیلەکە وایە کە بەکاری دێنێت بەرامبەر بە دوژمنەکەی یان بۆ ڕامکردنی مێینەکەی هەمان ڕەگەزی فیل و بەکارهێنانی لەکاتی خواردندا. ئەمەو بەڵام هاوڕێیانی ئایدیالیزم پێداگیری دەکەن لەسەر بوونی حەقیقەتی ڕەهاو ئیش لەسەرکردنی و بانگەشەکردنی بۆ بەدەستهێنانی.

بۆیە دەبینین یەکێکیان هەوڵی ڕازیکردنی کەسێکی بەرامبەری دەدات بەوەی کە تەنها حەقیقەت لای ئەوەو لەگەڵ ئەودایە، پاشان توڕەو قەڵس دەبێت ئەگەر ئەو کەسە بڕوای نەهێناو نەچووە ژێرباری ئەو ڕازیکردنەوەی ئەوەوە، چونکە ئەو بێ ئاگایە لەوەی کە بەرامبەرەکەشی دووبارە وەك ئەو خۆی بە ڕاست دەزانێت و وا دەزانێت حەقیقەت تەنها لای ئەمە. هەمووی هەر بانگەشە دەکات بۆ گەیشتن بەدیداری لەیلا... ئەمەو بۆ زانین لەیلاش دەمێکە گەڕاوەتەوە بۆ ژێر ڕەحمەتی یەزدان هەر لەدێر زەمانەوە.

کەسی ئایدیالی داوا لەبەرامبەرەکەی دەکات بیربکاتەوە لەسەر بنەمای لۆژیك (منطق) بۆئەوەی بگات بە حەقیقەت، لەمەشدا مەبەستی لەحەقیقەت ئەو حەقیقەتە تایبەتەیە کە خۆی سوودی لێ بینیوە. ئەمەش بەو مانایەی کە ئەو دەیەوێت بەرامبەرەکەی بداتە پاڵی و لایەنگری ئەم بکات بۆئەوەی ئەم چاوی لێی بێت و کۆمەکی بکات لەژیاندا. بەڵام بەرامبەرەکەی بێنەو بەرەو پێچ و دەورەی پێدەکات و ناچێتە ژێر بارییەوە چونکە

نەمیش خۆی هەڵگری حەقیقەتێكی تایبەتمەندە بەخۆی‌و دەیەوێت سەركەوتن بەدەست بێنێت تێیدا، ئابەم شێوەیەو لەسەر ئەم بنەمایانەیە ناكۆكی‌و دووبەرەكی پەرە دەسێنێت‌و بڵاودەبێتەوە لەنێوان خەڵكیدا.

مێژوو ئەوەی سەلماندووە كە هەموو ئاینەكان، هەر چۆنێك‌و هەرجۆرێك بن، نەیانتوانیوە بڵاوببنەوە تا لەناو هەریەكە لەو ئاینانە خۆیاندا پەرتبون‌و دووبەرەكی رووی نەدابێت، یان راستر بڵێین هیچ ئاینێكیان نەیتوانیوە سەركەوتن‌و بردنەوە بەدەست بێنێت هەتا ئەگەر جیاوازییەكی بنیات نەنابێت‌و (وەك ئەڵێن ئاشێكی نەنابێتەوە) بۆ بڵاوبوونەوەو پەرەپێدانی لەناو خەڵكدا، بەجۆرێك تا وای لێهاتووە چەند گروپێكی جیاوازو دژ بەیەك تێیدا سەریانهەڵداوەو هەریەكە لەو گروپانەش بۆ خۆی بانگەشەی ئەوە دەكات كە تەنها ئەو دادپەروەرەو لەسەر حەقەو گروپی رزگاركەرەو ئەوانی تر ناحەقن‌و راست ناكەن. سەیرەكە لەوەدایە دەبینین مێژونوسان هۆكاری ئەو دووبەرەكیە وەلە ئاینێك لەئاینەكاندا دەگەڕێننەوە بۆ فلان‌و فیسار كەسایەتی مێژوویی‌و پاشان دەست دەكەن بە تانووتلێدانی‌و بەر لەعنەتی ئەدەن‌و دای ئەشۆرن بە بیانووی ئەوەی كە ئەو دووبەرەكی خستۆتە ناو ئەتەوەو سەری لەخەڵك شێواندووەو داردەستی كۆمەڵی دوو لەتكردووە. لەواقیعدا دووبەرەكی پیش خواردنەوەو رقێكە لەسروشتی عەقڵی مرۆڤایەتیدا. دووبەرەكیش هەمیشە دەست پێ ناكات تەنها لەدوای سەركەوتن نەبێت چونكە ناكۆكی بەرژەوەندییەكان لەوەوە سەرهەڵدەدات.

بۆ نموونە دەبینین كۆمەڵێك لەماوەیەكدا خەبات‌و تێكۆشانیان یەك بووەو لەیەك گروپدا كاریان كردووەو جیاوازی نەبووە لەنێوانیاندا چونكە بەرژەوەندی تاكە كەس‌و بەرژەوەندی كۆمەڵەكە لەوكاتەدا یەك بەرژەوەندی بووە، بەڵام پاشان كە سەركەوتن دەستی پێكردووەو غەنیمەت وەدەستهاتووە، ئا لەوكاتەدا هەندێكیان خۆیان بەزیادو لێهاتووزانیوە بەسەر هەندێكی تریانداو ئا لەوێوە ئیتر دووبەرەكی سەری هەڵداوەو كەڵبەیان لەیەكتر تیژكردووە.

وەك لەمەوپێش كەوتە بەرچاومان لێرەدا پێوەرێكی عەقڵی وردنیە كە هەموو كەسێك بڕوای پێیبێت لەبەرئەوە هەر كەسەو رۆچووە لەخودی خۆیداو دووبارە وای دادەنێت كە خراپیەكانی خۆی بیرچووەو پێداگیریش دەكات لەسەر چاكێتییەكانی خۆی. بۆیە

دەبینیت ئەو کەسە ئەگەر ڕکەبەرێکی بۆ دروست بوو لەبەرامبەریدا. لەهەر ئاستێك لەئاستەکانی ژیاندا ئەوا بێ سێو دوو ئامادەی فیداکاریو خەباتکردنە لەدژی ئەو کەسە لەو پێناوەدا. کێشەکە لەوەدایە مرۆڤ لەسروشتی خۆیدا کەسێکی خۆپەرستە هەرچەندە وا خۆی دەردەخاتو بانگەشەی بۆ دەکات کە وانیە. ئەو لەکاتێکدا ئەم کارە دەکات لەو بڕوایەدایە بە بڕوابوونێکی پتەوەوە کە مەبەستی لەم کارەیدا ئەومیە خێرو چاکەی گشتی دەوێتو لەبەرژەوەندی کۆمەڵ ئەوە دەکات. سروشتی عەقڵی مرۆڤایەتی ئارەزووی لەوەیە کە بەرژەوەندی تایبەتی خاوەن عەقڵێك لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا یەك بن، وە هەرشتێك سودو قازانج بگەیەنێت بەو خاوەن عەقڵە ئەوا لەدیدو بۆچوونیدا بەحەقێکی ڕەهای دادەنێتو پێویستیشی دەکات لەسەر هەموو خەڵك کە شوێنکەوتەی ئەوبن. ئا ئەمەیە کە پاڵمان پێوەدەنێتو پەلکێشمان دەکات بۆئەوەی گومانمان هەبێت لەپاكو بێ خەوشی هەر مرۆڤێكو بانگەشەکانی بۆ شوێنکەوتنی حەقی ڕەهاو دادپەروەری ڕەهاو یان ئەوانەی وەك ئەمانەوانو لەگەورەییدا نموونەیان نیە.

لێکۆڵینەوە لەمێژووی ئایینەکانو دەوڵەتان ئەو نموونەیەمان دەدەنێ کە هیچ تەمومژێکی لەسەر نیە لەسەر ڕاستو دروستی ئەم بیروڕایە. چونکە هەر فیداکارێكو خاوەن مەزهەبێکی ئایینی یان سیاسی بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو خاوەنی حەقەو هاوشێوەی نیە لەو بوارەدا، بۆیە ئەو کەسە هەوڵ ئەدات بەقەدەر ئەوەی کە لایەنگرو پشتیوانو چەقو تفاقی هەیە کاربکات لەسەر ئەو عەقڵەی بۆ کۆکردنەوەی سەلماندنەکانو بەڵگەکاریو پشتگیری کردنی مەسەلەکەی- ئەو لەو کاتەدا بەم کارەی بەشمشێر دەدات لەبەرامبەرەکەی لەلایەکەوەو لەلایەکی تریشەوە بەسەلماندنو بەڵگەکاری عەقڵی دەستەمۆی دەکات-.

جێگای پێکەنینە کە ئایدیالییەکان هەمیشە خۆیان سەرقاڵکردووە بەتوێژینەوەو پرسیارکردنو کنەو پشکنین بەدوای ئەوەدا تا بزانن کێ دووبەرەکی ناوەتەوە لەنێوان ئەم نەتەوەیەداو پەرتەوازەی کردوونو کیانی ئەم ئاینەی پەرت پەرت کردووە.

بۆیە دەیانبینین لەبگرەو بەردەیەکی گەورەدانو لەسنوردەرچووە. بەڵام بێئاگان لەوەی کە هەموو بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی تۆوی دووبەرەکیو پەرت بوون لەناخی پێکهاتنو دروستبونیدایە. ئەو بزوتنەوەیەش سەرکەوتوو نابێت هەتا بەش بەش نەبێت.

نموونەی ئەمە وەك ئەو ئەمیبایە (مشەخۆر)ە وایە کە ناتوانێت بگاتە ئاستێکی دیاریکراو لەپێگەیشتندا تا نەبێت بە دوو کەرتەوە بۆ دوو ئـەمیبا، هـەر یەکـەش لـەو دوو ئەمیبایـە دابەش دەبن کاتێ دەگەنە ئاستێکی دیاریکارو لەگەشەکردندا.

سەرکەوتن تـۆوی دۆڕانـدنی هـەڵگرتووە لەبنـەمای سروشـتی خۆیـدا، بۆیـە چاوەڕوانی ناکرێـت لـەئایین یـان لەهـەر بزوتنەوەیـەکی تـردا پـاش سـەرکەوتنی ئـیش‌و کارەکانیـان بەهێمنی‌و تەبایی بەڕێوە بچێت وەك ئەوەی کە لەوەوپێش بەڕێوە دەچوو چـونکە لەوێـدا دەستەیەك یان گروپێك سودمەندبوون لـەو سـەرکەوتنە ئـەوا بێگومـان هـەردەبێ دەسـتەو گروپێـك بێنــە ئـاراوە بـۆ ڕکەبەرایـەتی کردنـی ئـەمان لەسـەر ئـەو سـودوەرگرتنە. لـەم پـشێوی‌و ژاوەژاوەشـدا عـەقڵی مـرۆڤ بەشـداری دەکـات وەك چـەکێکی دێـرین‌و ڕابـردوو بەدەسـتی هـەموو پارتێکـەوە — هـەر پـارتێکیش لـەو پارتانـە دڵخۆشـن بـەو چەکەی کـە بەدەستیانەوەیە-.

ئێمـە لەکاتێکـدا کـە مێـژووی ئیـسلام دەخوێنینـەوە چـاومان بەڕاسـتی ئـەم حاڵەتـە دەکـەوێت زۆر بـەڕوون‌و ئاشـکرایی. بۆیــە هـەر لەوانەشـە سـەرهەڵدانی دووبــەرەکی‌و پەرتبوون لەئیسلامدا پێش دەست بووبێـت لەهـەموو ئاینـەکانی تـر، ئـەوەش بـەهۆی ئـەو خێرایی‌و پەرەسەنـدنی بڵاوبوونـەوەیەی بووە کە بەدەستی هێنـاوە لەئـەنجامی بانگـەوازی ئیسلامی‌و فتوحاتەکانیدا لەوپەڕی شوێنە دوورەکانی گۆی زەویدا. دەڵێن گوایە مەسـەلەی خەلافـەت یەکـەمین سەرچـاوەی بنـچینەیی بـووە بـۆ هـەمو جۆرەکـانی پـەرتبوون‌و دووبەرەکی لەئیسلامدا، ئەم وتەیە زۆر نزیکە لەڕاستییەوەو واقیعیش پشتگیری لێ دەکات، چونکە خەلافەت لەسەرەتای پەیدابوونیدا لەوانەیە زوهدو خواپەرستی‌و مـل کـەچ بـوون بووبێت بۆیـە جیـاوازی بـیروڕا لەسـەری زۆر کـەم‌و لاوازبـووە بـەجۆرێك لەوانەیـە کـەس هەسـتی پـێ نـەکردبێت. بـەلام پـاش ئـەوەی خۆشـگوزەرانی‌و ئاسـوودەیی تیـا بـەدیکراو دەوروەدرا بەشـکۆمەندی‌و لوتبـەرزی‌و عەنعەنـەو تەنتەنـەو هـەموو جۆرەکانی خۆشـی‌و چێژو ڕابواردنی تیا بڵاوبوویەوە ئیتر هەرکەسەو بۆ خۆی دەروونی بۆی دەهاتـە جۆش‌و بـەرەو ڕووی هەڵپـەی دەکـرد[٨]، بۆیـە عەقڵەکان کەوتنـە دانـانی مەزهەبـە فیکریـەکان‌و گروپە ئاینیەکان لەپێناوی زاڵبوون بەسەر ئەو خەلافەتەداو هەرەس پێ هێنانی.

★ ★ ★

دووبارە دەگونجێ ئەوەش بڵێین کە سەرکەوتن تۆوی دۆڕاندنی لەگەڵ خۆیدا هەلگرتووە لەمەسەلە تاکە کەسیەکانیشدا. تاکێك سەرکەوتن بەدەست دێنێت ئەوا بەو سەرکەوتنەی چوارچێوە فیکرییەکەشی دەگۆڕێت. چونکە ئەو کەسە لەو کاتەدا بە دیدێکی تازەترەوە دەڕوانێت لەکاروبارەکانیو خۆی هەڵدەکێشێت بەو بارودۆخە نوێیەوە کە تێیدایە، هەر بۆیەش ئەم گۆڕانکارییە لەدیدو بۆچوونیدا جاروبار دەبێتە هۆکاری پەلکێش کردنی بۆ دۆڕاندنو کەوتن. بۆ نموونە (هیتلەر) کاتێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا زۆر دڵخۆش بوو (گەشبین بوو) تا ئەوپەڕی سنوری دڵخۆشیو ئاسوودەیی، گەشبینی هۆیەکە لەهۆیەکانی سەرکەوتن هەروەك لەدواییدا دێینە سەری، بەڵام ئەگەر لەسنوری خۆی دەرچوو ئەوا بەپێچەوانەوە دەبێتە هۆی زیان گەیاندنو لەناوچوون.

لەکاتێکدا (هیتلەر) خۆی دەبینیەوە کە لەپلەی عەریفێکەوە بەرزبووەتەوە بۆ پلەی ڕابەرێکی گەورە لەنەتەوەیەکی گەورەی وەك (ئەڵمانیا)دا، بۆیە لەخۆباییبونو سەرەڕۆیی زاڵبوون بەسەریداو بڕوای وابوو کە بووە بەکەسێکی پیرۆزو شایستەو ئیتر هەرگیز هەڵەناکات لەبڕیارو ئامانجەکانیدا... ئابەم شێوەیە نەتەوەکەی ڕاپێچی دۆزەخی جەنگێکی ماڵوێرانکار کرد.

هەروەها بەهەمان شێوەی هیتلەر دەگێڕنەوە لەبارەی بازرگانی جەنگەوە سەبارەت بەو ماڵو سەروەتە زۆرەی کە لەماوەیەکی کەمدا بەدەستی هێناوەو وای لێکردووە لەوبڕوایەدابێت کە ئەوە بەشی خۆیەتیو ئیتر دووچاری هەژاریو دەستکورتی نابێت هەرگیز، لەبەرئەوە دەبینیت مەغرور بووەو لوتی کردووە بە حەواداو ترۆفیز لێدەدات لەسەر ئەوەی کە بەدەستی هێناوە، بەڵام کاتێ بەخۆی دەزانێت قڵپ دەبێتەوەو فریای پاوپێڵاوی خۆی ناکەوێت. خاوەن بڕوانامەکانیش لەکۆمەڵگای ئەزانو دواکەوتوودا تووشی هەمان دەردی دەوڵەمەندانی جەنگ (بازرگانانی جەنگ) بوونە. چونکە ئەمانیش خۆیان لەلوتکەیەکی هەزار بەهەزاردا دەبیننەوە لەچاو ئەو خەڵکانەی وا ئەوەتان لەدەوروبەریان، لەبەرئەوە دەیانبینیت ئیتر بەوە وازیان هێناوە کە پێشتر لەزانکۆدا وەریانگرتووەو چەقیان بەستووە لەسەر ئەو ئاستەی کە ئەو کاتە لەسەری بوون، بۆیە خۆیان خەریك

 

دەکەن بەفێڵ و تەڵەکەبازیو پیلان گێڕییەوەو پشتی یەکتری پێ دەخورێنن هەندێکیان لەسەر حسابی هەندێکی تریان لەپێناوی بەدەستهێنانی پلەو پایە زانکۆییەکاندا یان کلکەلەقێ و مامە حەمەیی بۆ نزیك بوونەوە لەپیاوانی فەرمانڕەواو بڕیاربەدەست.

نەگبەتیەکە لەوەدایە هەندێکجار مرۆڤ خۆی دەستی نیە لەدروستکردنی ئەو چوارچێوە فیکرییەی خۆی یان لەگۆڕینیدا، چونکە چوارچێوە فیکریەکەی گەشەدەکاتو پەرەدەسێنێت بەپێی بەرکەوتەو لێکخشاندنە ناتایبەتەکان بەو چوارچێوەیەو ئەو کەسە خۆی ناتوانێت بڕیاری تێدابدات تەنها کەمێك نەبێت.

چوارچێوەی فیکری شتێکی نەستییە هەروەك باسمانکرد، لەبەرئەوە مرۆڤ ناتوانێت زاڵبێت بەسەر شتێکدا کە هەستی پێ نەکات.

ئێمە هەوڵئەدەین لەم بەشەدا بچینە دەرەوە لەباسی چوارچێوەی فیکری لەنەستداو بچین بەرەو بازنەی ئاگاییو هەست، لەوانەیە بتوانین بەم کارەمان یارمەتی ئەو کەسانە بدەین بۆ ناسینی عەقڵی خۆیان بەو کۆتوبەندەی کە پێوەی دەناڵێننو دیاریکردنی مەودای دیدو بۆچوونەکانیو لابردنی کۆسپەکانی ڕێگای سەرکەوتنی.



ئێستا ئەوە بەبیر خۆمان دێنینەوە کە لەوە تێبگەین، چیە ئەو کۆتو پەیوەندانەی وا عەقڵی مرۆڤ کۆت دەکەن لەڕوانینیدا بۆ حەقیقەت، یان بەدەربڕینێکی تر: ئەو توخمانە چین کە چوارچێوەی فیکری پێکدەهێنن.

دەگونجێ بڵێین لێرەدا سێ کۆتو بەند هەیە کە دانراون لەسەر عەقڵی مرۆڤ لەکاتی بیرکردنەوەیدا یان لەکاتی ڕوانینیدا بۆ ئیشو کارەکان. ئەم سێ جۆرەش ئەمانەن:-

*١. کۆتە دەروونییەکان.*

*٢. کۆتە کۆمەلایەتییەکان.*

*٣. کۆتە شارستانییەکان.*

١- کۆتە دەروونییەکان: پێش هەموو شتێك مرۆڤ خاوەنی دەروونێکی ئاڵۆزە کە پڕە لەئارەزووە سەرکوتکراوەکانو سۆزدارییە هەڵچوەکانو بۆچوونە شاراوەکان. کەواتە فیکری

 

پابەندە بەم کۆتو بەندە دەروونیانەوە کە هیچ بەشێکی تێدانیە تەنها بەدەگمەن نەبێت. کەچی مرۆڤ بانگەشەی ئەوە دەکات کە بیر دەکاتەوە بە بیرکردنەوەیەکی ئازاد بەبێ لایەنگیریو بەبێ دەمارگیری، لەهەندێجاردا ئەم قسەیە ڕاستە کە دەیکات، چونکە نازانێت کە چی حەشاردراوە لەعەقڵی ناوەوەیدا (نادیاریدا) لەگرێ کوێرەو کەفو کوڵی سۆزداریو تامەزرۆییە شاراوەکان.

بۆ نموونە ئەگەر پرسیار لەیەکێکیان بکەیت: بۆچی تەنها هیتلەرت خۆش ویست لەناو هەموو سەرکردەکانی تردا؟ لەوەلامدا پێت دەڵێت لەبەر گەورەییو پاکژیو دڵسۆزیو عەبقەرییەکەی خۆشم دەویست. ئەو کەسە بەڵگەو سەلماندنی وا دروست دەکات تا بۆت بسەلمێنێت کە ئەو لەخۆشەویستییەکەیدا بۆ (هیتلەر) حەقیقەتی تێدابووە. لەواقیعدا ئەو هیتلەری بۆیە خۆشویستووە چونکە چیرۆکی ژیانو بەسەرهاتی هیتلەر هەندێ لەئازمزووە سەرکوتکراوەکانی ئەوی تێرکردووە بەشێوەیەك وایلێکردووە کە هێزو توانا یان دەستدرێژی یان شانازیکردنی خۆش بوێت.... ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کەسە هەستی بە کەموکووڕیی کردووە لەدەروونی خۆیداو بەشێوەیەکی نا هەستی (لاشعوری) لەهیتلەردا بینیویەتییەوەو بۆتە هۆی نەهێشتنی ئەو کەموکوورییەی بۆیە گرنگیو بایەخدانی ئەو کەسە بە (هیتلەر)وەك گرنگیو بایەخدانی (مەجنون) وایە بۆ (لەیل-لیلا)کەی.

٢- کۆمەڵایەتیەکان: فیکری مرۆڤ دیسان پابەندە بە کۆتە کۆمەڵایەتییەکانەوە سەرەڕای پابەندبوونی بە کۆتە دەروونییەکانەوە. ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێت دەبینی کەسێك لایەنگری کۆمەڵێك یان چینێکە یان شارێکە یان هۆزێکە یان هەرشتێکی تر لەم بابەتانە.... لەبەرئەوە دەبینیت ئەو کەسە دەمارگیرە بۆ کۆمەڵەکەی خۆی بە حەقو ناحەق هەروەك چۆن عەرەبە نەزانە جاهیلەکان ئەنجامیانداوە، کاتێك دەڵێن: ((لەگەڵ براکەتدابە ئەگەر ستەمکار یان ستەملێکراویش بێت)).

بۆ نموونە ئەمەش بینراوە لەچینی ((جەندرمە)) لەعێراقدا بۆ ڕێزگرتن لەسەردەمی عوسمانیو ئەمریو شکۆداری شوێنەواری عوسمانی بەشێوەیەك کە جێگای سەر سوڕمانە. فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان لەعێراقدا فەرمانڕەواییەکی پیسو بۆگەنو قێزەون بووە

 

بەبێ هیچ گومانێك ئەمەو کەچی کەسانی وەك ((جەندرمە)) ئاسا وێنەیەکی جیاوازیان لێهەلگرتووە کە جیاوازە لەواقیع بە جیاوازییەکی دیارو لەبەرچاو. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی پێکهاتنی فیکریان.

چونکە ئەوانە لەسەر دەمی فەرمانڕەوایانی عوسمانیدا پلەو پایەو جۆرەکانی خۆشیو رابواردنو خۆشگوزەرانیان بەدەستهێناوەو وایلێکردوون کە لەدیدو بۆچوونی ئەواندا ئەو سەردەمە واتە (سەردەمی عوسمانیەکان) دابنرێت بە بەختەوەرترین سەردەم کە تێپەڕیوە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. بۆیە ئەوانە لەگۆشە نیگای پێچەوانەی ڕۆڵەکانی گەلەوە دەڕوانن بۆ ئەو سەردەمە.

جارێکیان یەکێ لەبرادەرانی ((جەندرمە)) کەوتە گفتوگۆ لەگەڵمداو ئاخو داخی هەڵدەکێشاو زەمی ڕەوشت نزمیو خراپی فەرمانبەرانی ئەمرۆی دەکرد، ئەو دەیوت لەسەردەمی عوسمانیدا فەرمانبەر زۆر بەڕێزو پایە بڵندبووەو تێکەڵی هەموو کەسێك نەبووەو بەزمانی خەڵکی ڕەشۆکی قسەی نەکردووەو لەگەڵیشیاندا نەژیاوە. بەڵام ئەمرۆ فەرمانبەر لەدیدی ئەودا سوكو ڕسوایەو لەگەڵ هەموو خەڵکێکدا قسە دەکاتو ئەو پۆشاکانە دەپۆشێت کە خەڵکی تریش دەیپۆشنو هەروەك ئەوانیش قسە دەکات لەناخاوتندا بەبێ جیاوازی. پاشان کۆتایی بەقسەکانی هێنا بەم وتانەی: ((ئەو سەردەمە زێڕینە بەسەرچوو کەتێیدا حکومەت بەڕاستی حکومەتبوو بەمانای وشەو پیاویش تێیدا پیاو بوو)).

لەڕاستیدا نەمدەویست مشتومڕی لەگەڵدا بکەم. چونکە هەر وتوێژێك لەگەڵیدا دەبوویە هۆی توڕەبوونیو ڕقی هەڵدەسا، چونکە چوارچێوەی فیکری ئەو لەسەر ئەو تەرزەیەو لەوەزیاتر شك ناباتو هیچ دەستێکیشی نییە لەو هەڵوێستەیدا. دیدی ئەو بۆ حکومەت دیدێکە جیاوازە لەو دیدەی کە من پێی دەڕوانمە حکومەت. لەدیدی مندا حکومەت خزمەتکاری گەلەو فەرمانبەریش کرێ گرتەی حکومەتە، بەڵام لەدیدی ئەودا شتەکە ئاوەژوی ئەم حاڵەتەیە، ئەو وابەستەیە بە کۆمەڵێکەوە کە جیاوازە لەو کۆمەڵەی کە من وابەستەم پێیانەوە، ئەو لەچینی فەرمانڕەوایانو لایەنگیریانەو منیش لەچینی گەلو دەستو پێوەندم، وە بۆ هەریەکە لەم دوو چینە چوارچێوەیەك یان دووربینێکی تایبەت هەیە کە لێوەی دەڕوانرێت بۆ ئیشو کارەکان (حاڵەتەکان).

٣- کۆتــە شارســتانییەکان: عــەقڵی مرۆڤایــەتی، ســەرەڕای کۆتــە دەروونــیو کۆمەڵایەتییەکان ئەوا کۆتە شارستانییەکانیشی لەسەرە، ئەمەش بریتییە لەو کۆتانەی کە هەموو کۆمەڵەو گروپەکان بەشداری تێدا دەکەن لەناو یەك شارستانیەتی دیاریکراودا.

بـۆ نموونـە خێڵەکییـەکان ئاکـارو پەنـدو ئامـانجی خۆیـان هەیـە بەشـێوەیەکی گـشتی لەژیانـداو هـەموویان بڕوایـان پێهێنـاوە سـەرەڕای جیاوازیـان لـەدەمارگیری خێڵەکیـدا یـان لەچینایەتیو کۆمەڵایەتیـدا، ئـەم ئاکـارە شارسـتانێتیانەش بـە قـوڵی لەنەسـتیاندا بنجی داکوتاوە بەجۆرێك تاك گەشەی کردووە لەسەریو پێی ڕاهاتووە تەنانەت بووە بـە بەشـێك لێیو جیانابێتەوە لەلۆژیكو شێوازی بیرکردنەوەی.

بـۆ نموونـە خێڵەکیـەك خوشـکەکەی خـۆی دەکوژێـت ئەگـەر هـاتوو گومـانی هـەبوو لەخوڕەوشـتی ئـەوا زۆر بەشـانازییەوە ئـەم کـارە ئەنجامـدەداتو هـەروەکو بڵێـی جیهـادی کـردووە لـەپێناوی حـەق یـان بەخـشندەییو چاکسازیدا، ئەگـەر هـاتوو لەگـەڵیا بکەویتـە گفتوگـۆوە سـەبارەت بـەو حاڵەتـە ئـەوا سـەری سـوڕدەمێنێ لـەو گفتوگۆیـەی تـۆو بگـرە تۆمەتباریـشت دەکـات بـە تۆمـەتی شـەرەفو نـامووس. کەچـی لەئـەمریکا بـاوکی کـچە بەخێرهاتنی دۆستی کچەکەی دەکاتو لێیان دەگەڕێت بۆ خۆیان ئاوێزانو دەست لەملانی یەکتربن لەخانووەکەی ئـەودا. ئەگـەر پرسیاریـشت لێکـرد سـەبارەت بـەم کـارە ئـەوا پێـت دەڵێت: ئەوە تاکە ڕێگایە بۆئەوەی کـچەکەم ئاشـنایی پەیـدابکات بەرامبـەر بـە مێردەکـەی بۆئەوەی خووڕەوشتو کەسایەتی تاقی بکاتەوە.چونکە ئەوە دەبێتە هاوسـەری هەمیـشەیی بۆی لەداهاتوودا. بۆیە دەبینی کابرای ئەمریکی ئەو کارەی خێڵەکییەکە پەسـەند ناکاتو بـە وەحـشی دادەنێـت. کـابرای خێڵـەکیش ئـەو کـارەی ئەمریکییەکـە بەسەرشـۆڕیو بـێ ئابڕوویی دادەنێت. هەریەکەشیان بگری لەو دوانە سیقەیان بەڕاستیو دروستی ئـەوە هەیـە کە دەیڵێنو جێبەجێی دەکەن.



دوو سوار لەسوارەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لـەپاڵ پەیکـەرێکی کۆنـدا دەگـەن بەیـەكو جیاوازی دەکەوێتە نێوانیانـەوە لەسـەر ڕەنگـی پەیکەرەکـە، یـەکێکیان دەڵـێ زەردەو ئـەوی

تریان دەڵێ شینە. لەڕاستیدا پەیكەرەكە لەیەك كاتدا زەردیش‌و شینیشە، بەشێوەیەك لەلایەكەوە بەڕەنگێك بۆیاخكراوەو لەلایەكەی ترەوە بەڕەنگێكی تر بۆیاخكراوە جیاوازە لەڕەنگی ئەولاكەی. ئەم دوو شۆڕە سوارە بەهەڵمەتە نەیان توانی تەنها چركەیەك ڕاوەستن‌و پشكنینی ڕەنگی پەیكەرەكەیان پێنەكرا لەهەردوو لاكەیەوە، كەچی هەردووكیان پێداگیریان دەكرد لەسەر ئەوەی كە یەكتری بەدرۆبخەنەوەو هەڵەی یەكتری ئاشكراكەن، بۆیە لەئاكامدا كەوتنە شەڕە جنێوو قسەی ناشرین‌و ناوناتۆرە بەیەك وتن‌و پاشانیش شیرو تیریان لەیەك دەركێشاو بوویە مەیدانی پاڵەوانبازی.

بەزۆری خەڵك ناكۆكییەكانیان ئالەم جۆرەیە، چونكە هەریەكێك لەو خەڵكە لەگۆشەنیگایەكی تایبەت بەخۆیەوە دەڕوانێت بۆ حەقیقەتەكان‌و پاشان داوا دەكات لەبەرامبەرەكەشی كە وەكو ئەو بڕوانێتە ئەو حەقیقەتە یان ئەو ڕووداوە.

كێشەی ناكۆكیەكانی مرۆڤایەتی بریتییە لەكێشەی پێوانەكاری‌و ڕوانینەكانی بۆ شتەكان پێش ئەوەی كێشەی حەق‌و ناحەق بێتە ئاراوە. كوا خەڵكیش حساب بۆ ئەو كێشانە دەكات كە كێشەی نێوان حەق‌و ناحەق بێت بەڵكو لەواقیعدا وای دەبینین كە كێشەی نێوان حەقێك‌و حەقێكی ترە[١٠]. هەموو ناكۆكیكارێك بەزۆری لەو بڕوایەدایە كە خۆی لەسەر حەقەو بەرامبەرەكەی ناحەقە، بێتو گەر تۆش لەهەمان گۆشە نیگاوە بۆی بڕوانیت كە ئەو بۆی دەڕوانێت ئەوا هەندێك لەحەقی تێدا بەدی دەكەیت كە لەگەڵ ئەودایە جا ئیتر كەم بێت یان زۆر.

(مادام شتایل) لەوتەیەكی بەناوبانگیدا دەڵێت: ((ئەگەر هەموو شتەكانت بزانیبایە ئەوا لەهەموو كەسێك دەبووردی)) ئەم وتەیە لەهەندێ لایەنەوە ڕاستە. دەتوانیت لەهەوو كەسێك ببوری ئەگەر لەو دیدەوە بڕوانیت كە ئەو پێی دەڕوانێتە شتەكان.

سەیر لەوەدایە خەڵكی لەشێت دەبورن لەوەی كە ئەنجامی دەدات كەچی لەتاوانبار نابورن. ئەمەو بۆزانین تاوانباریش وەك شێت وایەو عەقڵیەتێكی تایبەتمەندی هەیە كە پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەنجامدانی تاوان. لەوانەیە ئەو كۆمەڵگایەی سزای تاوانبار دەدات ئەوا خۆی شایانی ئەوسزایە بێت كە دەیدات بەسەر ئەو تاوانبارەدا.

ئەمەش بەو مانایە نییە كە سزادانی تاوانبار ئەنجامنەدرێت. بەڵكو تاوانبار دەبێت سزا بدرێت لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا، ئەمەو بەڵام پێویستە ئەوەش بزانین كاتێك

سزای تاوانبار دەدەین ئەوا زوڵمی لێدەکەین. ئەمەش مانای ئەوەیە کە سزادانی تاوانبار شەڕێکەو دەبێت بکرێت، چونکە ئەوە زوڵمێکی کەمە لەپێناوی دادپەروەرییەکی زۆردا. لۆژیکی نوێ بڕوای بە دادپەروەری ڕەها نییە هەروەك چۆن بڕواشی بە حەقی ڕەها نییە. لێرەدا لەدیدی ئەم لۆژیکەوە دادپەروەری شمولی هەموو خەڵکی ناکات. هەرکەسێکیش بانگەشەی حەقی ڕەها دەکات وەك ئەوەی خۆی دەیەوێت بەجۆرێك کە هەست بکات یان هەست نەکات، ئەوا خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنێت یان بەلای خۆیدا پەلکێشیان دەکات یان بەلای کۆمەڵەکەی خۆیدا ڕایاندەکێشێت. ژیانیش لەواقیعدا ناکۆکی نێوان بەرژەوەندییە جیاوازەکانە. هەموو مرۆڤێکیش، تەنانەت پیاوکوژو جەردەش، حەق دەبینێت لەو دووربینە تایبەتەی خۆیەوە کە پێی دەڕوانێت بۆ شتەکان، بۆیە لەبەرئەوە دادپەروەری لایەنگری ژمارەیەکی زۆرە دژی ژمارەیەکی کەم. بەدەربڕینێکی تر: جاروبار زوڵم پێویستە، ئەمەش لەکاتێکدا کە دوو حەق پێکدا هەڵدەگرژێن و دەشێ یەکێکیان سەربەلایەنە بچووکەکە بێت و بیەوێت چاکێتی و ڕاستێتی خۆی بدات بەسەر لایەنە گەورەکەداو لەسەر حسابی ئەو بە ئامانجی خۆی بگات. ئا لەو بارەدا حەق داوات لێدەکات کە زاڵم بیت بۆئەوەی ئەو حەقە لاوازە لەڕەگ و ڕیشەوە دەرکەیت و شوێنەواری بسڕیتەوە بەیەکجاری.

بۆ تێڕامانی خوێنەر وەك نمونە باسی دەکەین: لەیاسای تەجنیدی زۆرەملێدا کە چەسپێنرابوو بەسەر ڕۆڵە مسکێنەکانی گەلی عێراقدا، ئەوا دەبینین بەبێ بوونی هیچ گومانێك کە چۆن چوارچێوەی فیکری لەعەقڵی دەستەیەکی بچوکدا بڕیاربەدەست بوون و زوڵمیان دەکرد لەخەڵك بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن.

گومانی تێدانییە کە خەڵکی ڕەشۆکی عێراقی ڕقیان لەتەجنیدی زۆرە ملێیەو زۆر بەلایانەوە شتێکی ناپەسەندە بۆیە هەر کاتێك یەکێك لەڕۆڵەکانی ئەو گەلە هەست بەوە دەکات ئیتر تەمەنی نزیکبۆتەوە بۆ سەربازی و دەیگرن بە سەرباز لەتەجنیدی زۆرە ملێدا ئەوا سەری دنیای لێ دێتەوە یەك و هیچ کونێك شکنابات تا لێوەی دەربازبێت و هەموو دنیای لەبەرچاو ڕەش دەبێت. ئەمە زۆر جیاوازە لەهەموو پاڕانەوەو داوای لێبوردنکردن و بەخشینەکانی ترو هەوڵدانیش تێیدا جیاوازە لەهەوڵدانەکانی تر بۆ لێ ڕزگاربوونی، بۆیە سەیر دەکەی ئەو لاوە دەگری و سکاڵا دەکات و درۆدەکات و دەپاڕێتەوە لەپێناوی ئەوەدا

 

بەڵکو رزگاری بێت لەو پاسا فێزەونو نەگریسە ئەمەو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لەبرادەران و هەڤاڵان حاڵەتەکە وانابینن وەك دەردەکەوێت لەم بینینە ڕاستو واقعییەوە. بێتو گەر تۆ باسی تەجنیدو کاروبارەکانی نەکەی بۆ یەکێکیان ئەوا دەبینیت کە چۆن ئەو کەسە حەماس دەیگرێو دڵی پڕدەبێ لەهەستو کەفو کوڵی نیشتمانی ئەمە بێئاگا لەوەی کە بزانێ تەجنید ئیشی چییە!.

ئەوانە تەجنید ناودەبەن بە خزمەتگوزای زانست، بەڵام نازانین مەبەستیان چیە لەزانستو خزمەتەکەشی، بەڵکو هەر قسەی سوڵتانەکانیانەو پێی گۆشکراون هەر لەسەردەمی رۆژانی منداڵیانەوە، چونکە ئەوانە کەیفیان پێدێو لەو بڕوایەدان خۆیان گەیشتونەتە حەقیقەتێکی وا کە هیچ گومانی تێدانیە سەبارەت بەو مەسەلەیە.

گەلانی عێراق پێویستیان بەفێرکردنی ئیلزامی یان چارەسەرکردنی ئیجباری هەیە یان هەرشتێکی تری لەم بابەتانە کە بۆ ژیان پێویستنو نەبێ دەستەبەربکرێت. بەڵام بەداخەوە دەبینین برادەران ئەمانایان هەموو فەرامۆشکردووەو تورپانهەڵداوەو لەجێگەیدا تەجنیدی زۆرە ملێیان سەپاندووە. ئەگەر هاتوو نارەزاییو ڕەخنەشت لێگرتن سەبارەت بەمە ئەوا تۆمەتبارت دەکەن بەوەی تۆ خیانەتتکردووەو دەیکەن بە هەڵڵاو هاتوهاوار لەسەرتو لەکەللەی سەر دەقیڕێنن بە هەموو هێزیانەوە: بژی نیشتمان- بژی وەتەن! تۆش ناچاردەبیت لەوا حاڵەتێکدا بە هەموو هێزو تواناتەوە ڕاکەیتو هەڵبێیت لەدەستیان...

لەواقیعدا ئەوانە سەرزەنشتو سەرکۆنە ناکرێن لەوەی وا بیری لێدەکەنەوەو ڕەفتاری پێدەکەن، چونکە ئەوانە وتەکەی (مادام شتایڵ) وەك لەمەوپێش باسمانکرد رێك دەچەسپێت بە سەریاندا، لەبەرئەوەی ئەوانە لەم ئیشەدا بەو عەقڵیەتە تایبەتە هاتوونەتە کایەوە کە لەسەری گۆشکراونو پێگەیشتوون. ئەوانە سەیری کاروبارەکان دەکەن لەبواری ئەو چوارچێوەی فیکریەوە کە لەسەری ڕاهاتوونو بەرژەوەندی تایبەتیان تێیداهەیەو تێکەڵبوون لەگەڵیدا. ئەوانە لەتەجنیدی زۆرە ملێدا خێروبێریان دەستکەوتووەو ئیتر ئاگایان لەوە نیە چی ڕوودەدات پاش ئەوە لەناو گەلداو چ کارەساتو نەگبەتییەك ڕوودەکاتە خەڵك.

هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە، کە یەکێ بوو لەو عێراقییە بێ نەوایانەی کە ڕەوانەی قەسابخانەکانی جەنگ کرابوون لەسەردەمی عوسمانییەکاندا هەروەکو ڕانەمەڕ، وتی:

هێنایانین منو هەموو ئەوانەی بە زۆرە ملێ كێشیان كردبووین، لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەكەمدابوو، هێنایانین بۆ گۆڕەپانی (قشلە) لەبەغداو لەوێ مۆڵیاندایـنو موفتیەك هاتە سەرمانو دەستیكرد بە وتار خوێندنەوە بە وتارێكی حەماسیو كاریگەر.

وتی:هەرچی دەوتو دەیخوێندەوە ئەو پیاوە ئاینیە گەورەیە مەبەستی لەوەبوو بەئاگامان بێنێتەوە لەوەی كە هەست بە ئەركی سەرشانیان لەپارێزگاریكردن لەئایینو دەوڵەتو لەم پێناوەشدا پێویستە خۆیانی بۆ بەخت بكەنو بەسەرو ماڵ قوربانی بۆ بدەنو گیان فیدا لەپێناوی پارێزگاریكردن لەقورئان... پاشان هەردووچاوی وتاربێژ (خەتیب) هەڵنیشت لەفرمێسك لەئەنجامی توندیو كاریگەری حەماسەتی وتارە بەجۆشەكەیدا.

بێگومان ئەوەی ئەو خەتیبە وتویەتی ڕاستە، بەڵام حەقێكی تایبەتە بە دەستەیەكی بچوك ئەوەش دەستەو تاقمی ئەوانەیە كە سودیان وەرگرتووە لەدینو دەوڵەت. بەڵام خەڵكانی ڕەش و ڕووتی گەل (خەڵكی ڕەشۆكی) كە چەوساوەتەوەو سەركوتكراوە لەژێر پەردەی ئەو ئایینو دەوڵەتەداو حوكمی بەسەردا دەكرێت بەو پێوەرانەی ئەو حوكمە حیسابو كیتابی لەگەڵدا دەكرێت چی تێدەگات لەو هاتوهاوارو وتاربێژەو قسە كاریگەرو پڕ حەماسانە.

لەگەڵ ئەوەشدا كابرای موفتی بۆ خۆی سوودمەندە لەنیعمەتەكانی دینو دەوڵەتو خۆیو كوڕەكانیو كوڕەزاو كچەزاو عێلو عەشرەتی -بێگومان- عەفوكراون لەو تەجنیدە زۆرە ملێیە.

ئەوەی سەیرە لەكاروباری ئەم برادەرانەدا ئەوەیە كاتێك خۆیان سوودمەند دەبن لەشتێك وا دەزانن یان وا گومان دەبەن كە هەموو خەڵكی سوودمەندبووە لەو شتە، بۆیە لەبەرئەم هۆیە دەیانبینیت ئارەزووەكانیانو حەزە شەهوانییەكانیان دەسەپێنن بەسەر خەڵكیداو پاشان داوای ملكەچیو گوێڕایەڵیشیان لێ دەكەن.... هەروەها داوای ئەوەش دەكەن لەخەڵك بە پیرۆز سەیریان بكەن.

مێژوو ئەوەی سەلماندووە كە هەموو زاڵمو دیكتاتۆرێك لەجیهاندا لەو بڕوایەدایە كە چاكو بەخشندەیە. ئەوەش لەئەنجامی ئەوەوە بە دەستی هێناوە كە ئەوانەی وان لەدەوری پاڵپشتی یەكەمی بوون لەو بڕواهێنانەیدا. چونكە ئەو هەڵدەستێ بە زوڵمو زۆركردن

لەسەر زۆرینـەی خـەڵك و مـاڵ و سـەروەتیان بـە تـاڵان دەبات بۆ خـۆی بـەڵام ئەوانـەی کـە ژێردەسەو زوڵملێکراوو ماف خوراوو ماڵ دزراون بەمە نازانن و هونـەری قسە نـازانن بۆیـە بـەو شـێوە دەیانبینیـت تەحـەمولی ئـەو زوڵـم و زۆرە دەکـەن و قروقـەپ و بێـدەنگ لێـی دانیشتوون و بێدەنگن، ئەو نازانێت واتە (دیکتاتۆر ئاگای لەوە نیە) کە زوڵمیـان لێـدەکات و دەیـان چەوسـێنێتەوە چـونکە ئـەو لـەنێوان خـۆی و ئەوانــدا پەردەیــەکی ئەسـتوری (بەربەسـتێکی چـڕی) دانـاوە کـە ڕێگـری لـەو سـکاڵاو گلـەیی و گازەندانـە دەگرێـت کـە دەیانەوێت بچنە لای و بخرێنە بەردەمی.

دیکتـاتۆرو ملـهوڕەکان زۆرجـار پاداشـت و خـەڵات پێشکەشی ئـەو کەسـانە دەکـەن کـە قسەزان و ڕەوانبێژن و هونەری قسەکردن دەزانن، لەو نموونانەش وەك شاعیران و نوسەران و وتاربێژان، کە وایان لێکردووە دارو دیواری کۆشـك و سـەراکەی ڕازێنراوەتـەوە بـە سـرودی پیاهەڵدان و قەسیدەی نەمریی و ڕێزلێنان و شکۆداری.

کەواتــە دیکتــاتۆریش دەڕوانێــت بــۆ شــتەکان جیــاواز لــەو چوارچــێوەیەی کــە پیاهەڵخوێنەکان و دوو ڕووەکان و ماستاوچیەکان بۆیـان دانـاوە، ئـەوا بێگومـان ئـەو دەبێتـە دادپەروەر لەدیدی ئەواندا، چونکە حەساونەتەوە لەبەرهەمی زۆرو بـێ ئەنـدازەی ئـەو کـە پێی بەخشیوون بۆیە دەبینین مێژوو چیرۆکی زۆربەی ئەو دیکتاتۆرانەی تۆمارکردووە بـە دادپـەروەرو چـاکە خـوازو بەخـشندە نـاوی بـردوون و بـەپێتی درەوشـاوە نەخـشاندوونی لەنوسینەوەدا.

مێــژووش هــەر ئــەو نوســەرو فتوادەرانــە (وتاربێژانــە) نوسـیویانەتەوە کـە ئاغـای دیکتاتۆرو ملهوڕ نوقمیکردوون لـەنازو نیعمـەت و بەخـشندەیی خـۆی تـا بینـەقاقایان. ئـەو مێژونوسانە یان ئەو نوسەری دەربارانە کاتێ وەسفی دەکەن بەچاکەخوازو بەخشندە نـاوی دەبـەن، ئـەوا درۆیـان نـەکردووە چـونکە بەخـشندەیی و چـاکەخوازی و میهرەبـانی ئـەو حەقێکەو گەیشتووە بە ئەوان و بڕوایان پێهێناوە. هەموو کەسێکیش بـەزۆری شـتەکان بـە پێـوەری خـۆی دەیپێوێـت بـەو پێـوەرەی کـە لەدەروونیدایـە —لەسـەری ڕاهـاتووە- هـەروەك لەمەوپێش ئاماژەمان پێکرد.

بــەڵام ئــەو ڕەش و ڕووتــە زۆرو زەوەندانــەی وڵات، ئەوانــە کەمەینــەتی و دەردی سـەرییەکانی ئـەم (زاڵمـە دادپـەروەرە) دەچـێژن بەچەشـتن، چـونکە هەڵخەڵـەتێنراون

بەقسەی هاوڕێیانی خاوەن هۆنینەوە، لەبەرئەوە دەیانبینین وەك پەپولەیان لێ بەسەرهاتووە:

خۆیان فڕێ دەدەنە ناو ئاگرەوە بەبێ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن. ئەگەرهاتوو لەنێوان ئەم زۆرینە زوڵملێکراوەدا یەکێك ڕاستبوویەوەو توانی دەنگی هەڵبڕێت ئیتر ئایا بەشیعربێت یان بەپەخشان ئەوا خێرا دیکتاتۆری فەرمانڕەوا ڕای دەکێشێت بەلای خۆیداو نازو نیعمەتی بۆ ڕۆدەکاتو وای لێ دەکات ئەو زوڵمو زۆرەی لەبیر بچێتەوە کە وەختی خۆی لەگەڵ براکانیا دەیچێشت.

ئەگەر هاتوو ئەم کەسە ئەو نازو نیعمەتو بەخششانەی دیکتاتۆری فەرمانڕەوای ڕەتکردەوەو دایە دواوەو بە زمانی برا زەبوونو زوڵملێکراوەکانی دووا بەرامبەر دیکتاتۆر، ئەوا خێرا فتوادەرەکانی دیکتاتۆر (تاغوت) فتوای هەڵگەڕانەوە (زەندەقە) یان کافر یان ئاژاوەچیو دووبەرەکیو لەم جۆرە شتانە دەخەنەپاڵیو سەرکۆنەی دەکەن. ئالێرەوە ناکۆکی فیکری شێوەیەکی تر وەردەگرێت... زەمینەکان جموجوڵێکی تر دەستپێدەکەن بەرەو کودەتایەکی نوێ (هەڵگەڕانەوەیەکی تازەتر).

هەموو بزتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی لەسەرەتای دروستبوونیدا دادەنرێت بە هەڵگەڕانەوە یان دووبەرەکیو ئاژاوە...یان شێتی. ئەگەر ئەندامانی ئەو بزوتنەوەیە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا لەبانگەوازەکەیاندا ئەوا پاش ئەوە دەبنە پاڵەوانی ئەمری هەتاهەتایی.

بەڵام لەمیصر ئەوەی بینیمان لەسەرەتای رووخانی مەلیك فاروق دا (دوا مەلیکی میصر بوو)، هەرچەندە هەموومان مەدحو ستایشی ئەو مەلیکەمان لەسەر هەموو زمانەکان گوێ لێبوو بوو. بەڵام پاشان دەرکەوت ئەو فاروقە ماڵو سەروەتی گەلو نەتەوەکەی دزیووەو بەشێکی لەو دزێتییە دابەشکردووە بەسەر دەستوپێوەندەکانی ڕۆژنامەنوسو خاوەن قەڵەمەکانو زمان لوسو قسەزانەکاندا. بۆیە بەم کارەی ئێمەش دەمانبینی هەوڵی چاکەو پیاوەتیو سۆزو بەزەیی ودڵسۆزیی بڵاودەبوویەوە بە هەموو لایەکدا. بەڵام نەتەوەی ماڵو سەروەت دزراویش بواری ئەوەی پێ نەدرابوو خۆی بێتە گۆ چونکە ئەوانەی بەزمانی ئەمەوە قسەیان دەکرد لایەنگری مەلیکبوونو دابوویانە پاڵیو حەسابوونەوە لەو نازو نیعمەتەی کە بۆی دەستەبەرکردبوون.

ئەوانەی مەلیك فاروقیان ڕووخاند پاش ئەوە لەدیدی نەتەوەدا بوونە پاڵەوان- کە هەر ئەمانەش بوون پێش ئەوەی ئەم کارە ئەنجامبدەن هەڕەشەیان لێکرابوو بە ترسناکترین شێوەی مردن کە لەسێدارەدانە بەشێوەیەك هەر ئەمانەبوون پێیان دەگوتن ئاژاوەچیو لەڕێ لادەرەکانی فەرمانڕەواییو گوێڕایەڵی ڕەتکەرەوەی نیعمەتەکانی مەلیك فاروق.

مێژوو لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆشتووە لەهەموو چاخەکاندا، هیچ جیاوازییەك نییە لەمەدا لەنێوان چاخە زێڕینەکانو چاخە خەڵوزییەکان. هەرچەندە شتێکم دەخوێندەوە دەربارەی یەکێك لەمەلیکەکان (فەرمانڕەواکان) لەیەکێ لەچاخە زێڕینەکاندا ئەوا باسی ئەوەی دەکرد کە ئەو فەرمانڕەوایە دادپەروەربووە، لەخۆم پرسی: ئایا چەندێك لەخەڵکی ئەم دادپەروەرییە گرتبێتنیەوە؟ ئەگەر ئەوەی بینیم لەو دادپەروەرییە ئەوەبێت کە مێژوونوسان نوسیویانە، ئەوا تەنها چەند کەسێکی دیاریکراوی گرتۆتەوە ئەویش ئەوانەن کە کارامەو زمان لوسن لەقسەکردنداو سەرمڕای ئەوانەش کە سەلیقەو لێزانیان هەیە لەهونەری سەماو مۆسیقاو گۆرانیدا... خەڵکی ڕەشو ڕووتیش بێ بەشبوونە لەهەمووشتێك، خێرا ووتم: خوا ڕەحم بەگەلو نەتەوە بکات.

هەر چاخێك لەچاخەکانی مێژوو چاخێکی زێڕینە بۆ ئەوانەی کە خێرو بێریان لێدەست کەوتووەو خەڵوزیشە بۆ ئەوانەی کەبێبەری بوون لەهەموو شتێك و خێریان لێ نەدیووە. ئێستا هیچ نەماوەتەوە ئەوە نەبێت کە کێشانەیەك بکەین لەنێوان ژمارەی سوودمەندەکانو ناسودمەندەکانداو ئەو کاتە بڕیاربدەین بزانین پارسەنگی تەرازوو بەلای کامیاندا قورسە. لۆژیکی نوێ دانانێت بە بوونی چاکەی ڕەها یان دادپەروەری ڕەهادا — هەروەك لەمەوپێش کەوتە بەرچاومان- هەر مرۆڤێك لەڕوویەکی تایبەت بەخۆیەوە دەڕوانێت بۆ دادپەروەری یان چاکە یان لەچوارچێوەی فیکری خۆیەوە بۆی دەڕوانێت. ئەو کەسەشی کە بانگهێشتت دەکات بۆ خێرو چاکەی ڕەها ئەوە بزانە کە دەیەوێت فێڵت لێ بکاتو هەڵت خەڵەتێنێت.

وێنەی ئەم جۆرە بانگەوازو بانگهێشتانە لەڕاستیدا پروپاگەندەیە، تەنها دەهۆڵو زوڕنایەو هیچی تر (وەك کورد دەڵێ: دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە. و-کوردی)، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر ئەوانەی کە دەیانەوێت داهێنان ئەنجامبدەن لەزانست یان ئەدەبدا ئەوا بەزووترین کات دوورکەونەوە لەم ڕێچکە قوڕو لیتاویە.

جارێکیـان گوێمڕاگرتبـوو بـۆ وتوێـژێك لەئیزاعـەی رادیـۆی عێراقـدا کـە یـەکێ لـەو توشبووانە دەیخوێندەوە کە تووش بوو بوون بە دەردی نموونەی ڕەها بۆیـە بەلامـەوە وەك سەرابێك داهاتە پێش چاوم کە هەمووی قسەی پڕوپوچ بێت.

کێشەی ئەوانـە ئەوەیـە کـە ڕاهـاتوون لەسـەر ئـەو دیـدەیان بـۆ شـتەکان لەڕوانگـەی چوارچـێوە تەقلیدیەکـەوە کـە دەرنـاچـن لەتوێژینەوەکانیانـدا. ئەوانـە تـەڵقین دراوون بەهەنـدێ لەوتـە بـاق و بریقـەکان و راهـاتوون لەسـەر دووبارەکردنـەوەی و کاوێژکردنـەوەی بەبێ ئەوەی بتوانن چرکەیەك بوەسـتن بـۆ بیرکردنـەوە لـەڕێڕەوی ئـەم قسانەدا لـەڕووی کۆمەڵایەتییەوە.

لەنیشتمانی عەرەبیدا گیرۆدە بووینە بەدەستەیەك لەو ئەدیبانەی کە ڕۆچوونەتە نـاو ئەو شتەوە کە پێـی دەوترێـت ((ئـەدەب لـەپێناوی ئەدەبـدا)) لەبەرئـەوە دەیانبینیـت کە دابـڕاوون لـەواقیعی خـەڵك و هەڵکشاون بـە بورجـە عاجییەکانیانـداو سـروودە گۆشـەگیرو دەرکەنارەکانیان کە لەسـەری راهـاتوون دەزرنگێنـەوە، تـەنها یـەکێکیان تێدانییـە بتوانێـت وتارێـك بنوسـێت یـان گوتارێـك بخوێنێتـەوە تەنانـەت نابینیـت غـەزەلێکیان نوسـیبێت بـۆ ڕەنگی بەرەبەیان یان روناکی مانـگ، یان بـۆ سێبەری دارخورمـا یـان ڕۆشـتنی ڕووبـار. کە دەبینین هەندێکیان ئەم توانایەیان تێدانیەو کارامەنین بـەڵام دەیانبینیـت گـۆرانی دەڵێـت بە باڵای حوشترو بیابان و خێمەو گردۆلکەدا....

ئەمانـە بەهـەمان دووربـین دەڕوانـن بـۆ ژیـان کـە (زەبیـانی) لەپیاهەڵدانەکانیـدا پێـی دەڕوانی بۆ (نـەعمانی کـوڕی مـونزیر) یـان وەسـفی (بوحتـەری) بـۆ (متـەوەکیل). چونکە ئەمانە ژیان نـابینن تـەنها لەبـەر رۆشـنایی ئـەو پاداشـت و خەڵاتانـەدا نـەبێت کـە مـەلیك (فـەرمانڕەوا) پێیـان دەبەخـشێت یـان لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو کەنیزەکـە رازاوەو ناوقـەد باریکانەوە کە تاسولوس دراون و ئامادەکراون بۆیان.

زیادەڕەویمـان نـەکردووە ئەگـەر بڵێین ئـەدەبی عـەرەبی لەهەنـدێ تـەوەری مێـژووی نوسـینیدا توشـی پـەتای پیاهەڵـدان و وەسـف و سـەنای کرێگرتـە بـووە بەشـێوەیەك ئـەو پیاهەڵخوێنە پەخشاننوس بێت یـان شـاعیر بێـت ئـەوا بـە ئەدەبەکـەی توانیویـەتی هیـواو ئاواتـەکان بەدەسـتبێنێت و لێـی بحەسـێتەوە هـەروەك چـۆن کـەنیزەکێك بـەگۆرانی وتـن و چەقەنەلێدان و ناوقەد لەرانەوەی خۆی ئامانج و خۆزگەو مەبەستەکانی دێنێتـەدی و بـۆی

 

مەیسەر دەبێت. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانرێت ئەو ئەدەبە (وێژەیە) بە کەڵکی ژیانی دیموکراسی نوێ نایەت کە لەدووربینی هەژاران و ڕەش و ڕووت و بێ نەواو خێر نەدیوو و چەوساوەکانەوە سەیری دەکرێت.

جێگای داخە دەبینین قوتابخانەکانمان سیخناخە بەم ئەدەبە ئەرستۆکراتییە. کەچی دەبینین جیهانی پێشکەوتوو ئەدەبەکانی (ڤیکتۆرهۆگۆ) و (لیۆن تۆڵستۆی) و (ڤۆڵتێر) و (دستۆفسکی) و (بەرنادشۆ) دەخوێنن – ئەمە ئەو ئەدەبەیە کە دەربڕی ئێش و ژانەکانی بێنەوایان و هەژارانە، کەچی قوتابخانەکانی ئێمەش ئەو قەسیدەو شیعرانەی تیا دەخوێنرێت کە مەدح و سەنای ملهوڕو زاڵمان دەکات و گۆرانی بەباڵای کۆشک و تەلارەکانیان و کەنیزەکەکانیاندا دەڵێت و.... هەروەها دیسان بەلادانە سێکسیەکانیشیاندا هەڵدەخوێنێت.

لەکاتێکدا بێتو گەر شاکارە بەناوبانگەکانی ئەدەبی ڕۆژئاوا بگۆڕدرێنە سەر زمانە جیاوازەکانی تر ئەوا هیچ لەنرخیان کەم نابێتەوە مەگەر زۆر بەکەمی. لەبەرئەوەی ئەو جۆرە ئەدەبانە ئازادو سەربەستن و هەموو مرۆڤایەتی دەدوێنن لەهەموو شوێنێکداو نەبەستراونەتەوە بەکۆت و بەندە دەروونی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەکانەوە و کاریگەری بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان لەسەر نییە. هەر بۆیەشە دەیانبینین خۆشەویستن و لەهەموو دڵێکدا جێیان دەبێتەوەو بڵاودەبنەوە بەناو هەموو گەل و نەتەوەیەکدا.

بۆ نموونە ئێمە لەهەموو زمانێکدا چێژ لەئەدەبی (بەرنادشۆ) وەردەگرین. بەڵام کاتێك ئەدەبی (بوحتەری) وەربگێڕینە سەر زمانێکی دی ئەوا لەئەنجامی ئەم کارەماندا هیچ بەدەستناهێنین تەنها ڕوڕەشی و شەرمەزاری نەبێت.

وتراوە ئەدیبی عەبقەری ئەو کەسەیە کە نەهامەتییەکانی ملیۆنەها خەڵك لەدەروونیدا ڕەنگ دەداتەوە. ئەم وتەیە ڕاستە – بەڵام شایانی ئەوەیە شتێکی تری بۆ زیادکەین:- نەهامەتییەکانی ملیۆنان کەس بەس نیە بەپێچەوانەکردنەوە لەلاپەڕەکانی دەروونی عەبقەریدا هەروەك پیشاندانەوەی وێنەی شتەکان لەئاوێنەدا. بەڵکو دەبێ لەکاتی ڕۆچوون و قوڵبوونەوەی ئەو نەهامەتیانە لەدەروونی ئەو کەسە عەبقەرییەدا تێیدا بمێننەوەو دەست بەپیتاندن و کارلێکردن و هەڵهاتن بکەن (تخمر- کرداری گەنین هەروەك کارلێکی کیمیای چۆن دەست بە هەڵهاتن دەکات و پێدەگات بۆ نموونە لەسرکەی

 

ترشیاتدا ڕوودەدات كە ئەو كارلێكانە چۆن ڕوودەدەنو پاشان دەوترێت كە دوای چل شەو ئەو سركەیە پێگەیشتووەو ئامادەیە بۆ خواردن- و: كوردی) بۆئەوەی پاش ئەو ماوەیە بێنە دەرەوە لەشێوەیەكی جیاواز تر لەشێوەی یەكەمجاریان.

ئەدیبی غەبقەری تەنها بە تۆماركردنی ئەو واقیعەی كە وابووە داناكەوێت. بەڵكو ڕاشكاوانەترو ئازادانەتر دەگەڕێ بەدوای پێكهاتەكانو سەركەوتن لەنێوان مانا هەمەچەشنو فرە واتاكاندا بەشێوەیەك كە لەم كارەیدا شاكارە نەمرەكان دابهێنێت بە ناوەڕۆكی پوختو دڵفرێنەوە.

دەتوانین عەقڵی نادیار بچوێنین بە هاوشێوەی (كەمۆڵەیەك) بۆتەیەك كە تێیدا هەموو جۆرە جیاوازەكانی مادده كانزاییەكانی تێدا بتوێنینەوە بۆئەوەی لەپاش ئەو تواندنەوەو كارلێكردنانە كانزایەكمان بۆ دەربچێت لەجۆرێكی نوێ.



لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات كە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بابەتەكانی ئەم كتێبەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە: عەبقەرییەت چییە؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆر قورسە. چونكە تا ئێستاش توێژەرەوان بیروڕایان جیاوازە لەبابەتی عەبقەرییەتدا بە جیاوازییەكی زۆر توند. هەر توێژەرەوەیەك ڕاڤەیەكی تایبەتی هەیە بۆ عەبقەرییەت كە جیاوازە لەراڤەو لێكدانەوەی توێژەرەوەیەكی تر جائیتر ئەو جیاوازییە كەم بێت یان زۆر.

بەڵام ئەوانەی زۆرتر ئاوڕیانداوەتەوە لەحاڵەتی عەبقەرییەت ئەوانەن كە زۆرینەیان توێژینەوەیان كردووە لەم بابەتەداو توانیویانە كۆكبن لەسەر بوونی شتێكی هاوشێوە لەنێوان دەركەوتەكانی عەبقەریەتو دەركەوتەكانی شێتیدا, جێگای سەر سوڕمانە كە لێك نزیكی ئەم مانایە دەبینین لای زۆربەی گەلانی سەرەتاییو نەتەوە دێرینەكان [11].

فۆنەتیكی وشەی (عەبقەریەت) لەزمانی عەرەبیدا دراوەتە پاڵ (دەگەڕێتەوە) بۆ دۆڵی عەبقەر، كە عەرەبە جاهیلەكان لەو بڕوایەدابوون ئەو دۆ لە پڕیەتی لە(جنۆكە)، بەرامبەر بە فۆنەتیكی ئەم وشەیە لەئینگلیزیدا وشەی (جنیس) هەیە كە ئەمەش لەفۆنەتیكی وشەی (جنی) عەرەبییەوە وەرگیراوە بە پارسەنگی گومانەوە[12].

توێژینــەوە دەروونیــە تازەکـان ئامــاژە بــەوە دەکـەن کـە عەبقـەری کاتێـك داهێنانـە شاکارەکەی بەرهەمدێنێت هەست بـەخۆی ناکات، چونکە لـەو کاتـەدا دەچێتە حاڵەتێکی نـاوازەوە کـەوەك فـێ لێهـاتن‌و بورانــەوەو بـێ ئاگـایی وایـە[١٣]. هەنـدێ لەتوێـژەرەوان وای دەبینن: عەبقەری لەکاتی بەرهەمهێناندا خۆی دەگۆڕێت‌و دەچێتە قاڵبی کەسایەتییەکی تـرەوە کە جیـاوازە لـەو کەسـایەتییە ئاسایـیەی خـۆی‌و لەکاتێکیـشدا دەگەڕێتـەوە حاڵەتـە ئاساییەکەی خۆی سەری سوڕدەمێنێ لەو شاکارەی کە بەرهەمی هێنـاوەو بەلایـەوە سـەیرە کە چۆن توانیویەتی خودی خۆی ئەو شاکارە بەرهەمبهێنێت.

(کیـتس) ئـەدیبی ناسـراوی ئینگلیـزی دەڵێـت: لـەکاتی داهێنانـدا هەسـت بـەوە دەکـەم کەسێکی تر لەناخمدایەو ڕێنموویم دەکات، بەوەی کە دەرك بەجوانی ئەو بیرو بۆچوونانە ناکەم بۆم دێن تەنها پاش ئەوە نەبێت کە لێدەبمەوە لەنوسینیان.

(شـیللی) دەڵێـت: لەکاتێکـدا مێـشکم فریـو دەدرێـت بـە هەنـدێ بـیرو بۆچـوون هەسـت بەجۆش‌و خرۆشێك دەکەم لەو کاتەدا کە بـە هۆیـەوە وێنـەو تـەعبیرەکان بـە خێراییـەکی گەورەتر بەرهەمدەهێنم بە جۆرێك کە ناتوانم فریای نوسینی بکەوم لەسەر کاغەز[١٤].

بەهـەر حـاڵ ئەمـە بابەتێکـە دەگەڕێینـەوە سـەری لەبەشـی داهـاتوودا بەلێکۆڵینـەوەو قسەکردن لەبارەیـەوە بـەڵام ئـەوەی ئەمانـەوێت خوێنـەری لێ تێبگـات لێـرەدا ئەوەیـە کـە عەبقەریەت شتێکی وەك چوونەدەرەوە لـەخودی (زات)ی تێدایـەو چوونە ژوورەوەیـە بـۆ جیهانێکی ترو ئێستا مەداکەی نازانین بە زانینێکی تەواوو یەکلاکەرەوە.

ئـەوەش دادەنرێـت بـە جۆرێـك لـەجۆرەکانی شـێتی هەنـدێجار چـونکە خاوەنەکـەی دەچێتە دەرەوەی حاڵـەتی ئاسایی خـۆی‌و وایلێـدەکات بـۆ ژیـان بڕوانێـت بـە دووربینێکـی کونکەری کاریگەر کە پێشتر خەڵك پێی رانەهاتبێت.

لەواقیعـدا ئـەو کەسـەی پابەنـدو ڕۆچـووی چوارچێوە فیکرییەکـەی خۆیـەتی‌و چـەق بەسـتوی ئـەو دەق پێوەگرتنەیـە کـە لەسـەری راهـاتووە لەپێکهاتـە کۆمەڵایـەتی‌و شارستانییەکان، ئەوا زەحمەتە ئەو کەسە ببێتە داهێنەر یان عەبقەری.

چوارچێوەی فیکری هەروەك باسمانکرد پێکاهاتووە لـەگرێ دەروونیـەکان‌و دابونەریتـە کۆمەڵایەتییـەکان‌و ئاکـارە شارسـتانییەکان، ئەمـەش دادەنرێـت بەهاوشـێوەی ئـەو ڕێگـرو بەربەستانەی کە دێنە ڕێگای داهێنانی ئازاد.

زۆرجـاران عەبقــەری پێکــەنینی دێــت بــەخۆیو بەکۆمەڵەکــەیو جاروبــار شــەرم لەشتەکانیش ناکات[١٥].

چونکە ئەو رزگاری بووە لەو کۆتو بەندانـەی کـە خـەڵکانی تـر پێـوەی گیرۆدەنو هەمیـشە تـەوقی گەردنیانـە، ئـەو باڵندەیـەکی ئـازادەو لەکـەشو هەوایەکدا دەفرێـت کـە لەتوانایدایە ئەوەی دەیەوێت ببینێت بە شێوەیەك خۆ بەزانازانـەکانو ژێـر بارخراوەکـان نایبینـن.

لەمبارەیەوە بۆمان هەیـە بڵێین: هێـزە دەروونیـە کاریگـەرەکان هەڵدەقوڵێن لـەقوڵایی دەروونــە عەبقەرییەکانــەوە بــە هــەڵقوڵانێکی رەهــاو ئــەوەی لەســەر دەســتی عەبقەریــدا بەرهەم دێت، ئەوا دوو ڕووەکانو توندڕەوەکانو لاساییکەرەوەکان ناتوانن بەرهەمی بێنن.



سـێ گـەورە فەیلەسـوفی مـۆدێرن توێژینــەوەیانکردووە لـەبواری عەبقەریەتـداو تێیـدا گەیـشتوونەتە ئـەنجامێك لەوانەیـە ـهاوشـێوەی یـەك بـن هەرسـێکیان ئـەویش ئەوەیـە کـە دەڵێ: ((عەبقەریەت چوونە دەرەوەیە لەخودو نقوومبوونـە لـەجیهانێکی بـەرزو بڵنـدترو فراوانتردا)).

ئـەو سـێ فەیلەسـوفەش ئەمانــەن: (شـۆپنهاوەر)ی ئـەڵمانیو (برجـسۆن)ی فەرەنـسیو (توینبی)ی ئینگلیزییە.

بـەڵام (شـۆپنهاوەر) لـەو بڕوایەدایـە کـە عەبقـەری جیـاوازە لەکەسـێکی ئاسـایی تـەنها لەیەك شتدا ئەویش بریتییە لەکەمی پابەندبوون بەوەی کە هەموو خەڵکانی تر پابەنـدن پێـوەی لـەداکۆکیکردن لـەپێناوی ژیانـداو نـاکۆکی لەسـەر مانـەوە. ئیرادەی ژیـان لەدیـدی (شـۆپنهاوەر)دا پاڵپێوەنــەری بنەڕەتییــە کــە پــاڵ بــە کەســێکی ئاســاییەوە دەنێــت بــۆ کاروبارەکان تەنها لەڕوانگەی ئەو ئیرادەیەوە نەبێت. بەڵام عەبقەری ئەو کەسەیە کە لەوە باڵاترەو هەوڵدەدات لەژیان تێبگات لەسەر بنەمایەکی بابەتیانەی پوخت.

(شـۆپنهاوەر) دەڵێـت: عەبقەریـەت بابـەتیبوونێکی پوختـە لـەفیکردا. هـەروەها ئـەو هێزەیـە کـە خاوەنەکـەی والێـدەکات بەرژەوەنـدیو ئـارەزوو ئامانجـەکانی خـۆی پـشتگوێ بخـات... کەسـایەتی خـۆی تـەرخان دەکـات بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو بەشـێوەیەك بتوانێـت

 

بیکاتە ئامێرێکی پاڵفتە بۆ زانینو تێڕاوانین لەبوونەوەر بەڕوانینێکی پوختو پاڵفتە. زانینو زانیاری (مەعریفە) لەناو هەموو خەڵکیدا ملکەچە بۆ ویستو ئیرادەی ژیان کە ئەوەش هەمیشە رێچکەی گرتووە لەپێناوی بەرژەوەندی تاکە کەسیو سودو کەڵکی تایبەتیدا. بەڵام لای عەبقەری مەعریفە ئەوەیە کە ژیان لەسەری دەڕوات (ژیان پیادە دەکات)[١٦].

(شۆپنهاوەر) وای دەبینێت ئەمەیە بۆتە هۆکاری ئەوەی کە وایکردووە لەخەڵك لەعەبقەری تێنەگەنو ئەویش لەوان تێنەگات. چونکە عەبقەری دەڕوا بەرێداو سەیری ئاسمان دەکاتو لەپڕ دەکەوێتە ناو چاڵەوە. هەرچەندە مرۆڤ زیاتر کۆمەڵایەتی بێت بە بیروڕای (شۆپنهاوەر) کەمتر عەبقەریەو زیاتر ملکەچە.

ئافرەت لەدیدی (شۆپنهاوەر)دا هەندێجار دەتوانێت هێزو توانای چاك وەدەستبێنێت بەڵام ناتوانێت ببێتە کەسێکی عەبقەری چونکە لەتوانایدا نیە لەخودی خۆی بچێتە دەرەوە، لەبەرئەوەی روانین بۆ کاروبارەکان لەدیدی ئەودا لەبواری سۆزداریو ئارەزووە کەسایەتییەکانیەوەیەتی[١٧].

(برجسۆن)یش لەراڤەکردنەکەیدا بۆ عەبقەریەت بەلای راڤەکردنەکەی (شۆپنهاوەر)دا دەڕواتو نزیکە لێوەی. بۆیە دەڵێت: مرۆڤ هەر لەسروشتی خۆیدا ئارەزووەی لەرەزامەندی ئەو کۆمەڵەیە کە ئەم لایەنگریان دەکات. بەڵام عەبقەری هەست بەوە دەکات کە لایەنگیری لەهەموو گرۆهی مرۆڤایەتی دەکات بۆیە لەم کارەدا سنوری ئەو کۆمەڵگایە دەبەزێنێت کە تێیدا گەورە بووەو پێگەیشتووەو شۆرشێك بەرپا دەکات بەڕووی ئەو دابونەریتەشدا کە پاڵپشتیو کۆمەکی کیانەکەی دەکات. چونکە عەبقەری هەموو مرۆڤایەتی دەدوێنێت بە زمانێك لەخۆشەویستی، هەروەکو ئەوەی بڵێیت ئەمە مرۆڤێکی تازە بابەتە[١٨].

(برجسۆن) لەو بڕوایەدایە عەبقەری ئارەزوویەکی سۆفیگەرێتی تێدایە، ئەوەش لەکاتێکدایە کە نقووم دەبێت لەساتەوەختی داهێنانداو لەهۆش خۆی دادەبڕێتو دەچێتە ئەو شێوە لێکچوونەی (وەجد)ی سۆفیەوە.

یان دەچێتە (غەیبوبە)وە، واتە ئاگای لەخۆی نامێنێت. ئەو لەو کاتەدا یەکدەگرێت لەگەڵ لێشاوە دەرپەڕیوە زیندووە گەورەکاندا کە بوونەوەر (کەون) ئاراستەدەکەنو

 

لەحەقیقەتێکی ڕەهاوە تێی دەڕوانێت کە ئەوانی تر ناتوانن تێی بڕوانن‌و ببینن، ئەوانەی وا ڕۆچوونەتە ناو خەیاڵات‌و ئەندێشە بەرتەسك‌و سنوردارەکانیانانەوە.

پاشان (توینبی) دێت‌و هاودەنگ‌و تەبایە لەگەڵ (برجسۆن)دا لەسەر ئەوەی کە وتوویەتی‌و ڕەزامەندی تەواوی خۆی بۆ پیشان دەدات بەوەی کە ئەمیش دەبینێت: عەبقەریەت برتییە لەهۆکاری پێشکەوتن‌و پەرەپێدان لەشارستانێتییەکانی مرۆڤایەتیدا. کەسی ئاسایی لەدیدی (توینبی)دا پارێزگارێکی چەق بەستووەو حەزی لەمانەوەیە لەسەر داب‌و نەریتە میراتییەکان کە بۆی ماوەتەوە، بەڵام عەبقەری لەمەدا پێچەوانەیەتی‌و حەزی لەداهێنان‌و شۆڕشە بەسەر دابونەریتەکاندا. عەبقەری هەست بەوە دەکات کە پەیامێکی پێیەو بەزۆری حەز دەکات لەپێناوی ئەو پەیامەدا تیا چێت، بەشێوەیەك وەك ئەو عاشقە دڵدارەی لێهاتووە کە لەدنیادا هیچ شتێك نازانێت‌و ناناسێت تەنها خۆشەویستەکەی نەبێت، چونکە ئەم بێزارە لەدەستوورو یاسا کۆمەڵایەتییەکان‌و هەڕەشەیان لێ دەکات‌و دەیەوێت بیانگۆڕێت لەبارێکەوە بۆ بارێکی ترو لەم پێناوەشدا گوێ ناداتە ئەوەی هیچ بەدەستبێنێت یان بەدەستی نەهێنێت لەسوودو قازانجی تاکە کەسی.

(توینبی) لەو بڕوایەدایە کە هەموو خەڵك بەگشتی مەزاج‌و ئاستی بیرکردنەوەیان چوونیەکە ئیتر هەر چۆنێك بن‌و لەهەر شێوازێکدابن- لەوانەیە پێشکەوتوو شارستانییەکانبن یان بە پێچەوانەوە دواکەوتوو ناشارستانییەکانبن- هەموویان بەشدارن. ئەمەش بەو مانایە دێت: بۆ نموونە پیاوێکی سەرجادە لەئەوروپا جیاوازی نیە لەسروشتی بیرکردنەوەیدا لەگەڵ پیاوێکی سەرجادە لەئەفەریقا یان ئاسیا[19].

هەردووکیان ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی باوەڕ بە ئەفسانە بکەن‌و بەرەوپیری بچن بەخۆش باوەڕییەوە.

ئەو جیاوازییەی کە پێشکەوتووەکانی پێ جیادەکرێتەوە لەسەرەتاییەکان بریتییە لەدەرکەوتنی زۆرینەی عەبقەرییەکان لەپێشکەوتووەکانداو کەمینەیەك لەسەرەتاییەکاندا. مەدەنی‌و پێشکەوتووەکان ماوە دەدەن بە عەبقەری کە ئەوەی لەتوانایدایە بیڵێت‌و ئەوەی حەزی لێدەکات‌و ئارەزووی لێیە داهێنانی تێدابکات. بەڵام لەنێوان سەرەتاییەکان (بەراییەکان)و دواکەوتووەکاندا نوێخواز تازەگەر قوڕمیش دەکرێت‌و ڕادەگیرێت، هەر کەسێکیش هەڵکەوێت داهێنانێك ئەنجامبدا ئەوا پێشوازیان

لێكـردووه بـه بەرهنگاربوونـەوەو گاڵتـەپێكردنیو سـزادانی، كـەس لەناويانـدا سـەركەوتن بەدەست ناهێنێت تەنها چەقبەستووە سەنگینو سەلارەكان نەبێت ئەوانـەی كـه ركابـەریو شانازی دەكەن بەو برِو هێندەی كه یەكێكیان بەدەستی دێنێت لەئـەنجامی وابەسـتەبوونو دەستگرتن بەدابونەریته بۆ ماوەیيه بەجێماوەكانو ئاكاره كۆمەلايەتییەكانەوە.

بەڕای (توینبی) پێشكەوتووەكان بەرێزگرتنو سەر سورِمانەوە ڕوودەكەنـه دۆزەرەوانو داهێنــەرانو عەبقەریــەكان، بــەلام دواكــەوتووەكان ڕوودەكەنــه كۆنــەپارێزو لاســایی كەرەوەكان. لێرەدا جیاوازی تەنها لەئاراستەی ڕێزدايه نەك لەجۆرەكەی. ئـەم جیاوازیـەش لەئاراسـتەی ڕێــزدا دەبێتــه هــۆی بــەديهێنانی ئــەو جیاوازیــه گەورەیــه كــه لەرِواڵــەتی شارستانێتیدايه[٢٠].



## پوختەی بەشی یەكەم

عــەقڵی مرۆڤایــەتی لەسروشــتی پێكهاتنیــدا لایــەنگیره، كەســێكی ئاســایی ناتوانێــت لەبیركردنەوەیدا دوورەپەرێزبێت هەرچەنده هـەوڵیش بـدات، چونكه ئـەو كۆتوبەندانـەی كـه بـیرو بۆچـوونی كـۆت دەكـەن چـێنراوون لـەقولایی نـاخی عـەقڵی نادياريـدا (عـەقڵی ناوەوەيدا). عەبقەریش ئەو مرۆڤه ناوازەیـه كـه دەتوانێـت بـەرزو بـالاتر بێـت لـەو كەسـه ئاساییەو بسوڕێتەوە لەئاسمانی داهێنانو دەستنیشانكردندا.

لەم سەرزەمینەدا عەقڵێك نابینین كه داماڵرابێت لەكۆتو بەنده فیكرییەكان به مانای داماڵینی تـەواو، دەگونجـێ لەگـەڵ ئەمەشـدا بڵـێین: هەرچـەندێك عـەقڵێك لەعەقڵـەكان داماڵینی تیا بەدیكرا بەتەواوی ئەوا هێزو توانای بەسەر داهێناندا زیاترو گـەورەتردەبێت. كەواته عەبقەرییەكان بەخشندەدەبن بەرێژەی ئەو ئازادییەی بەدەستی دێنن لەچوارچێوە فیكرییەكەیان جا نـیتر كـەم بێـت يـان زۆر. بەڕاسـتی داماڵینی ڕەها نەسـتەمه، هـەروەها عەبقەرییەتی كاملو تەواویش نایەتەدی.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

١. بڕوانە: Tyrrell,op.cit. p.٢٦٦.

٢. بڕوانە: يعقوب صروف، سائل الارواح، ص٢٩.

٣. بڕوانە: وليم جيمس، اداره الأعتقاد (ترجمه د. محمود حب الله)ص٤٠.

٤. بڕوانە هەمان سەرچاوە.

٥. بڕوانە: Thomas, The Living worlds of philo sophu.

٦. بڕوانە : کتێبی بەناوبانگ: Mannheim, Ideology and utopia.

٧. بڕوانە: يعقوب قام، البراجماتيزم أو فلسفة الذرائع.

٨. دەگێڕنەوە: خەلیفە هاڕونە ڕەشید سێ هەزار کەنیزەکی (جاریە)ی هەبووەو هەروەها موتەوەکیل چوار هەزار کەنیزەکی هەبووە.

٩. ئەم چینە نوێنەرایەتی پاشماوەکانی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان لەعێراقدا دەکەن، من لەو بڕوایەدام ئەم چینە کاریگەری هەبووە لەسەر پێکهاتەی بیری سیاسیو ڕۆشنبیری لەعێراقی نوێدا بە کاریگەری گەورە.

١٠. بڕوانە: Leys, Ethics and Social palicy, p. ٢٥٨ .

١١. بڕوانە: Encyclopedia of Social Sciences, art. genius .

١٢. بڕوانە: Encyclopedia Britanied, art. Genius.

١٣. بڕوانە: Harding, An Anatomy Of Inspiration.

١٤. بڕوانە: Tyrell, op. cit. p. ٣١.

١٥. (جانجاك ڕۆسۆ) دان بەوەدا دەنێت بەڕاشکاوانە کە چۆن مامۆستاکەی لەگەڵیدا خەریکبووە بەنێرباز ی لەسەرەتای مێردمنداڵیدا.

١٦. بڕوانە: Durant, the story of philosophy .p.٢٥٢.

١٧. هەندێ لەزانایانی دەروونناسیو کۆمەڵناسی پشتگیری ئەم رایە دەکەن سەبارەت بەئافرەت بەڵام خودێتی ئافرەت یان سۆزدارییەکەی شێتەڵدەکەن بەوەی کە چوارچێوە فیکرییەکەی بەرتەسکە لەسەر ئەو ئیعتبارەی کە عەقڵ لەدایکبووی چوارچێوەی کۆمەڵایەتییە.

١٨. بڕوانە: Toynbee, Astudy of History(abridged) p.٢١٢.

١٩. زۆر بەرِوونی سەرنجی ئەمەمەداوە لەكاتی گەرِانمدا لەئەوروپاو ئەمریكا. بۆ نموونە بەقاڵێك لەنیۆیۆرك جیاناكرێتەوە لەپێكهاتەی عەقڵییەتیدا لەگەڵ بەقاڵێك لەبەغدا یان لە(قەرمتەپە) یان لە(تلكیف). بەڵكو جیاوازییەكە لەنێوانیاندا ئەگەر هەبێت ئەوەیە یەكێكیان لەئیش و كارەكانیدا ئەو داهێنان و ئامێرە وردەكارانە بەكاردێنێت كە ئەو هیچ دەستێكی لەداهێنانیدانیە، لەكاتێكدا بەقاڵەكەی تر هیچ شتێك لەو ئامێرە وردانە بەكارناهێنێت مەگەر زۆر بەدەگمەن. كەوتە جیاوازییەكە لێرەدا شارستانییە نەك تاكە كەسی. هەریەكەشیان بگری دەستكردی ئەو شارستانێتیەیە كە تێیدا دەژی.

٢٠. Toynbee.op. cit. p.٢١٦.

 

بەشی دووەم

# لۆژیکی ئەرستۆتالیسی

زۆربەی خوێندەوارەکان باس لەلۆژیك دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەناوەڕۆکی بزانن. ئەوان لەبارەی قسەکانی یەکێکیانەوە دەڵێن لۆژیکییەو لەقسەکانی یەکێکی تردا نا لۆژیکییە، ئەگەر پرسیاریان لێبکەیت: بۆچی؟ ئەوا سەریان دەخورێنن و واقیان وڕدەمێنێت بەبێ وەڵام.

لەپێناسەی لۆژیکدا وتراوە: بریتییە لەزانستی ئەو یاسایانەی کە زیهن دەپارێزێت لەهەڵەنەکردن لەبیرکردنەوەدا. دووبارە بە (تەرازووش) ناوزەدکراوە لەسەر ئەو پێودانگەی وەك تەرازوو بیرو بۆچوونەکانی پێدەکێشرێت و راستی لەهەڵە پێ جیادەکرێتەوە.

پێشینان هیچیان نەدەزانی تەنها یەك لۆژیك نەبێت ئەوەش لۆژیکی ئەرستۆتالیسە. ئەم لۆژیکەش بووە بەسەرچاوەی بیرمەندان و رووناکبیران لەهەموو چاخەکاندا، بەشێوەیەك لەو بڕوایەدابوون کە ئەمە لۆژیکێکی گشتی و نەمرەو نابێت گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی تێدابکرێت. (کانت) دەڵێت: ((هەر لەسەردەمی رۆژانی ئەرستۆوە تا ئێستا لۆژیك تەنها هەنگاوێکی نەهاویشتووە نەبۆ دواوەو نەبۆ پێشەوە، لەبەرئەوە دادەنرێت بە کامڵ و تەواو لەسەر ئەو شێوەیەی کە دەردەکەوێت))[1].

بۆیە بیریارە موسڵمانەکان ئەم لۆژیکەیان وەرگرتووەو خۆیان پێوە هەڵکێشاوەو پێوەی بوغرابوون بە بوغرابوونێکی گەورەو تەنانەت هەندێکیان زیاد لەپێویستیان پێوەناوەو نەمرییان بە باڵا بڕیووەو نزیکیانکردۆتەوە لەگەورەییدا لەقسەکانی خواوەندو بە تەواوکەری ئەویانداناوە[2].

ئەم لۆژیكە تا ئێستاش لەزۆربەی خوێندگا ئاینیەكانماندا دەخوێنرێت. دادەنرێت بە كۆی زانستە بنەرەتیەكان كە شایانی ئەوەیە پیاوی ئایینی ڕەوانی كات بۆئەوەی بتوانێت لەوەعزو ئیرشادی خەڵكو مشتومڕی بەرامبەرەكەیدا بەكاری بێنێت.

ئەم لۆژیكە بنجی داكوتاوە لەقولایی عەقڵماندا بەشێوەیەكی وا ئالوودەی كاریگەریەكەی بووین كە بۆتە كاریگەری نەستی (ناهەستی) تیاماندا. زۆربەمان بنەماكانی لۆژیكمان نەخوێندووە لەژیانماندا بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لەبیركردنەوەماندا لەسەر هەمان ڕێچكە دەڕۆین كە لۆژیكی ئەرستۆتالیس لەسەری دەڕوات. ئەمەش دەرهاویشتەی كاریگەریی ئەو كەش‌و هەوا فیكریە گشتییەیە كە لەسەر زیهنمانە، ئێمە هەر لەسەردەمی منالیمانەوە گوێمان رادەگرت لەگەورەكان كە وتوێژیان دەكردو دەمیان نوسی‌و ئاخاوتنیان دەكرد لەسەر شێوازێكی دیاریكراو، بۆیە ئەو شێوازە چەسپدەبوو لەعەقڵی ناديارماندا (ناوەوەماندا)، ئیتر پێوەی كاریگەر دەبووین بە درێژایی ژیانمان بەجۆرێك هەستی پێبكەین یان هەستی پێ نەكەین).

ئەو تەوەرەش كە لۆژیكی ئەرستۆی بەدەوردا دەسوڕێتەوە ناودەبرێت بە پێوەر (Syllogism). ئەم پێوەرانەش زنجیرەیەكە لەزنجیرە یەك لەدوای یەكەكان لەدیارەوە بۆ نادیار (لەزانراوەوە بۆ نەزانراو)، یان لەسەر ئاستی دەربڕینی ژیربێژی زانەكان.

(لۆژیك زانەكان): لەپێشەكییەكانەوە بۆ ئەنجامەكان، بەپێی بنەماكان یان مەرجەكان گونجاندوویانە. هەروەك چۆن لەپەندێكی بەناوبانگیدا دەڵێن: هەموو مرۆڤێك نامێنێت‌و لەناودەچێت (دەمرێت)، سوقراتیش مرۆڤە، كەواتە سوقراتیش لەناو دەچێت‌و دەمرێت. ئەم شێوازە لەپلەكاریدا بۆ بیركردنەوە ئەو مۆركەیە كە لۆژیكی ئەرستۆی پێ جیادەكرێتەوە.

ئەمەش ئەو شێوازەیە كە باڵی كێشاوە بەسەر زۆربەی مشتومڕو گفتوگۆكانماندا‌و بلاوبۆتەوە بە بلاوبوونەوەیەكی بێ شومار لەژینگە ئاینییەكانماندا. تۆ ناتوانیت وتوێژ بكەیت لەگەڵ یەكێكیاندا ئەوا خێرا ئەم پێوەرە لۆژیكییە حاشا هەڵنەگرە دەدات بەڕووتدا.

★ ★ ★

کێشەیەك لەکێشەکانی لۆژیکی ئەرستۆ ئەوەیە نمایشی واقیعی ژیان ناکات، بۆیە دەشێ ناوی لێ بنێین بە لۆژیکی بورجی عاجی، راستیو دروستی ئەم ناولێنانەشمان کاتێك بۆ رووندەبێتەوە ئەگەر لێکۆڵینەوەمان لەمێژووی ئەم لۆژیکەدا ئەنجامداو بەو بارودۆخە فیکریو کۆمەلایەتییە هەلمان سەنگاند کە دەوری یەکەمین سەرهەلدانو گەشەکردنی داوە.

لەسەردەمی ئیغریقییە کۆنەکاندا گروپێك پەیدابووبوون لەمامۆستایانی گەرۆك ناویان لێ نابوون (سۆفیستەکان- سەفسەتاییەکان) یان حەکیمەکان. ئەمانە پیشەیان ئەوەبوو خەلکیان فێری هونەری قسەکردن دەکرد. لەو سەردەمەدا هونەری قسەکردن گالتەی پێ ناکرێت ئەگەر لەو دیدەوە بۆی بروانین کە فەرمانڕەوایی ئیغریقییەکان تا رادەیەك هۆکارەکانی شێوە دیموکراتییەکی دەستەبەرکردبوو بۆ ئەنجامدانی سەلیقەو شارەزاییو جەوهەری ڕا دەربڕین.

سۆفسیتەکان ئەم فەلسەفەیەیان هێنایەئاراوە: حەقیقەت نیسبیەو رەها نییەو پێوەری حەقیقەتیش مرۆڤە بە هەموو بەرژەوەندیو ئارەزووبازیو حەزەکانیەوە. لەبەرئەوە خەلکیان فێردەکرد بەکرێیەکی دیاریکراو تا فێری هونەری قەناعەت پێکردنو سەلماندنی بەلگارییان بکەن. بەگوێرەی ئەو دەرکەوتەیەی ئەوان مادام مرۆڤ سەرچاوەی حەقیقەتبێتو حەقیقەتیش لەگۆڕاندا بێت بە گۆڕانی بەرژەوەندیو ڕالێبوونو ئارەزووبازیە شەهوانییەکانی مرۆڤ کەواتە دەبێت گرنگی بدرێت بە تاكو تاك شایانی ئەوەبێت (لەدیدی ئەواندا- واتە سۆفیستەکان) کە سەلیقەی هونەری قەناعەتکردنی تیا بێت بۆئەوەی بتوانێت کەسانی تر بەلای خۆیدا راکێشێت لەبواری وتوێژو رکابەری بەرامبەریدا، یان کاربکاتە سەر فەرمانڕەواکان بۆئەوەی بەپێی داواکارییەکانی بەرژەوەندی تایبەتی ئەو حوکم بکەن.

ئەوەی بەدیدەکرێت ئەوەیە کە سۆفیستەکان لەم کارەیاندا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێناوە. پیشەکەیان رەواجی پەیداکردووەو فەلسەفەکەشیان بلاوبۆتەوە. لەوانەشە کاریگەریان هەبووبێت بۆ سەر عەقلە تازە پێگەیشتووەکان بە کاریگەرییەکی ناشایستەو لەئەنجامیشدا ئەو جۆرە عەقلانە بەڕوویاندا هەلگەڕاونەتەوە لەشێوەی پیاوێکی

جەربـەزەو تونـدڕەودا، بەشێوەیەك (دژایـەتیکردنو زاڵبـوون بەسـەر فەلـسەفەکەیاندا)ی گرتە ئەستۆی خۆی. ئەو پیاوەش سوقرات بوو.

دەگێڕنەوە گوایە سوقرات هەروەك ئەوان لەسۆفیستەکان بووە بـەڵام لێیـان جیابۆتـەوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەم بانگهێشت کـراوەو سروشـی(وەحـی) بـۆ هاتۆتـە خـوارەوە بـە پـەیامێکی پـیرۆزو داوایلێکـراوە ئـەرکی سەرشـانی بـەجێبێنێت بـۆ رزگـاکردنی جیهـان لەوەیشوومەی فەلسەفەی سۆفیستەکان.

سوقرات لەسەر پەیامەکەی مایەوەو موژدەی دەبەخشییە خەڵك بە پەیامەکەی لەسـەر شەقامو لەناهەنگەکانداو لەناو بازاڕو...هەتا کارەکەی کۆتـایی پـێ هـاتو بڕیـاری مردنیـان بەسەریدا سـەپاند هـەروەك زانـراوە لەمێـژوودا. پاشـان قوتابییەکـەی (ئـەفلاتوون) شـوێن پێـی هـەلگرتو بـەردەوام بـوو لەسـەر تـەواوکردنی پەیامەکـەی. بـەڵام ئـەم بوارەکـەی گوێزایەوە لەشەقامەوە بۆ ژووری دەرس خوێنـدنو لەوتوێـژی زارەکییـەوە بـۆ لاپـەڕەکانی کتێـب. پـاش مردنـی ئـەفلاتوون مەشخەڵی فەلـسەفەکە درایـە دەسـت (ئەرسـتۆ تـالیس)و روناکی دایەوەو تا وای لێهات لەدواجاردا نازناوی (یەکەمین مامۆستا)ی بڕا بەسەردا.

ئەمـە بـۆ (ئەرسـتۆ) گرنگییـەکی گەورەیـە لەمێـژووی بـیری مرۆڤایەتیـدا. چـونکە یەکـەمین بەخششی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەرسـتۆ لەداڕشـتنەوەی سـەرلەنوێی ئـەم لۆژیکـەو ناسراو بەناوی خۆیەوەو دانانی لەقاڵبێکی یەکجارەکیو کۆتاییدا. ئەم لۆژیکـەی وا ئەرسـتۆ دایڕشـتەوە گـورزێکی کوشـندەبوو لەسـەر بزوتنـەوەی سۆفیـستەکانو سـەرکەوتنێکی بـێ وێنـەش بـوو بـۆ ئـەو فەلـسەفەیەی کـە بـڕوای بـە حەقیقـەتی ڕەهـا هەیـەو لەهەمانکاتـدا بڕواشـی بـەهێزو توانـای عـەقڵی مرۆیـی هەیـە لەسـەر دۆزینـەوەو تێڕوانینـی. بـەڵام سۆفیـستەکان لەبەرامبەریـدا چـۆکیانداداو زۆر بـە خراپـی تێکـشکان، بەشـێوەیەکی وا هەڵوەشانو رزاڵڕزاڵبوون ئیتر دوای ئەوە ناویان لەهیچ لیستێکدا نە نەکەوتە پـێش چـاو ( وەك کورد ئەڵێ: ناویان چوو بە کۆرەگەی ئاشا. وـکوردی).

لۆژیکی ئەرستۆ سەرکەوت بەسەر کەوتنێکی یەکلاکەرەوەو خەڵکی بەسـەر سوڕمانەوە وەریاندەگرت لەهەموو ڕووەکانەوە. وە نازناوی (سەفسەتە) یان (سۆفیـستەکان)یـش لـەوەو پاش بوویە شورەیی و خەشمو هیچ بیریارێك نەیدەویست ئەو شورەییە لەئەستۆ بگرێت.

لەوانەیە زیادەڕەوی نەبێت ئەگەر وتمان: سەرکەوتنی لۆژیکی ئەرستۆو لەناوچوونی سەفسەتە یەکێ بوو لەبەخت ڕەشییەکانی مرۆڤایەتی. سەفسەتە، هەروەك لەبەشی رابردوودا ئاماژەکان پێدا، فەلسەفەیەکە خاڵی نییە لەڕاستیو حەقیقەت، چونکە ئەو ڕوویەکی نمایش دەکرد خراپ نەبوو بۆ حەقیقەتی بوونەوەر(کەون).

حەقیقەت هەروەك (مانهایم)دەڵێت: ڕێژەییو ڕەهایە لەیەك کاتدا یان بەدەربڕینێکی تر بریتییە لە: خودیو بابەتی پێکەوە. ئەمەو بەڵام سەرکەوتنی لۆژیکی ئەرستۆ وای لەبیریارانکرد خۆیان سەرقاڵکەن تەنها بەوەوە کە لەیەك لایەنەوە بڕواننە حەقیقەت، ئەوەش لایەنی ڕەهایە. بەمەش لایەنەکەی تریان پشتگوێ دەخست کە هیچی کەمتر نییە لەو لایەنەی تر لەسوودو گرنگیدا.

دەشێ بڵێین لۆژیکی ئەرستۆ هۆکارێکی گرنگبوو لەدابڕینی بیریاران بوو لەخەڵکە ڕەشوڕووتەکە، هەرئەوەش بوو خەڵکەکەی دابەشکرد بەسەر دوو چیندا لەڕووی بیرکردنەوەوە: چینێکیان ئەوانەبوون هەڵزنان بە بورجە عاجییەکەیانداو چێژیان لەو تێڕامانە وەردەگرت کە لەحەقیقەتی راهادایە، چینەکەی تریشیان کەوتنە بەر شەپۆلی لافاوی ژیانو ئەیانەوێت ئاسوودەبن بە گۆڕانی حەقیقەتەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ.

لەئەنجامی کارتێکردنی ئەم لۆژیکە پیاوی بیرمەند (فەیلەسوف) وای لێهات بەسوك سەیری پیاوی کاری دەکردو رقی لێی بوو، هەروەها وای لێکرد کە دوو ڕوو بێت لەڕێگای ژیانو شێوازی بیرکردنەوەیدا. ئەو بەرزدەبوویەوە بۆ هەورەکانو لەوێدا کۆشكو تەلاری بۆ خۆی بنیات دەنا. هەرئەویش بوو لەتەنگو چەڵەمەکانی ژیان تێنەدەگەیشتو نەشی دەویست بیریان لێبکاتەوە، چونکە ئەو تەنگو چەڵەمانەی بەسوكو بێبایەخو کاتی دادەناو نەیدەبەستنەوە بە حەقیقەتی ڕەهاوە، بەوە دەیدانە قەڵەم کە ناگونجێن لەگەڵ سروشتی بیرکردنەوەی راستودروستدا.

ئەوەی مێژووی زانستە جۆراوجۆرەکانی خوێندبێتەوە ئەوا سەری سوڕدەمێنێت کاتێ دەبینێت زانستە کۆمەڵایەتییەکان لەم دواییانەدا سەریانهەڵداوە لەچاو زانستە سروشتییەکاندا. لەواقیعدا لەگرنگترین هۆکارەکانی دواخستنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بریتییە لەبڵاوبوونەوەی ئەو لۆژیکەی وا گرنگی دەدا بە حەقیقەتە رەهاکانو حەقیقەتە ڕێژەییەکانی پشتگوێ دەخست. چونکە زانستە کۆمەڵایەتییەکان هەمیشە هەوڵدەدات

بچێتە ناو واقیعی گۆڕانكارییەكان بۆئەوەی یاساكانی بدۆزێتەوە. بەڵام لۆژیكەكان ئەمە بە سوكی سەیردەكەنو بەشایستەی پیاوی بیرمەندی دانانێن.

چونكە بیریار لەبۆچوونی ئەواندا بەرزو بەڕێزترە لەوەی كاڵی بە نرخی خۆی بەفیڕۆبدات لەو شتانەدا كە هەموو خەڵكی دەیكەنو بیرناكەنەوە لەو كاروبارە كوتوپڕانەی كە دەرناكەون هەتا شاراوەبن.

فەیلەسوفە ئیغریقییەكان خاوەنی كۆیلەبوون. بۆیە پێویستیان بەوە نەبوو بیربكەنەوە لەچۆنێتی بژێوی خۆیان و ژیانو گوزەرانیان. هەر یەكێك لەو فەیلەسوفانە خاوەنی چەند كۆیلەیەك بوو كە ئیشیان بۆ دەكردو رەنجو تێكۆشانیان دەدا لەپێناوی بەدەستهێنانی هەموو پێداویستییەكانی ئەو فەیلەسوفە. لەوانەیە ئەمە هۆكارێكبێت لەو كۆمەڵە هۆكارانەی بوونەتە هۆی بلاوبوونەوەی لۆژیكی ئەرستۆ لەنێوان فەیلەسوفانی ئیغریقدا.

ئەمانە چاودێری كێشەكانی ژیان ناكەنو نایانەوێت بەجدی بیری لێ بكەنەوە. چونكە ئەگەر پێویستیان بەشتێكبووایە فەرمانیان دەدا بە كۆیلەكانیان بۆ دروستكردنو ئامادەكردنی ئەو شتە، ئەوا لەپاش ماوەیەكی كەم ئەو شتەیان دەبینی بە ئامادەكراوی لەبەردەستیاندا بوو.

بێگومان ئەم بارودۆخە وایكردبوو لەو كۆیلانە كە بیركردنەوەیان بزربێت بۆ لێكۆڵینەوەی كاروبارەكان، بۆیە بەلایەوە گرنگنەبوو تاقیكردنەوە بكات لەسەر ئەوەی چی روودەدات لەكاتی ئامادەكردن یان دروستكردندا.

گەربێتو كۆیلەكان كاتیان بە دەستەوە بووایە بۆ بیركردنەوە هەروەك چۆن ئاغا فەیلەسوفەكانیان بیریاندەكردەوە، لەوانەیە بمانبینیایە كە چۆن لۆژیكێكی تایبەت بە خۆیانیان داهێنایە پێچەوانەی لۆژیكی گەورەكانیان، بۆیە لەم بارەیەوە بۆمان هەیە بڵێین:- لۆژیكی سەفسەتە نزیكترە بۆ تێگەیشتنی ژیانی واقیعی لەلۆژیكی ئەرستۆ. هەروەها لەوانەیە لۆژیكی كرێكاران و كۆیلەكان بووبێت، بۆیە لەوانەیە هەرئەمەش هۆكاری لەناوچوونی بووبێت.

بیریارە پێشینەكان بۆیە رقیان لەلۆژیكی سەفسەتە بووە چونكە ئەوانی لەبورجە عاجییەكانیانەوە دەهێنایە خوارەوە. ئەوان دەیانویست رووی خۆیان لەخەڵك وەرگێرنو شانازی بەو بیرو بۆچوونو زاراوانەوە بكەن كە پێیانەو خەڵكی رەشۆكیو بازاڕی لێی

تێناگەن، بۆیە دەبینین دژایەتی سەفسەتەیانكردووە دژایەتییەكی وا كە بەزمیی تێدا نەبووە.

بۆیە فەیلەسوفە موسوڵمانەكانیش لەسەدەكانی ناوەڕاستدا لەسەر هەمان شێوازبوون. بەڵام ئەم فەیلەسوفانە خاوەنی كۆیلەنەبوون وەك برادەرە ئیغریقەیەكان بەڵام لۆژیكی ئەرستۆیان خۆشدەویست بەهۆی ئەو كاریگەرییەی كە هەیبوو لەسەر ئەو كەش‌وهەوا فیكرییەی وا ئەوانی تێدا دەژیا. چونكە ئەمانە زۆرجار دەیاننوسی بۆ ئەمیرو سوڵتانەكان‌و داوای بەخشیشیان لێ دەكردن. بەمەش بوو بوونە ئەوانەی كە بەپێی لۆژیكی خاوەن كۆیلە بیر بكەنەوە بەجۆرێك كە خۆیان هەستی پێنەكەن.

بەدرێژی ئەوەمان بینی لەم فەیلەسووفانە كە چۆن بێزاری‌و تورەبوونی زۆریان نواندووە لەبەرامبەر هەموو خەڵكی رەشوڕووتداو بەگژ عەقڵیەت‌و بیروباوەڕیاندا چوونەتەوە، كەئەمەش بۆتە هۆكاری ئەوەی هەندێ لەو فەیلەسوفانە بچنە دەرەوە لەو بڕیارو شێوە هەڵسوكەوتانە بە جۆرێك كە بگەنە بڕیارێكی وا بەرامبەر هاوڕێ بیریارەكانیان كە ئیتر ئەمان هەڵدێن لەو جیهانە (دەرداوی‌و دەغەزارە)و لەجیهانێكی تایبەت بە خۆیاندا دەژین كە تیایدا كەشوهەوا لەبارە بۆ تێڕامان لەحەقیقەتە نەمرەكانی بوونەوەرو گەردوون[٢].

چونكە ئەوەیان تێپەڕاندو بەگومانن لەوەی كە ئەم جیهانە دەغەزارە جیهانێكی حەقیقی بێت‌و هیچ بنەماو ڕاگیركارییەكی چەسپیوی تیانییە. ئەمەش ئەو جیهانە میسالیە (ئایدیالییە)یە كە ئەوان بانگەشەی بۆ دەكەن‌و هیچ بوونێكی نیەو لەواقیعیشدا هیچ شتێكی تر نیە جگە لەئەندێشەو وەهم‌و خەیاڵات.

تاكە بڕیارێك توانیبێتی زاڵبێت بەسەر ئەم شێوازەی بیرو بۆچوونی میسالی لەئیسلامدا تەنها (ئیبن خەلدونە). بۆیە ئەم بیریارە عەبقەرییە هەوڵیدا لۆژیكی ئەرستۆ تێكبشكێنێت‌و لەناوی بەرێت‌و لەجێگەیدا لۆژیكێكی نوێ بنیاتبنێت پشت ئەستوربێت بە واقیعی گۆڕانی كۆمەڵایەتییەوە، كە لەو كاتەدا بیریاران لێی تێ نەدەگەیشتن. لەوانەشە هەر پێكەنینیان پێ هاتبێت كە بەجۆرێكی وا ئەو هەموو بەرگە گەورە گەورانەی بۆ تەرخانكردووە بۆ توێژینەوە لەو بەركەوتانەی كە خەڵكی لەسەری دەڕۆن لەژیانی

 

کۆمەڵایەتیاندا، لەدیدی ئەواندا ئەمە کارێکی هیچو پوچو نەویستراوەو شایستەی ئەوە نیە بیریار خۆی سەرقاڵ کات پێوەی.

کەس رێزێکی شایستەی نەگرت لەئیبن خەلدون لەوڵاتانی ئیسلامیدا. تەنها ئەوە نەبێت لەم دواییانەدا چەند کەسێك دەردەکەون لەرۆژئاوا کە بەکارەکانی سەرسامبوون ئەگینا ئیتر هیچ کەس ئاوڕی نەداوەتەوە لەبیرو بۆچوونەکانی. پاش ئەوەی بینیمان هەندێ لەگەورە روناکبیرانی رۆژئاوا نەمریان بەباڵایدا بڕی کە ئەوەش چاولێکەریی لێ کەوتەوەو تا ئێستاش زۆرێکمان هەن رێزی ئیبن خەلدون دەگرن، بەبێ ئەوەی پێشەکییە ناوازەو بە ناوبانگەکەیان خوێندبێتەوە، ئەگەر خوێندبێتیشیانەوە ئەوا لەناواخنی عەقڵیانەوە لێی هەڵهاتوونو پاشان بەڕواڵەت چاکسازیان تێداکردووەو شوێنی کەوتوون (لەوەدا کەبییستویانە لەبارەیەوە مەدحو پیاهەڵدانێکی زۆری بۆ کراوە لەرۆژئاوا).



ئێمە تائێستاش کاریگەرین، هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، بەلۆژیکی ئەرستۆ بە کاریگەرییەکی گەورە، تەنانەت تا ئێستاش دەڕوانینە شتەکان لەدیدی یاساو گوفتارەکانی ئەوەوە.

هەندێجار لۆژیکی ئەرستۆ وەسف دەکرێت بەوەی کە لۆژیکێکی فۆتۆگرافییەو بەمەش بەراورد دەکرێت لەگەڵ لۆژیکی نوێدا کە دادەنرێت بە لۆژیکی سینەمایی [٤].

لۆژیکی ئەرستۆ ئەیەوێت وێنەی کاروبارەکان لەسەر شێوەیەکی نەگۆڕو جێگیرو ڕەها وەرگرێتو لەقاڵبێکی کۆتاییدا دایانرێژێت ئەمە لەکاتێکدا ژیانی خۆی جوڵەیەکی بەردەوامەو فۆتۆگراف نمایشی ڕاستیەکەی ناکات تەنها چرکە ساتێکی راگوزاری نەبێت. لۆژیکییەکانی پێشین بڕیاریاندەدا بەسەر شتێکدا بەوەی کە ئەوە خێرو چاکەیە یان ئەوە خراپو نالەبارەو بەم شێوەیە دەمانەوە لەسەری‌و دەقیان پێوەدەگرت لەپێوانەکارییە لۆژیکیانەکەیانداو وردە وردە وای لێ دەهات پشتیان دەبەست بە یەکەمین بڕیاردانیان لەسەر ئەو شتە، ئەمەو بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەوەبن کە هەندێ شت هەیە لەوانەیە بگۆڕێت لەسروشتی خۆیدا پاش ئەو بڕیارەی کە دەدرێ لەسەری، لەوانەشە بەخێر

بشكێتەوە پاش ئەوەی كە خراپبوو یان لەوانەیە بەخراپ بشكێتەوە پاش ئەوەی كە پێشتر چاكبوو.

هەروەك لەمەوپێش وتمان ئەوان شتەكانیان وا دادەنا كە ئیتر بڕیارلێدانی ئامادەكراوو كۆتایی پێهاتووەو لەمەشدا بڕیاری كۆتاییاندەدا بەسەرداو بەهیچ شێوەیەك نەدەكرا گۆڕانكاری تێدابكرێت. قوڕ بەسەر ئەو گەلەی نا ئەم خاوەن لۆژیكیانە حوكمی بكەن. گەل لەرەنجو تێكۆشانی بەردەوامدا بوو لەپێناوی ژیانداو كەچی ئەوانیش سەریانكردبوویەوە بە بورجە بەرزەكانیانداو چاودێری گەلیاندەكردلەو بەرزاییەوەو بڕیارە نەگۆڕو كۆتایی پێهاتووەكانی خۆیانیان بەسەردا دەسەپاند.

وتراوە ئەو یاسایەی وا یاسا دانەران كاری پێدەكەن دەبێتە هۆی بەدیهێنانی زوڵم ئەگەر هاتوو دەقاودەق (پیت بەپیت) بیچەسپێنن بەسەر خەڵكدا. ئەم گوتەیە دوور نیە لەراستییەوە، چونكە یاسا جێگیرو رەهایە لەكاتێكدا رووداوەكانی ژیان لەگۆڕاندایە. چەندە دڵڕەقو بێبەزەییە ئەو دادوەرەی وا پێوانەی شتەكان دەكات بەپێوانەكاری یاساییانەی خۆی (دەشێ لەم كارەیدا دەستپێوەگرتووبێت بەو یاسا بنبەستانە) بەڵام لەهەمانكاتدا بێئاگایە لەڕێڕەوی واقیعی كۆمەڵایەتی. لەنموونەی ئەم دادوەرە دەستپێوەگرتوانەمان زۆر بینیوە لەوڵاتی خۆماندا. ئەمانە هەروەك ئەوانەن كە بەلۆژیكی خاوەن كۆیلەكان بیردەكەنەوە، هەر ئەمانەشن كە خەڵك راڕاو دوودڵە لێیان هەروەك ئەوەی كەسانێكبن لەشێوەی ئامێرە بێ گیانەكاندا نەسۆزو بەزەییان هەیەو نەكەسایەتیش، زۆربەی ئەمانە بڕیاردەدەن بەسەر هەژارێكدا بەوەی كە تاوانبارە ئەگەر هاتوو بۆ تەنها جارێك ئەم هەژارە هەڵەیەكی كردبێت بەهۆی پاڵنەرە بارودۆخە دڵڕەقو بێ بەزەییەكانی ژیانییەوە، پاش ئەوەش رقیان لێیەو دەیبوغزێننو رووبكاتە هەر شوێنێك كۆسپو تەگەرە دەخەنە رێگای، ئەگەر دەنگی هەڵبڕیو نارەزایی خۆی راگەیاند ئەوا پێی دەڵێن: ئەمە ئەوەیە كە یاسا بڕیاری لەسەرداوە. بۆ زانین رۆحی یاسا هەموو رۆژێك پێشێلكاری دەخاتە سەر بینینو بیستنیان كە چی ئەوان نارەزایی دەرنابڕن.

لۆژیكی ئەرستۆ دەگونجێ بۆ ئامۆژگاریو ئاژاوە نانەوە پێكەوە، ئامۆژگاری كەر (واعیز) مینبەر بەكاردێنێت بۆ ئاگركردنەوەی خەڵك بە دۆزەخو ماڵوێرانی، ئاژاوەچیش ئەوەیە كە باس لەعەیبوعاری خەڵك دەكات بۆئەوەی رەخنەی لێبگرێت، هەردووكیان هەمان

لۆژیك بەكاردێنن لەهێرشكردنو بەرگریكردنیشدا. ئەوە لۆژیكی ئامۆژگاریكردنە نەك ئامۆژگاری وەرگرتن، لەوەدا كە هێندە پەرۆشی ئامۆژگاریكردنی كەسانی ترە بەپێچەوانەوە هێندەش دوورە لەوەی كە ئامۆژگاری وەرگرێت:- چونكە ئەو چاو دەخشێنێ بە هەڵسوكەوتی هەرتاكێك لەو تاكانەی كە لەگەڵیاندا ناكۆكی لۆژیكی هەیە بەڵام ئەو ناكۆكییە لەخۆیدا نابینێت.

ئەم دیاردەیە زۆر بەڕوونی بە دیاردەكەوێت لەهەندێ پیاوانی ئاییندا. هەروەها بڵاوبۆتەوە بە بڵاوبوونەوەیەكی زۆرو بێشومار لەو ژینگانەدا كە پیشە ئاینییەكانی تێدا زۆرە وەك ئامۆژگاریكردنو وەعزو ئیرشادو ڕێنمایی خەڵكردنو دابەشكردنی خێروخێرات. بۆیە لەم ژینگانەشدا زانستەكانی وەك: (ژیربێژی، مەنتیق، نەحوصەرف، فیقە، عیلمی كەلامو ئەوانی تر دەخوێنرێت) هەموو ئەم زانستانەش بەزۆری بەكاردەهێنرێن وەك پێوەرێكی لۆژیكیو زیهن رادێنن لەسەر ئەو جۆرە بیركردنەوانەی كە خاوەنەكەی هاندەدات لەسەر ئاژاوەگێڕیو پەندو ئامۆژگاریكردنی دوژمنكارانە.

لەم جۆرە ژینگانەدا مشتومڕو دەمەقاڵێ زۆر توندەو هەموو كاتێك بازاڕیان گەرمە، خەڵكیش چاودێرنو سەیری ئەم شەڕە دەنووكە ئەكەن تا بزانن كامیان زیاتر بەرامبەرەكەی بێ دەنگ ئەكاو زمانی بەهێزو كاریگەرەو دەنگی بەرزە (لەكوردەواری خۆشماندا بەو جۆرە كەسانەی دەڵێن زمانی درێژەو تف لەدۆناكات یان ئەوەندە دەم هەراشە دار بەدەمی سەگدا ئەكات. و: كوردی). بێگومان ئەم حاڵەتەش دەبێتە هۆی بەدیهێنانی دووفاقی كەسایەتی یان دووڕوویی.

هەموو تاكێك لەو ژینگەیەدا كاریگەر دەبێت بەو كەشو هەوا فیكریە جا ئیتر كەم بێت یان زۆر، كەواتە لەو بارەدا مەیلی دەچێت بۆ وتوێژو مشتومڕو بەو هیوایەی تێیدا سەركەوتن بەدەستبێنێت ئیتر بەهەر شێوەیەك بووە، بۆیە لێرەدا دەبینیت بارگاوی بووە بەسۆفیستەكان لەحەقیقەتی بڕیارەكەیداو ئەرستۆ تالیسیشە لەلۆژیكدا، ئەو لەعەقڵی ناوەوەیدا (شاراوەیدا) حەقیقەتی بیرچۆتەوەو ڕوودەكاتە گرنگیدان بەسەركەوتن بەسەر بەرامبەرەكەیدا لەمشتومڕدا، كەچی لەكاتێكدا ئەو لەعەقڵی دیارو ڕواڵەتدا بانگەشەی ئەوە دەكات گوایە حەقیقەتی خۆشدەوێتو ئەیەوێت بەدیداری شادبێت.

 

ئەو کەسە لەم حاڵەتەدا پێومرە لۆژیکیەکەی بەکارهێناوە کە ئەوش ڕاکێشراوی دوای سۆزدارییەتی بۆ نموونە ئەگەر کەسێکی لەخۆی تۆراندو ڕوشکێنیکرد دەیبینیت لەپاشاندا پێدەکەنێتو بەدەنگی بەرز هوتاف دەکێشێت لەسەر ئەو شێوازی لۆژیکەی پێی ڕاهاتووەو دەڵێت: پێکەنین بەبێ هۆ لەکەمی ئەدەبەوەیە

فلان کەس ئەگەر پێکەنی بەبێ هۆ

کەواتە فلان کەس ئـــــەدەبی کەمە.

ئەو هێشتا بەم حوکمە دڵڕەقانەی قایلنابێت لەسەر ئەو کەسەو لەوانەیە پەنابەرێتە بەر دەستدرێژییەکی تر لەسەر ئەو کەسەو پاشان لەپێناوی ئەمەدا پێومرێکی لۆژیکانەی نوێی بۆ دروستبکات بەپشت بەستن بەپێوانەکاریەکەی پێشووی، بۆیە دەڵێت: ڕەوشتی نزم زیان بە ئایین دەگەیەنێت

هەموو زیانبەخشینێك بە ئایین پێویستی بەدژایەتییە [٥]

کەواتە فلان کەس دژایەتیکردنی پێویستە.

بەپشت بەستن لەسەر ئەم پێوانەیە دەبینین زمانی درێژدەکات بۆ ناو زڕاندنو سوکایەتیکردن بە هاوڕێ هەژارەکەمانو زۆر بەتوندی ئازاری دەداتو تۆبە ناکاتو وازناهێنێت لەو ڕەفتارەی، لەمەدا ویژدانی هەست بە شەرمەزاری ناکات چونکە ئازاری دەداتو بەڵگە لۆژیکییەکەشی لەگەڵیدایەو پشتگیری دەکات لەو کارەی کە جێبەجێی دەکات.

هەموو ئەمانە بەو مانایە دێت کە پێوانەی لۆژیکی بووە بەئامێرێك بەدەست مرۆڤەوەو بەکاری دێنێت لەپێناوی ئەوەی کە خۆی دەیەوێتو ئارەزووی لێیە، لەبەر ئەم هۆیە ئەو بیرو بۆچوونە یان ئەو بیرۆکە (فیکرە) ناسراوە سەری هەڵداو گەشەیکرد لەناو هەموو خەڵکیداو دەڵێت:- ((لەکەس مەترسە تەنها لەعەمامە بەسەر نەبێت)) لەبەرئەوەی عەمامەبەسەر دەتوانێت بەهەموو کارێك هەڵسێت لەوەی کە دەیەوێت بیکاتو لەپاشاندا دێت پاساوی بۆ دێنێتەوە بەسەلماندنو بەڵگەی لۆژیکیو بەرگری لەخۆی دەکاتو وەڵامی ڕەخنەی ڕەخنەگرانی پێ دەداتەوە.

ئەوەی لەپێوانەی لۆژیکیدا جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە دەکرێت وەك چەکێك بەکاربهێنرێت لەدەستی هەموو تیپو گروپو کۆمەڵێکدا، هەروەها دەگونجێ

بەکاربهێنرێت بۆ پشتگیریکردنی هەر جۆرە بیرو ڕایەك‌و دیسان پشتگیریکردن لەدژی ئەو بیروڕایە. ((ئەمە بیروڕای راستە)) هەروەك چۆن ئەنا تۆل فرانس دەڵێت:((بەڵام دژەکەشی دووبارە ڕاستە))[٦].

هەموو خاوەن گروپە ئایینیەکان ئەم لۆژیکە بەکاردەهێنن بۆ پشتگیریکردن لەبانگەوازو بانگەشە مەزهەبییەکانیان، هەر یەکێکیش بگری لەوانە لەو بڕوایەدایەکە گەیشتۆتە حەقیقەت‌و گومانی تێدانیە. ئەگەر گوێڕاگریت بۆ سەلماندنەکانی هەموو ئەو گروپانە ئەوا دەبینیت هەموویان زنجیرەکی یەك لەدوای یەکی لۆژیکانەی راست‌و دروستن، کەواتە دووبارە تۆش بە حەپەساوی رادەوەستیت‌و نازانیت کام گروپ لەسەر حەقە لەنێوان ئەم هەموو گروپە جیاوازەدا.

(تۆماس) ئاماژە بەوە دەکات کە لۆژیکی کۆن بریتییە لەلۆژیکی بیروباوەڕە میراتیە بەجێماوەکان نەك لۆژیکی مەعریفەی گەشەکردوو[٧].

چونکە ئەم لۆژیکە کۆنە بەکاردێت بۆ بەرگریکردن‌و هێرشکردنیش، بەڵام بەکار نایەت بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتە نوێیەکان یان سەلماندن‌و پێداگیری لەسەر راستی‌و دروستی بیروباوەڕە کۆنەکان.

لەم بوارەدا ئەگەر ئاوڕبدەینەوە دەبینین کە هەندێ لەگومانچییەکان ئەوانەی کە دەرکەوتن لەسەرەتای مەدەنیەتی ئیسلامیدا پشتگیری ئەم رایە دەکەن لەلۆژیکی کۆندا. ئەوانەبوون کە گوتە بەناوبانگەکەیان دووبارە دەکردەوە: ((هەرشتێك بە مشتومڕ بسەلمێنرێت هەر بەمشتومڕیش هەڵدەوەشێت‌و لەناو دەچێت)). بەڵگەکاریی ئەوانەی گومانیان هەبوو (گومانچییەکان) لەم راگەیاندنەیاندا کورتکراوەتەوە لەشێوەی (بەیان)ێکداو تیایدا دەڵێن:- ((ئێمە دەبینین لەهەموو ئاینەکان‌و بیروڕاو وتارەکاندا... هەر گروپێك لەو گروپانە بگری مشتومڕی یەکتر دەکەن‌و لەیەکتر دەخوێنن، لەوانەیە ئەمە زاڵبووبێت بەسەر کۆڕو کۆبوونەوەیەکیشدا لەوەدا کە یەکێکیان زاڵدەبێت بەسەر ئەویتریاندا لەسەر بنەمای هێزی قسەکانی مشتومڕکەرو هێزو توانای لەسەر بەیانکردنی، ئەوان لەمەدا وەك ئەو دوو شەڕکەرەیان لێهاتووە کە سەرکەوتن‌و زاڵبوون بەسەر یەکتریدا ئامانجێکە لەنێوانیاندایە)) کۆمەڵێکی زۆر دەبینین داوای زانستی فەلسەفە دەکەن‌و مەلەوانی تێدا دەکەن‌و خۆیان وا بەرزو بڵند رادەگرن بەشێوەیەك گەیشتوونەتە سەر

راستییەکان‌و ئیتر دەچنە دەرەوەی بازنەی هەموو خەڵکیەوە، ئەوانی تر دەبینین شارەزایی بەدەستدێنن لەزانستی عیلمی کەلام‌و بەجۆرێك تیایدا تواونەتەوەو دەیچەسپێنن بە بەڵگەکاری، پاشان هەموویان دەبینین —هەم ئەهلی فەلسەفیەکان‌و هەم ئەهلی کەلامییەکان-جیاوازی‌و ناکۆکیان لەنێواندایە وەك هەموو جیاوازییەکانی نێو خەڵك بەگشتی‌و ئەهلی نەزان‌و جاهیلەکان، بەڵکو ئەمەی ئەمان توندترە بەتووندترین جیاوازی... راستە کە هەموویان یان شوێنکەوتەی ئەو ژینگەیەن لەسەری پێگەیشتوون‌و بەخششی ئەو پەروەردەیەن کە پێی گەورەگروان یان شوێنکەوتەی هەواو ئارەزووی خۆیانن بەو خەیاڵەی کە ئەوە حەق‌و راستە. ئەگەر لەسەلماندنەکانیاندا حەقیقەت هەبووایە ئەوا بەم شێوەیە جیاوازی نەدەکەوتە نێوانیانەوە بەدرێژایی زەمان‌و تێپەڕبوونی ساڵ... ئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی سەلماندنەکانیان پڕوپووچەو دوورە لەڕاستییەوە.



پێشتر باسی ئەوەمانکرد کە لۆژیکی ئەرستۆ بیریاران دادەبڕێت لەواقیعی ژیان‌و بەرزیاندەکاتەوە بۆ ناوهەورەکان. ئەمەمان بە جوانی بۆ رووندەبێتەوە لەکاتێکدا ئەو یاسا فیکریانە بخوێنینەوە کە ئەم لۆژیکە پشتی پێ بەستووە لەپێوانەکاری خۆیدا. ئەو یاسایانەن کە جیاوازن لەیاساکانی واقیع بە جیاوازییەکی گەورە. بەڵام بیریاران بێ ئاگان لەم جیاوازیە هەر لەزووەوە. ئەوان دەڵێن: ((ئەوەی مەعریفەی کامڵ بێت بێ بەش دەبێت لەبەختی خۆی‌و بەهێندی ئەوەش کە بڕێوی لەمەعریفە وەردەگرێت بەهەمان ئەو هێندەش دادەبڕێت لەبەخت))[٩].

بەڵام دەرکیان بەوە نەکردبوو کە هۆکاری (بەخت ڕەشی)و (کامڵی لەمەعریفەدا) لەوەوە سەری هەڵدابوو کە بەپێی یاسا خەیاڵییەکان بیریان لێدەکردەوە ئەو یاسایانەی کە تۆزقاڵێك پەیوەندیان نەبوو بەواقیعەکانی ژیانەوە.

ئیبن خەلدون هەوڵیداوە ئەو هۆکارانەی شیتەڵکات کە دەبنە هۆی (چارە ڕەشی) بێبەختی بیرمەندی لۆژیکی‌و لەم بارەیەوە دەڵێت: ((داهێنانی لۆژیك‌و زۆری بەکارهێنان لەهەڵەکاندا بێ زیان دەرناچن دوور لەواقیع‌و شتە هەستپێکراوەکان...)) [١٠].

ئەمە شتێکی لەحەقیقەت تێدابوو، بەڵام ئەم وتەیەی ئیبن خەلدون کەس لێی نەکرێو لەگەڵ مێژوودا ڕۆشت هەروەك هاوارێك لەناو دۆڵێکدا کەس نەچوو بەدەمیەوە.

ئیبن خەلدون لەو بڕوایەدابوو کە خەڵکی ئاسایی سەرکەوتووترن لەژیانی واقیعیدا زیاتر لەبیرمەند ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئەو کەسە سادەیە بە ئارەزووی خۆی دەڕوانێتە واقیعو هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات وەك لەوەی پەنا بەرێتەبەر پێوانەکاری لۆژیکیو بیرکردنەوەی یاسایی. بەڵام فەقیهەکانو لۆژیکییەکان بەڕای ئیبن خەلدون ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی کە: ((نقووم بوون لەماناکانداو دابڕان لەهەستاوەرییەکانو چڕکردنەوەی هەموو ماناکان تەنها لەزیهندا بۆ هەموو کاروبارە گشتییەکان....تا ئێستاش بڕیارو دیدو بۆچوونەکانیان هەمووی لەزیهندایەو نەخراوەتە مەیدانی پراکتیكو جێبەجێکردنەوە بەکردەیی..... بۆیە کەوتوونەتە هەڵەی زۆرەوەو بڕوایان پێناکرێت)) [11].

بەداهێنانی ئەم بۆچوونە تێروتەسەلە (ئیبن خەلدون) پێش زەمانی خۆی کەوت لەلۆژیکدا، لۆژیك لەدیدی ئیبن خەلدونداو وێنەی واقیعی ژیان ناگرێت لەبەرئەوە کۆسپو لەمپەر دەخاتە بەردەم ڕێگای سەرکەوتنی خاوەنەکەی تێیدا. مێژوو سەلماندوویەتی کە هەموو بیرمەندە دێرینەکان لەژیانیاندا سەرکەوتوو نەبوونو هەمیشە شکستیان خواردووە تەنها ئەوانەیان نەبێت کە میرێك یان دەوڵەمەندێك چاودێری کردبنو یارمەتیدابنو ڕزگاریکردبن لەهەژاریو نەداری ژیان.

زۆربەی بیرمەندانو ڕوناکبیرانی ئەم سەردەمە پشتگیری ئەم ڕاو بۆچوونەی ئیبن خەلدون دەکەنو جیاوازی دەکەن لەنێوان یاساکانی فیکرو یاساکانی واقیعدا. لەهەوڵی ئەوەدان بۆ هەریەکە لەم دوو جۆرە یاسایە ئەو بوارە دیاریبکرێت، کە لەگەڵ هەر یەکەیاندا دەگونجێت. شکست خواردنی لۆژیکیە پێشینەکان لەوەوە سەری هەڵدەدا جیاوازیان نەدەکرد لەنێوان ژیانی فیکرو ژیانی واقیعدا لەبەرئەوە دەمانبینین هەڵدەکشان بە ئاسمانی فیکردا بە عەقڵی خۆیان لەکاتێکدا جەستەیان داوای ژیانی دەکرد لەسەر زەوی واقیع، لەئەنجامی ئەمەدا کەسایەتیان تووشی دووفاقی (ئیزدیواجیەت) دەبوو لەهەموو بوارەکانداو سەرنجامیش دەیاندۆڕاند.

لۆژیکیە پێشینەکان سێ یاسایان دانابوو بەناوی یاساکانی بیرۆکە (فیکر)و دایانـدەنان بەو بەرکەوتە بەڵگە نەویستە نەمرانەی کە ناکرێ ڕێچکەی گومان بخرێتە سەر ڕاستیو دروستیەکانیان[١٢].

بەلێکۆڵینەوەی ئەم یاسایانە بڕی ئەو جیاوازیە زۆرەمان بۆ روون دەبێتەوە کە هەیە لەنێوان ئەم یاسایانەو واقیعدا.

ئەمەش ئەو سێ یاسایەیە کە دەیخەمە بەرچاوی خوێنەران:-

**یاسای یەکەم:-** ناودەبرێت بە یاسای خودێتی بەو دەربڕینەی ئەوان کە وتویانە ئەوە دەگەیەنێت (هەموو شتێك خودی خۆیەتی). دەشێ سیفەتی ئەم یاسایە لەوەدابێت کە یاسایەکی حەقیقی جێگیرە بەو پێودانگەی کە جێگری یان نەبزوتن بنەمای بوونەوەرە (کەونە)، جوڵەو گۆڕان پیشاندانێکە هیچ گرنگیپێدانێکی پێویست نیە. (جۆن دیوی) ئاماژەی پێداوە کە فەیلەسوفەکانی ئیغریق لەو بڕوایەدابوون دەبێ مەرجەکانی حەقیقەت جێگیربن‌و نەگۆڕێن ئەگەر هاتوو گۆڕان بەتاڵدەبنەوەو لەحەقیقەتەوە دەبن بەوەهم‌و خەیاڵ[١٣].

وا دەردەکەوێت ئەم بیرۆکەیەیان لەئەنجامی سەرنجدانیان لەماددە بێگیانەکان وەرگرتبێت، بەوەی لەکاتێکدا بینیویانە بوونەوەر پڕە لەم ماددانەو پاشان بینیویانە جێگیرن‌و ناجوڵێن ئەوا کەوتوونەتە ئەو ئەندێشەیەوە کە ئەسڵ‌و بنەمای بوونەوەر (کەون) بریتییە لەجێگیریی‌و نەبزۆکی: بەڵام ئەمڕۆ ئەم بیرۆکەیە هەڵگەڕاوەتەوەو لنگاوقوچبووە. بەشێوەیك لەم دوایانەدا زانستی فیزیا ئەمەی سەلماند، هەروەك لەمەوپێش ئاماژەمانپێدا، ماددە هەمیشە لەجوڵەی بەردەوامدایە، ئەوەی ئێمە بەڕواڵەت دەیبینین هێدی‌و لەسەر خۆو چەق بەستووە هیچیتر نیە ئەوە نەبێت کە لەخەیاڵی هەستەکانمانەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەروەها ئەم بیرۆکەیە دەگوێزرێتەوە لەفیزیاوە بۆ زانستە دەروونییەکان‌و کۆمەڵایەتییەکان بەڕادەیەك دەگاتە ئەوەی کە چەمکی کۆمەڵگا ئەمڕۆ چەمکێکی جوڵەییە. هەروەها کەسایەتی مرۆڤایەتی پێناسەیەکی تازە لەخۆدەگرێت بەوەی کە جوڵەو گۆڕانە (process)[١٤].

هەروەها بیریارانی سەردەمە کۆنەکان ئەگەر شتێکی جوڵەداریان بدیبایە ئەوا پرسیاریاندەکرد لەبارەی جوڵەی ئەو شتەوە. بەڵام بیریارانی ئەم سەردەمە بەپێچەوانەوە لەم حاڵەتەدا پرسیار ناکەن تەنها مەگەر شتێکی نەبزۆك ببینن. لەبەرئەوە لای ئەمان جوڵە بووە بە سیفەتێکی بنەڕەتی لەهەموو شتەکاندا. بۆیە لەم بارەیەوە زۆر راستە ئەوەی کە (ئەبو نەواس) وتوویەتی:- تعجبين من سقمي صحتي هي العجب

ئێمە ئەمڕۆ سەرمان سوڕنامێنێت لەشتە جوڵاوەکان، بەڵکو سەرمان سوڕدەمێنێت لەشتە جێگیرو نەبزێوەکان. ئەم چەمکە نوێیە بوویە هۆی هەڵگەڕانەوەیەك لەدیدماندا بۆ ژیان و غەنی بوونمان پێی.

بیرمەندی کۆن تێدەشکا لەژیاندا چونکە جێگیریو نەبزاوتنی دەسەپاند بەسەر ژیانداو دەیویست وەڵامی گوتراوە لۆژیکییە نەبزێوەکانی بدرێتەوە، کەچی لەواقیعدا ئەم کارە هەڵەوگەڕاوە، بەوەی کە لەگۆڕاندایە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ. کەواتە سەرکەوتنی مەحاڵە تەنها مەگەر ئەو کەللە رەقە ڤیرسیچمەیە نەبێت کە چاودێری گۆڕانکاری دەکات بەچاوی کوناودەرو بۆ هەڵگەڕانەکەی وەك هەلپەرستێکی بە پەلە. بیریاری کۆن پێوانە لۆژیکییەکانی بەکاردێنێت بە پشت بەستن بە سەرنجە پێشووەکانی —بەبێ ئەوەی بزانێت و ئاگای لەوەبێت کە زەمەن (کات) لەگۆڕاندایەو ئەوەی بۆ دوێنێ بەکاردەهات بۆ ئەمڕۆ بەکارنایەت یان بۆ بەیانی بەکار نایەت. ئەو لەکاتێکدا بە تاقیکردنەوە تووشی شۆکێك (صدمە) دەبێت. تووشی تاقیکردنەوەیەکی تاڵ دەبێت ئەوا هیوا بڕاو دەبێت و دەیکات بە خەتای خەڵك و دەکەوێتە ناوناتۆرەو زەمکردنیان و جوێن بەکات و زەمەن دەدات، بۆ زانین ئەم تێکشانەی ئەو هیچ پەیوەندییەکی بە خەڵك یان بەزەمەن و کاتەوە نیە بەڵکو تێکشکانی ئەو سەرچاوەی گرتووە لەخراپی بیرکردنەوەی بە شێوەیەك باوەڕی هەیە بە جێگیرو نەبزێو لەکاتێکدا ژیان لەجوڵەیەکی بەردەوادایە.

یاسای دووەم:- ناودەبرێت بە یاسای نادژایەتی، پوختەکەی دەڵێ: هیچ شتێك ناگونجێت ونبێت و لایەنگیریش بێت بۆ سیفەتێکی دیاریکراو لەیەك کاتدا بۆ نموونە ئەو شتە لەدیدی ئەواندا: دەگونجێت حەق بێت و دەگونجێت ناحەق بێت، بەڵام نابێ

لەیەککاتدا حەقیش و ناحەقیشبێت. ئەمەش بەو مانایە دێت کەحەقیقەت رەهایەو رێژەیی نیە.

هەروەك لەبەشی پێشوودا ئاماژەمانپێکرد، حەقیقەتی رەها بوونی نییە لەژیانی کۆمەڵایەتیدا. ئەوەی هەیە ئەوەیە کە عەقڵی مرۆڤایەتی ناتوانێت لێی تێبگات (بیناوزێت) چونکە پابەندە بە کۆت و بەندە دەروونی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەکانەوە. (هیگڵ) ئاماژە دەکات بۆئەوەی کە دژایەتی رەسەنایەتییەکی بنچینەییە لەسروشتی بوونەوەر (کەون)دا. هەموو شتێك لەدیدی (هیگڵ)دا ئەوەو ئەویش نییە لەیەك کاتدا، کەواتە هەموو بیرۆکەیەك لەناوەرۆکی پێکهاتنیدا دژایەتییەك لەخۆ دەگرێت[١٥].

ئیبن خەلدون ئاماژە بەم جۆرە بیرۆکەیەی (هیگڵ) دەدات کە هێنایە ئاراوەو پاشان دەیچەسپێنێت بەسەر مێژووی خێزانە ئەرستۆکرات و موڵکدارەکانداو ئەو وڵاتانەشی کە ئیسلام فەرمانڕەواییان دەکات و ئەوانی تریش. هەموو خێزانێك لەدیدی ئیبن خەلدوندا ئەگەر لەسەرەتاوە چاکەخواز بوو لەکۆتاییشدا هەر چاکەخواز دەبێت. بەڵام لێرەدا خێزانی چاکەخواز چاکەخوازییەکەی رەهانیە. بۆیە دەبینین ئیبن خەلدون رەخنە لەو مێژوونوسانە دەگرێت کە گیرۆدەی نەخۆشی چاکسازی و بەخشندەیی بوون لەنێوان خێزانەکاندا لەسەر بنەمای ئاکارە رەهاکان. ئەو مێژوو نووسانە لەدیدو بۆچوونی ئیبن خەلدوندا بەراڕاو خەیاڵییەکانیان لەقەڵەمدەدات و هیچ تێنەگەیشتوون لەواقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی.

هەروەها ئیبن خەلدون ئەوەشمان بۆ وەسفدەکات کە چۆن هەریەکە لەو خێزانە فەرمانڕەوایانە گۆڕاون لەچاکەخوازو بەخشندەوە بۆ خراپەکارو چاوچنۆك و بەوەسفێکی وا شیاو باسیاندەکات کە هەر شایانی ئەو وەسفەبن و پێشتریش کەس وەسفی لەو جۆرەی نەکردبن. بێگومان هەمیشە دامەزرێنەری خێزان کەسێکی چاکەخوازو بەخشندەیە بەڵام هەر بەو شێوەیە نامێنێتەوە کاتێك دەتوانێت موڵکێك بنیاتبنێت و بە هۆیەوە سەرکەوێت بەسەر ڕکابەرەکانیدا (ئەمە بە بۆچوونی ئیبن خەلدون)[١٦]، ئەمەو بەڵام کوڕی ئەو دامەزرێنەرە ناتوانێت لەسەر رێچکەی باوکی بڕوات لەچاکسازیدا چونکە ئەو هەر لەدایکبووەو چاوی هەڵهێناوە لەنازو نیعمەتدا ژیاوەو بایەخی پێدراوە لەماڵی باوکیداو لەهەموو رووەکەوە خزمەتی دەکرێت، بۆیە ئەم نازو نیعمەت و خۆشیە دووری دەخاتەوە

 

لەسروشــتی توندوتیــژیو هێزبــەکارهێنانو ئــەو دوور بینییــەی کــە بــاوکی پێــوەی دەناسرایەوە، پاشان کـوڕی کوڕەکـەی دێـت ئـەمیش زیـاتر دەکەوێتـە خێـرو خۆشـیو نـازو نیعمەتەوە بەهۆی باوکیـەوە، لەبەرئـەوە کـەمتر بـەلای چاکسازیو بەخـشندەییدا دەڕوات.

بەڵام کوڕی کوڕەزاکەی دێتو لەسەردەمی ئەمدا بەشێوەیەکی عـادەتی هەڵوەشـانەوەی خێزانەکـەی دەکەوێتـە ئەسـتۆی بـەجۆرێك خۆشـگوزەرانیو رابـواردنی فەسروفـسور وای لێدەکات وەك ئافرەتی بێ دەسەڵات لارو لەنجەبکاتو بەسەر فەرشی ئاوریشما هەنگاوبنێت (١٧).

دەتــوانین (ئــیبن خەلــدون) دابنــێین بــە (هیگــڵ)ی عــەرەب. چــونکە فەلــسەفە کۆمەڵایەتییەکـەی بـەزۆری دەسوڕێتەوە بـەدەوری ئـەم (دیالێکتیکـە)دا کـە ڕادەوەسـتێت لەسەر دژێتـی یـان (پێـچەوانەبوون). کـە بـەم کارەی ئـەو یاسایە پێـچەوانە دەکاتـەوە کـە لۆژیکیە پێـشینو کۆنـەکان بڕوایـان پـێ بـوو بەمـەش لۆژیکـەکانیان لـەکاردەخاتو سـەرەو نخونیان دەکاتەوە.

سەیر لەوەدایە ئەم (دیالێکتیکە)ی وا ئیبن خەلـدون قـسەی لێـدەکات کارلێکردنەکـەی کورتناکرێـتەوە تەنها لەسەر دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکانو بـەس، بـەڵکو هـەروەها بـەزۆریش دەچەسپێنرێت بەسەر دیاردە دەروونییەکاندا.

لەوانەیە زیادەڕۆییمان نەکردبێت ئەگەر وتمان: هەموو مرۆڤێك لەهەندێ قۆناغـەکانی ژیانیدا تێپەڕدەبێت بـە خـولێکی دەرونیـدا وەك ئـەم خولـە کۆمەڵایەتییـە وایـە کـە ئـیبن خەلـدون وەسـفی دەکـات. بەداخــەوە دەبیــنین زۆربــەی لاوەکانمــان ئــەم ڕاسـتییەیان لاشـاراوەیەو ڕۆچـوونەتە نـاو قوڵاییـەکانی بـیرو بۆچـوونە ڕەهاییەکانیانـەوەو ئـەوەیان لەبیرچـووە کـە نـاتوانن لەگۆڕانـە دژینـەکان (پێـچەوانەکان) رزگاریـان ببێـت تـەنها زۆر بەدەگمەن نەبێت.

بۆ نموونە یـەکێك لەنێمـە شۆخێکی جوانو قەشـەنگ بـە بەردەمیـدا ڕاگوزەردەکاتو ئــەمیش تێـر لێـی دەڕوانێـتو چـاوی پیادەخـشێنێت پاشـان خێـرا بڕیـارێکی ڕەهـا دەدا بەسـەریداو وای دادەنێـت ئەگـەر شـۆخەکە بخوازێـتو ببێتـە هاوسـەری ئـەوا بـۆی دەبێتـە سەرچـاوەی کامـەرانی هەمیـشەییو خێـرو بەرەکـەتی هەتاهـەتایی بـۆی. بـەڵام ئـەوەی

لەبیرچووە كاتێ ئەو شۆخە دەخوازێت و دەبێتە هاوسەری ئەوا خولە دەروونییەكەی دەیهاڕێت و لەكۆتایدا دەستدەكات بەتێڕوانینی بە پێچەوانەی ئەو تێڕوانینەوە كە یەكەمجار تێی ڕوانیبوو.

زۆربەی ئەو شكستانەی لاوەكانمان پێوەی دەناڵێنن لەئەنجامی پەلەكردنی بڕیاردانیانەوە سەری هەڵداوە كە ئیش‌وكارەكانیانی لەسەر بنیاتدەنێن پاشان لەدوایدا بۆیان دەردەكەوێت كە ئەوان تەنها لەیەك لایەنەوە ڕوانیویانە بۆ شتەكان و لایەنەكانی تریان پشتگوێ خستووە.

یەكێ لەو لاوە هەڵەشانەی كە تازە لەسەرەتای كەف‌وكوڵ و جۆش‌و خرۆشی عەشق و دڵدارییەكی گەورەدابوو بۆیگێڕامەوەو وتی:- ئەو كچەی كە خۆشم دەوێت گەورەترین خێرو خۆشیە بۆ من لەسەر ڕووی زەویدا. پاشان دوای ئەوەی هێنای و بوو بەهاوسەری پرسیارملێكردو لەوەڵامدا وتی: گەورەترین چارەڕەشی و نەگبەتییە بۆ من.

لەواقیعدا خۆشی و ناخۆشییە (خێرو شەڕ)ە پێكەوە بەڵام ئەو هاوڕێیەمان لەپێش ژنهێناندا تەنها لەشتە جوان و چاكەكانی ڕوانیوەو پاشان دوای ژنهێنان و هاوسەرێتی لەشتە ناشرین و خراپەكانی ڕوانیوە. لەمەدا ئەمیش توشی ئەو بەركەوتەیە بووە كە مێژونوسەكان ڕەخنەیان پێ دەگرت لە(ئیبن خەلدون).

یاسای سێهەم:- ناودەبرێت بە یاسای ناوەندی بەرزكراوە. مەبەستیان لەمەش ئەوەیە كە جیهان پێكهاتووە لەدوو ڕوو یان دوو لایەن و لایەنی سێهەم نیەو نابێت:-

لایەنی حەق و لایەنی ناحەق، یان لایەنی جوان و لایەنی ناشیرین، یان لایەنی چاك و لایەنی خراپ...هتد[18].

بۆ نموونە شتێك دەبێ هەر لەم لایەنەدا بێت یان لەو لایەنەی تردابێت، ئەگەر هاتوو لەم لایەنەكەوە چووە دەرەوەو ڕۆشتە ئەو لایەنەكەی تر. لەم لۆژیكەدا (نێوان نێوان) نیە. هەروەك چۆن حەزرەتی عیسا لەكۆندا وتوویە: ((ئەوەی لەگەڵمان نەبێت ئەوە دژمانە)).

بەهەرحاڵ ئەمە لۆژیكی پەندو وەعزدادان بووەو لۆژیكی ململانێی نێوان مەزهەب و ئایینەكانبووە. تۆش دەكرێ یان لەگەڵ حەقیقەت بیت یان دژی بیت. ئەگەر كەمێ لاتداو هەڵهاتی لەحەقیقەت ئەوا دژایەتیكردن و لەناوبردنت پێویستە.

(شیلەر) فەیلەسووفی ناسراوی ئینگلیزی لەوەسفکردنی ئەم لۆژیکەدا دەڵێت:-

((حەقیقەت لەبەر رۆشنایی لۆژیکی رەهادا یەك حەقیقەتە، بیروڕاکانیش پێویستە کۆك و تەبابن لەسەری. دەشێ تۆ یان لەگەڵ حەقیقەتدا بیت یان دژی بیت. ئەگەر هاتوو دژی بیت ئەوا تیادەچیت. بەڵام ئەگەر هاتوو لەگەڵ حەقیقەتدا بوویت بۆ هیچ کەس نیە کە دژایەتیت بکات. تۆ لەوەدا لەسەر حەقی ئەگەر تووڕەبیت و نارەزایی دەربڕیت بەرامبەر ئەوانەی کە مشتومڕ دەکەن لەبارەی حەقیقەتەوە، حەقیقەت حەقیقەتی تۆیە یان راشکاوانەتر تەنانەت ئەگەر خۆشتداماڵی لەهەست و سۆزە مرۆڤایەتیەکان)) [١٩].

بەڵام زانستە نوێیەکان لەبنەڕەتەوە ئەم یاسایەیان هەڵتەکاند. بۆ نموونە لەفیزیادا ئەوە دۆزرایەوە ماددە لەشوێنێکی دیاریکراودا نیە بەتایبەتی، هەرچەندە لەکۆندا دەیانگوت: ماددە لێرەدا هەیەو لەوێدا نیە، بەڵام ئەمڕۆ زاناکان لەو بڕوایەدان ماددە بونێکی سنوردارنیە لەبۆشایدا.

بۆ نموونە ئەم پێنوسەی ئێستا بەدەستی منەوەیە لەهەموو شوێنێکدا هەیە مادام پێکهاتووە لەوزەی کارەبایی، هەروەك چۆن ئەمە رونکراوەتەوە لەتوێژینەوە گەردیلەییەکاندا لەم دواییانەدا، لەبواری کارۆموگناتیسیدا، دووبارە شمولی هەموو بوونەوەر دەکات [٢٠].

ئێمە لەکاتێکدا هەست بە بوونی پێنوسێك دەکەین لەنێوان پەنجەکاماندا لەوانەیە کارمانتێکرابێت بە خەیاڵێك لەهەستە سنووردارەکانمانەوە. بواری پێنوس هەیە لێرەو لەوێ بە پلەی جۆراوجۆرو جیاواز، هەرچەندێك لێی دوورکەوینەوە ئەوا کارتێکردنی کارۆموگناتیسییەکەی کەمترە لەسەرمان بێگومان. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە ئیتر پێنوس لەمەراکیش نیە، بۆ نموونە لەهەمانکاتدا ئەو پێنوسە لەنێوان پەنجەکانماندایەو ئەم دێڕانەی پێ ئەنوسم.

هەستاوەریمان بەشێوەیەك ڕاهاتووە هەست ناکەین بەکاریگەری ماددە تەنها لەدوو توێی سنورێکی دیاریکراودا نەبێت. ئەو پێنوسەی لێرە لەنێوان پەنجەکانمدایە هیچ کەس هەست بەبوونی ناکات لەمەراکیش چونکە بواری کارۆ موگناتیسییەکەی لەوێ زۆر لاوازە لەتوانای پێنج هەستە ناسراوەکەدا نییە کە دەرکی پێ بکەن [٢١]...

 

ئەم تیۆرە لەفیزیای نوێدا ناودەبرێت بە تیۆری بوار(ماوە)، هەروەك چۆن شاراوانییە، ئەم تیۆرە پێچەوانەی یاسای ناوەندی بەرزکراوەیە لەوەدا کە پۆلێنکاری کاروبارەکان و شتەکان بەرهەم ناهێنێت بۆ ئاستی لەیەك جیاکراوەو لێکدابڕاو. ((بوون)) بە پێی ئەم تیۆرە درێژکراوەیەو هیچ بەربەست و لێکدابڕانێکی تێدانییە، کەواتە جیاوازی لەنێوان بوونێك و بوونێکی تردا بریتییە لەجیاوازی پلە نەك جۆر.

هەربۆیە ئەم تیۆرە کاری کردۆتە سەر دەروونزانی و کۆمەڵایەتی و بیروڕاکانی ئەم دووانەی لنگاوقوچ کردۆتەوە.

بۆنموونە ئێمە هەمیشە خەڵك پۆلێن دەکەین بۆ دوو جۆر: نەزانەکان و عاقڵەکان و بوونی ناوەندێکی جیاکەرەوەش هەست پێ دەکەین لەنێوان ئەم دوو جۆرە خەڵکەدا بەڵام لەدەرونزانیدا ئەم ناوەندە جیاکەرەوەیە بوونی نیە. لەدیدو بۆچوونی ئەم زانستەدا هەموو مرۆڤێك شێتە بە هەر پلەیەك بێت. جیاوازی بڕواپێکراویش لەنێوان شێت و عاقڵدا لەجیاوازی نێوان پلەی شێتێتی ئەو دووانەدا سەرچاوە دەگرێت ئیتر ئایا بەهێزبێت یان لاواز بێت پلەی ئەو شێتیە.ئێمە لەکاتێکدا عەقڵیەتی خەڵك دەخوێنینەوە لەواقیعدا جیاوازییەکی جۆرێتی تیا بەدی ناکەین، بۆیە دەگونجێ هەموو تاکەکانی خەڵك لەسەر پلەدارییەکی نەپێچراوبن، ئەوەش بە زاراوەی زانستی پێی دەوترێت بەردەوام (Continuum). زۆربەی ئەوانەی ئێمە دایان دەنێین بەعاقڵەکان جیاوازیان نییە لەگەڵ نەزانەکاندا تەنها جیاوازییەکی کەم نەبێت. لەوانەیە ئەو عاقڵانە لەڕاستیدا شێتبن و بەڵام کۆمەڵگا هەڵیبواردون لەتۆمەتی شێتی و جا ئیتر بەهۆی دەوڵەمەندییانەوە بێت یان بەهۆی پلەوپایەو هۆزایەتیانەوە بێت. دیسان ئەوانەش کە بە شێتەکان لەقەڵەم دراون لەوانەیە ئەو کەسانەبن کە عەقڵ و هۆشیان لەوپەڕی ڕاستی و دروستیدابێت و بەڵام کۆمەڵگا بە چاوی سوك سەیریان دەکات بەهۆی هەژاری و نەدارییانەوە یان بەهۆی ناشیرینی و کەم ئەندامییانەوەو خێرا بڕیاردەدا بەسەریانداو دەیانخاتە خانەی شێتەکانەوەو مەرجەکانی شێتیان بەسەردا دەچەسپێنێت [٣٢].

خەڵك هەر لەسروشتی خۆیاندا حەزیان لەوەیە خەڵك بکەن بە دوو بەشەوە. بەم کارەشیان جۆرە سنورێکی جیاکەرەوەیان دروستکردووە کە جیاوازی دەخاتە نێوان تاکەکانەوە لەڕووی عەقڵ و خووڕەوشت و شوێن و جێگاو ئەم جۆرە شتانەوە، لەگەڵ

ئەوەشدا لەوانەیە لەواقیعدا تاكەكان جیاوازییەكی پلەداریان لەنێواندا هەبێت كەم تا زۆرێك كە ئەمەش پێویست بە پۆلێنكردنی جووتەكی یان (دوو جۆری) ناكات.



لەوەی ڕابردوومان دەردەكەوێت كە ئەو یاسا فیكریانەی وا لۆژیكییەكان لەدیدی خۆیاندا لەسەر بڕۆن ئەوا ناچەسپێت بەسەر ئەو یاسایانەی واقیعدا كە تیایدا دەژین. ئەمەش ئەوە دەردەخات كە باسمان كرد سەبارەت بە گیرۆدەبوونیان بە پەتای كەسایەتی دوو فاق یان (جمكە كەسێتی).

هەربۆیەشە دەیانبینین كە ڕاهاتوون لەسەر مشتومڕو نوسینو وتاربێژی بەپێی لۆژیكی ئەرستۆ. ئەگەر هاتوو لەگەڵ ژیانیش بەشەڕهاتنو داوای بڕێوی و پلەوپایەو خۆشگوزەرانیان كرد ئەوا دەیانبینیت كە چۆن ئەم لۆژیكەیان لەبیردەچێتەوەو هێرش دێنن بۆ ڕۆخی كانیاوی واقیعو بینجی پێوەدەنێنو جۆربڕی دەكەن بە جارێك.

ئەمانە بەم كارەیان دەبنە خاوەنی دوو كەسایەتی: هەرجارەی دەچنە كراسێكەوەو خۆیان دەگۆڕن، جارێك كە بیردەكەنەوە لەشێوەیەكدانو جارێكی تریش دەچنە شێوەیەكی ترەوە لەكاتێكدا ئیشو كارەكان ئەنجامدەدەن(واتە وەك حەربا هەرجارەی بەڕەنگێك خۆیان دەگونجێنن لەگەڵ سروشتو دەوروبەردا، جارێك سەوزو جارێك قاوەیی.و- كوردی).

لەمەشدا بێ ئاگا دەبن لەجیاوازییەكانو دژایەتیو پێچەوانەكان كە لەم پێناوەدا بەسەریاندا هاتووەو پێی نازانن، بۆیە ڕاهاتوون لەسەر ئەم حاڵەتە هەر لەسەردەمی منداڵیانەوەو بوونەتە كەسانی خاوەن (جمكەشێواز- شێواز دوو فاق- كەسایەتی جوتەك). بەجۆرێك كە هەستی پێ ناكەن [٢٣].

دووبارە ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە دەبینین بیركردنەوەی ئاینیش بووە بەم شێوازە جوتەكییە، ئەمەش لەئەنجامی ئەو تێكەڵبوونەی كە هەیبووە لەگەڵ لۆژیكی كۆنداو پشتبەستنی لەزۆرەبەی كاروبارەكانیدا بە یاساكانی بیرۆكەی عاجی.

بۆ نموونە دەبینین پیاوی ئاینی سەرپێچیی دەوڵەمەندەكان ناكات یان سەرپێچیی لەپیاوانی دەوڵەت ناكات لەكاتێكدا زوڵم لەخەڵك دەكەنو دەیان چەوسێننەوە ئەمە

لەلایەکەوەو پاشان لەلایەکی تریشەوە هەڵدەسن بە دروستکردنی مزگەوتەکانو ئەمەشیان بە حاڵەتێکی سروشتی لەسەر حیساب دەگرێت لەهەردوو ڕووەکەوە.

مێژوو ئەو هەولانەمان دەخاتە پێش چاو لەبارەی زۆربەی خەلیفەکانو ئەمیرەکان کە چۆن هەستاون بە خەرجکردنی ماڵو سەروەتی نەتەوە بۆ کڕینی کەنیزەکەکانو بنیاتنانی کۆشكو تەلارە بەرزو بڵندەکانیان، کاتێکیش واعیز (ئامۆژگاری کەر) دەچێت ئامۆژگاریو وەعزیان دادەداتو باسی سزای ڕۆژی دواییان بۆ دەکات لەلایەن خواوە کە چۆن مرۆڤ دووچاری ئەو سزایانە دەبێت ئەوا دەیانبینیت یەکسەر هەردوو چاویان هەڵدەنیشێت لەفرمێسكو لەئەنجامدا نوێژوو ڕۆژووەکانیان زیاتر دەکەن....

ئەم عادەتەیان تێدا بەرکەوتە دەبێتو بەرجەستەی دەکەن لەخۆیاندا بە جۆرێك کەهەست بەو جیاوازیە گەورەیە ناکەن تێیدا لەنێوان ئەوەی وا بە شەو خەریکی بەزمورەزمو ڕابواردنن لەگەڵ کەنیزەکانو گۆرانیبێژانداو بەڕۆژیش کۆدەبنەوە لەگەڵ فەقیهەکانو پیاوانی ئاینیداو باسی دینو دیانەتو قەبرو قیامەت دەکەن. پیاوانی ئاینیش بەدەوری خۆیان هەڵدەسنو ئەم ئیزدیواجیەتە لەگەورەکانیان پیرۆز دەکەنو دەینرخێنن، هەروەها پیرۆزبایی کۆشكو تەلارو کەنیزەکانیان لێ دەکەنو هیوای زیاتریان بۆ دەخوازن لەکۆکردنەوەی کەنیزەكو زیاترکردنی کۆشكو تەلار. بەڵام ئەو بێ ئەواو ڕەشو ڕووتانەی کە ئەو ئەمیرو خەلیفانە ماڵو سەروەتیان لێ دەدزینو زەوتیان دەکرد بۆ خۆیان... ئەوا وەیل جێگەیانە لەدنیاو قیامەتداو بە نائومێدیش سەر دەنێنەوە.

تا ئێستاش لەم سەردەمەی ئێستاماندا پاشماوەی ئەم ئیزدواجیەتە هەرماوە لەپیاوانی ئاییندا. لەوەدا کە ئەمانە ڕێزو حورمەتی ملهوڕو زاڵمان دەگرن بەکردەوەو پاشان دێن لەسەر مینبەرەکانیش زەمی ئیشو کارەکانیان دەکەن. دەبینین زۆربەیان ئامۆژگاری خەڵك دەکەن کە توخنی شەپۆلی مەدەنیەتی نوێ نەکەونو بەرەوپیری نەڕۆن کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لێدەگەڕێن کوڕوکاڵو ژنی خۆیان بڕۆن بەرەوپیری ئەو مەدەنیەتە. دیسان دەبینیین یەکێکیان کاتێ وتاردەخوێنێتەوە لەسەر مینبەر ئەوا یەکراست دێتەخوارێ بەزەمکردنو ڕسواکردنی قوتابخانەو سینەماو ئافرەتی سفوردا، کەچی پاش ماوەیەك دەبینیت خۆی تەواو ڕۆچووەتە نێو ئەو کاروبارو حاڵەتانەوە کە پێشتر زەمی دەکردنو لێی دەخوێندن.

دەگێڕنـەوە ڕۆژێکیـان کابرایـەکی بـەقاڵ کوڕەکـەی دەخاتـە قوتابخانـەوە بـۆ فێربـوونی خوێندەواری، پاشان فەقێیەك دێتو وەعزی دادەداتو ئامۆژگاری دەکاتو بەرپەرچی ئـەو کارەی دەداتەوە بەوەی کە ئەوە گوناحەو نابێت بکرێت... پاشان کابرای مسکێنو داماویش کوڕەکەی دێنێتە دەرەوە لەقوتابخانە. بەڵام پاش ماوەیەك خواکردی ئەو فەقێیە کوڕێکی بـوو گـەورەبوو نایـە بـەر خوێنـدن لەقوتابخانـەداو پاشـان خوێنـدنی تـەواوکردو بـوو بـە فەرمانبەر لەفەرمانگەیەکی میریداو ئیش‌وکاری خەڵکی جێبەجێدەکرد.

لەکاتێکیـشدا قوتابخانـەی کـچان کرایـەوە، کـابرای بـەقاڵ ویـستی کـچەکەی بخاتـە ئـەو قوتابخانەیەوە، دیسان فەقێکە هاتەوەو ویستی ئەمجارەش ئامۆژگاری بکاتو وەعـزی دادات لەوبارەیەوە. بەڵام ئەمجارەیان بەقاڵەکە وەڵامی دایەوەو هەر لولیکرد بە لولکردن:

((گەورەم جەنابی شێخ هەوڵبدە ئەمجارەیان یەکێکی تر هەڵبخەڵتێنە؟!!)).

ئـەوەی لێـرەدا شـایانی بـاس بێـت ئـەوەی کـە ئـەو فەقێیـە نەیویـستووە ئـەو پیـاوە هەڵبخەڵـەتێنێت. بـەڵکو ئـەو دڵـسۆزبووە لـەوەعزدادانو ئامۆژگاریکردنەکەیـدا لەهـەردوو جارەکـەدا، دیـسانەوە ئـەو فێڵکـەر نـەبووە لـەو دوو حاڵەتـەدا —بـەڵکو ئیزدیـواجی- بـووە (جمکـە شـێواز) بـووە لەهــەردوو جارەکــەدا. ئــەو فەقێیــە لەکاتێکــدا نەیهێــشتووەو بــەرگریکردووە لــەوەی بەقاڵەکــە کوڕەکــەی بخاتــە قوتابخانــە ئــەوا زۆر جــددی بــووە لەقسەکەیدا چونکە ئـەو بـەوەی نـەزانیوە پاش ماوەیـەکی تـر خۆیـشی کـوڕێکی دەبێـتو دەیخاتە بەر خوێندن لەو قوتابخانەیەدا، ئەمەش کێشەیەکی دەروونیـە کـە زۆربـەمان بـێ ئاگاین لێیو لەبارەیەوە تێگەیشتنێکی ڕاستو دروستمان نییە بۆی.

ئەوەی کە بیردەکاتەوە بەبیرکردنەوەیەکی ئەرستۆتالیسیانە جا ئیتر پیاوانی ئاین بێت یـان ئــەوانی تربێــت، ئــەوا بڕیــار بەسەرشــتەکاندا دەدات بەپــشتبەستن بەپێوانــەکاری لۆژیکیانـەی خـۆی ئـەوەی کـەبڕوای پێیـەتی بـەبڕوابوونێکی بـەهێزو پتـەو، ئەمـەو بـەڵام کاروبارەکان بەڕێوەدەچن لەسەر بنەمای یان بەپێی یاسا دژینەکان (پێچەوانەکان) بـۆ ئـەم پێوانەکارییــە، هــەروەك لەمــەوپێش روونمــانکردەوە. بیرمەنــد (بیریــار) هەنــدێجار ناچاردەبێت لەگەڵیا بڕوات چونکە دەیەوێت بـژی، کەواتـە یەکـەمجار بڕیـاردەدات لـەدژیو پاشان بۆ دواجار ئاشنایی لەگەڵ پەیدادەکاتو لێی نزیـك دەبێتـەوە بەتـەواوی. لەبەرئـەوە بەڕواڵەتێکی هەڵخەڵەتێنەرو فێڵاوی دەردەکـەوێت، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو لەواقیعـدا

مەبەستی لەفرۆفێڵو هەڵخەڵەتاندن نەبووە لەو كارەیداو نەشی ویستووە بیكات بەڵكو ئەوە ئیزدیواجیەتە وای لێدەكاتو پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەو كارە بەپاڵپێوەنانێكی بێ مەبەست.

لەسەر ئەم جۆرە بەدەستهێنانە پیاوانی ئایینی هەڵدەسن بە دژایەتیكردنی جلوبەرگی نوێو مۆدێرنو ئافرەتی سفوورە زۆربەی ئەوانەی وا ئەو جلوبەرگو پۆشاكە مۆدێرنانەیان حەرامو یاساغكردووە پاش ئەوە بینیومانن كە خۆیان پۆشیویانە یان هەر هیچ نەبێت بەلانی كەمەوە رێگایان داوە منداڵەكانیان بیپۆشن. لێرەدا زۆر بەجوانی بۆمان دەردەكەوێت كە چۆن ئەوانە بەشێوازێك بیردەكەنەوەو بەشێوازێكی تریش هەڵسوكەوت لەگەڵ شتەكاندا دەكەن.

ئەوانە بەپێی لۆژیكی حەقیقەتی نەگۆڕ بیردەكەنەوە، بەڵام ژیان ئاوەژووی ئەومیەو هەمیشە لەبەرەوپێشچووندایە، جلوبەرگو پۆشاكیش هەرگیز لەسەر یەكجۆر شێواز نامێنێتەوە. لەوانەیە پیاوانی ئایینی ئەو جلوبەرگو پۆشاكە حەرام بكەن لەخەڵك كە وەختی خۆی پێغەمبەرو هاوەڵانی پۆشیویانە.

شتێكی سروشتییە ئەو جلوبەرگو پۆشاكە رۆژئاواییانە ئەمڕۆ هاتوونەتە ناومانەوەو ئێمەش لاساییمان كردوونەتەوەو پۆشیومانن لەبەرئەوەیە كە ئەو جۆرە پۆشاكو جلوبەرگانە زۆر بەهێزو قایمو قۆڵو چاكنو لەماددەیەكی نەسڵی پوخت دروستكراون، بۆیە هەموو هەوڵدانەكان لەدژیو رێگرییەكان لەبەرامبەریدا دەبێتە چەند هەوڵدانێكی نەزۆكو شكستخواردوو چونكە وەك ئەوە وایە هەوڵی وەستاندنی شەپۆلێكی بەهێزی دەریا بدەیت كە ئەوەش مەحاڵە. پیاوانی ئایینی ئەمڕۆ دژی دەوەستنو بە خراپی دائەنێن كەچی بەیانی خۆیان لەبەری دەكەن... دوو بەیانیش لۆمەی ئەو كەسانە دەكەن كە پێچەوانەی ئەم كارەیەو نایپۆشێت یان سەرپێچی لەپۆشینی دەكات.

لەبەرئەوە پێویستمان بە لۆژیكێكی مۆدێرن هەیە تا بەركەوتە بێت لەگەڵ ژیانی واقیعیدا، تەنها بەم لۆژیكەش رزگارمان دەبێت لەم ئیزدیواجیەتە سەیرو سەمەرەیە كە لەكەسایەتیو عەقڵماندا هەیە.



 

ئـەوەی گـیرۆدەی لـۆژیكی ئەرسـتۆ بـووە لەسـێ لاوە زیـان بـەخۆی دەگەیـەنێت‌و كۆسپولەمپەر دێتە ڕێگای سەركەوتنی:

١. یەكـەمیان ئەوەیـە دۆسـتی كـەم‌و دوژمنـی زۆر دەبێـت: لەئـەنجامی توشـبوون‌و گیرۆدەبوونی بـەم لۆژیكـە هەمیـشە حـەزی لەمـشتومڕی زۆرو توندوتیـژە، چونكە ڕادێت لەسەر ئەو شێوازەو لەدیدێكی تەسكەوە دەڕوانێتە حەقیقەت، هەروەك پێشتر لێی دواین، ئەو نایەوێت چاوبخشێنێت بەهیچ كەسێكدا بێتـو گـەر دژایەتیـەكی سادەشـی هـەبێت ئـەو كەسـە لەقـسەو ڕەفتاریـدا، ئـەوا ئـەم پیـا هەڵدەشـاخێ‌و ڕەخنـەو سـەركۆنەی دەكـات‌و دەسـتدرێژی دەكاتـە سـەر لـەڕێگای بـەكارهێنانی ئـەو پێوانەكاریـە دووفاقییـەی خۆیـەوە. چونكە ئەوەی بیرچووەكە دژایەتی یان (پێچەوانە) بوون یەكێكە لەسیفەتە بنەڕەتیـەكانی سروشـتی مـرۆڤ، بـەڵام ئـەو خـۆی تووشـبووە بـەم نەخۆشـییەو ڕەخنـەی پـێ دەگرێـت لەخەڵكی، دووبارە ئەوەشی لەبیرچووە كە مـشتومڕ زۆرجار شكۆدار نیـەو نرخـی نابێت‌و نایگەیەنێتـە هـیچ ئـەنجامێك لـەو نەخۆشـییەی هەرچـەندە بەڵگـەو سـەلماندنە لۆژیكیەكانیشی بەهێزو لەكوورە دەرهاتووبن.

ئـەو حـسابی ئـەوە دەكـات شـورەییە بەلایـەوە بێتـوو گـەر یـەكێك زاڵبێـت بەسـەریدا لەمـشتومڕدا، لەبەرئـەوە دەبینیـت لەحـەق‌و ناحەقـدا مـشتومڕەكەی درێژەدەكاتـەوە بـۆ ئەوپەڕی ماوەی درێژەپێدان. لەمەشدا دەكەوێتە نێوان دوو بڕیارەوە:- یان دەبێت زاڵبێت بەسەر بەرامبەرەكەیداو ببێتە دوژمنی باوەكوشتەی یان دەبێت چۆكدابدات لەبـەردەمیاو توشی بێ هیوایی‌و شكست ببێت.

لەواقیعـدا مـرۆڤ لەمـشتومڕدا زاڵـبن بەسـەریدا باشـترە لـەوەی ئـەم زاڵبێـت. چـونكە سـەركەوتنی ڕاسـتەقینە نیـە لەمـشتومڕی لۆژیكیـدا. هـەموو سـەركەوتنێك لەڕواڵەتـدا شكستێكە لەناوەوەدا، كەدەبێتە هۆی هەڵگیرسانی ئاگری ڕق‌و كینە لەدڵی دۆڕاودا.

تكا لەخوێنەران دەكەم هەڵنەخەڵەتێن بەقـسەی ئـەو خـۆ بـەزاناو دانـا زانانـەی گوایـە حەقیقەتیان خۆش دەوێت‌و دەیانەوێت پێـی بگـەن بەهـەر نرخێـك بـووە، ئەمـە هـەمووی قسەی قۆڕو هیچ‌و پووچە تا ئەوپـەڕی هـیچ‌و پووچـی‌و بـێ مانـایی. مـرۆڤ ئاژەڵەو كوڕی ئاژەڵەو لەنـەژادی ئاژەڵە ڕیـشەدارو دێرینەكانـە، بۆیـە لـەناخی دڵیـەوە دەخوازێـت زاڵ‌و سـەركەوتووبێت‌و پێـی ناخۆشـە دۆڕاوو شكـستخواردوو بێـت بـە هـەر شـێوەیەك بێـت.

 

زاڵبوونو سەرکەوتن سومبولی (ڕەمز)ی مانەومیە لەشەڕی ژیانـدا. زۆر دەگمەنـە کەسێك ببینین چێژی گەیشتن بە حەقیقەتی کردبێتو لەهەمان کاتدا دۆڕاو یان شکستخواردووش بووبێـت. ئـیرادەی ژیـان، وەك (شـۆپنهاوەر) دەڵێـت، یەکـەمین ئامانجـە لەهەڵسوکەوتی مرۆڤـدا، بەدەســتهێنانی حەقیقــەت لــەزاڵبوونو ســەرکەوتندا هیـچی تـر نییــە تــەنها پیشاندانێکی ناوەندی نەبێت کە لەژێر پەردەی هەڵخەڵەتاندندایە هەندێجار.

ئەگەر هاتوو لەمشتومڕێکی لۆژیکیدا بەسەر یەکێکدا زاڵبوویتو سەرکەوتنت بەدەست هێنا واگومان دەبەیت کە ڕێنماییت کردووە بۆ حەقیقەتو حەقیقەتت پێناساندووە، بەڵام بێئاگایت لەوە کە پاڵتپێوەناوە بەرەو تاریکستان بە پاڵپێوەنان —ئەمەش دەبێـتە هۆکارێـك تـا ئـەو کەسـە ڕقو کینـەت لێ هـەلگرێتو بەرکەوتـەبێت بـە ناشـرینبوونو بوغزانـدنت بەشـێوەیەکی شـاراوە لەعــەقڵی نادیاریــدا (ناوەوەیــدا)و بــەدوای هــەلێكو فرســەتێکدا دەگەڕێت تا تۆڵەت لێ بکاتەوە لەهەر ڕێگایەكو بەهەر شێوازێك بێت.

لەناوچینی بازرگانەکاندا لەخۆرئاوا پەندێکی باوو ناسراو بڵاو بووبوویەوە کە دەیوت: ((کڕیــار هەمیــشە لەســەر حەقــە)) بۆیــە بازرگــان حــەزناکات مــشتومڕبکات لەگــەڵ کڕیارەکانیــدا لــەهیچ شـتێکدا، چـونکە ئـەوەی کڕیارەکـان دەیڵـێن حەقـە. بۆیـە زۆرجـار لـەپێناوی ڕازیکردنـی کڕیـاردا بازرگـان زەرەر دەکـات بەحـەقو ناحـەق. بـەڵام لـەدواجاردا سەیردەکات هەر قازانجی کردووە هەرچۆنێك بێت.

بـەڵام هەنـدێ لـەو بازرگانانـەمان وا کاریگـەری لـۆژیکی ئەرسـتۆیان لەسـەرەو بارگـاوی کـراون پێـی لەژێنگـە ڕۆژهەلاتییەکانـدا ولەمـشتومڕدایە لەگـەڵ کڕیارەکانیانـدا. لەوانەیـە ئەمـەمان چاوپێکەوتبێت لـەبازاڕەکانی بەغـداو شارەکانی تـری ڕۆژهەڵـتدا کـە بـەجۆرێك شەڕە دەنووکێکی زۆر توند پەیدابووە لەنێوان کڕیارو یەکێك لـەخاوەن دوکانەکانـدا، بێتـو گـەر بڕۆیـتو لەهـەواڵی ئـەو دەمـە بۆڵەیـە بپرسـیت ئـەوا دەبینیـت خـاوەن دەوکانەکـە شێتبووە بەدەست کڕیارەکـەوەو ئەیـەوێت حەقیقـەتی بـۆ بـسەلمێنێتو دەست دەکـات بـە جنێوپێدانی موشتەرییەکەو لێی توڕە دەبێت چونکە ئەو کڕیارە لەداواکارییەکەیدا لەسـەر ناحەق بووە.

سـەرنجدراوە لەبازاڕەکانـدا ئـەو بازرگانـەی خـۆی دوورەپـەرێز دەگرێـت لەمـشتومڕی لۆژیکی ئەوا زۆرترین کڕیاری هەیەو گەورەترین سـەرکەوتنی بەدەستهێناوە لەکارەکەیـدا،

ئەو بازرگانەشی خەریکی مشتومڕو داواکردنی حەقیقەتە لەکڕیارەکانی ئەوا حەقیقەتی بازرگانییەکەی لەدەستداوەو تێکشکاوەو شکستی خواردووە لەئیشەکەیدا بەشکستخواردنێکی بێ وێنە.

٢. ئەوەی گیرۆدەبووە بەدەردی مشتومڕی لۆژیکییەوە ئەوا لەلایەکی ترەوە زیانی بەخۆی گەیاندووە چونکە لەوێناکردنیدا وای بۆ دەچێت کە هەموو خەڵکی لۆژیکین و لۆژیکیانە بیردەکەنەوە لەئیش و کارەکانیاندا، هەر بۆیە لەیدی خۆیەوە ئەوە دەسەپێنێت بەسەریاندا کە ئەوانیش لەسەر پێوانەکارییەکانی ئەرستۆ تالیسی دەڕۆن بەڕێوە. ئەگەر هاتوو بینینی پێچەوانەی ئەوە دەجولێنەوە کە ئەو وێنایکردووە لەدیدی خۆیدا بۆیان، ئەوا هاواری لێبەرزدەبێتەوەو توڕەدەبێت بەسەریانداو دەستدەکات بە وتاردان و ئامۆژگاری و وەعزدادان و خەڵك ئاگاداردەکاتەوە لەسزای دۆزەخ و ماڵوێرانی و تیاچوون.

خەڵکی لەژیانی کردەییاندا دووردەکەونەوە لەلۆژیك. شوێن پێوەرەکانی حەق و دادپەروەری ناکەون لەکاری رۆژانەیاندا، بەڵکو شوێن شتە ڕازاوەو تازەمۆدێل و لاسایکردنەوە رواڵەتییەکان دەکەون.

بە بەراوردکردن لەنێوان دوو بازرگاندا کە هەردووکیان هەمان کاڵا دەفرۆشن چەند شتێکمان بۆ دەدردەکەوێت لەوەدا کە یەکێکیان بەخت یاوەریەتی و بڕێکی زۆر دەفرۆشێت و بازاڕی گەرموگوڕە بەڵام ئەویتریان چارە ڕەش و کەم چانسە و کڕیاری نیەو بێ بازاڕە، بێتو گەر بچینە ناو وردەکاری و لێکۆڵینەوە لەم جیاوازییە گەورەیە لەنێوان ئەم دوو بازرگانەدا ئەوا چەند هۆکارێکمان لا گەڵاڵە دەبێت کە بۆتە هۆی دروستبوونی ئەو جیاوازیانە، وەك ئەوەی بازرگانی یەکەم روویەکی خۆش و سەرو زمانێکی شیرینی هەیەو دەم بە پێکەنینەو شان و شکۆیەکی سەلارو ڕێکوپێکی پێوەیە، بەڵام دووەمیان دەبینین بە پێچەوانەوە دەموفلقێکی گەورەو دەمودانێکی ناشیرین و ناقۆڵای پێوەیە کاتێك بیەوێت پێبکەنێت و کڕیارەکان بەلای خۆیدا راکێشێ ئەوا بەپێچەوانەوە هەموویان لێی دوور دەکەونەوەو چارەیان ناوێت و شتی لێ ناکڕن.

ئەم بازرگانە چارەڕەش و مەئیوسە بەزۆری پرسیار لەخۆی دەکات لەبارەی هەڵاتن و دوورکەوتنەوەی خەڵك لەم و نزیکبوونەوەو بەرەوپیرەچوونی بازرگانەکەی هاوڕێی. بەڵام هیچ وەڵامێکی قەناعەت پێکەری دەستناکەوێت. ئەو لەکاتێکدا لەئاوێنە دەڕوانێت و

سەیری خۆی دەکات خەیاڵی ئەوە دەکات کە پێکەنینەکەی سەرنج راکێشەو نیگای چاوەکانیشی جوان‌و کارتێکەرن، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە هەموو مرۆڤێك رۆچووەتە نێو خودی خۆیەوەو ناتوانێت تەقدیری خۆی بکات بەتەقدیرکردنێکی بابەتیانەی راست‌و دروست وەك ئەوەی کەسانی تر هەڵی دەسەنگێنن‌و تەقدیری دەکەن. بۆیە ئەو بازرگانە بۆ شیکردنەوەی شکستەکەی لەبازرگانیدا پەنادەباتە بەر لۆژیکی‌و سەلماندنی عەقڵی. بۆنموونە سروشتی هەلاّتن لەئەهلی پاك‌و بێگەردو چاکەخوازو ئارەزووی نارەسەنی‌و فرووفێڵاوی‌و کەڵەکچی دەداتە پاڵ خەڵك. چونکە ئەو دەیەوێت بەمە پەردە بەسەر هۆکارەکانی شکستخواردنە حەقیقیەکەیدا بدات، بەم کارەشی خۆی دادەبڕێت لەخەڵك‌و دوور دەکەوێتەوە لێیان‌و لەو بڕوایەدایە ئەم دنیایە بەکەڵکی ئەو و هاوشێوەکانی ئەو لەپیاوچاکان‌و ئەهلی خێرو چاکە نایەت.

پێوانەکاری لۆژیکی بەزۆری نایەتەدی بۆ خاوەنەکەی لەئەنجامدانی ئەو پڕۆژانەی کە لەگەڵ ئەمدا ناگونجێن‌و ئەمیش لەگەڵیاندا هەڵناکات. بۆ نموونە ئەم سەرنجی کەسێك دەدات سەرکەوتووە لەپرۆژەیەکی بازرگانی یان پیشەسازی دیاریکراودا، بۆیە خێرا ئەمیش پەنا دەباتە بەر پێوانەکارییە لۆژیکییەکەی خۆی کە لەسەری ڕاهاتووەو دەڵێت:-

فلاّنەکەس سەرکەوت لەو پرۆژەیەدا

بەلاّم خۆ من لەفلاّنەکەس باشترو چاکترم.

کەواتە بێگومان منیش تێیدا سەردەکەوم.

ئەم پێوانەکارییە راستودروست‌و قەناعەتهێنەرە لەڕووی لۆژیکییەوە، بەلاّم بەداخەوە ژیانی واقیعی لەسەر بەدەستهێنانێك دەڕوات جیاوازە لەم بەدەستهێنانە لۆژیکییە، سەرکەوتن پرۆژەیەکەو هۆکارە زۆرو زەوەندو ئاڵۆزەکانی خۆی هەیە. ژیان هەمیشە دەستنادات‌و ملکەچ نابێت بۆ پۆلێنکردنی جوتشێوازی هەروەك باسمانکرد. بەراوردکردن لەنێوان دوو کەسدا لەپێناوی جێبەجێکردنی پرۆژەیەکدا راستە ئەگەر مەبەستمان پێی لەوەبێت کە یەکێکیان لەویتریان باشترە. لەوانەیە ئەو باشیەی ئێمە مەبەستمانە لەو بەراوردەی نێوانیاندا هۆکاری شکستەکە بێت نەك سەرکەوتن لەپرۆژەکەدا. دەشگونجێ یەکێکیان زیرەکتربێت لەوی تریان یان رەوشتێکی بەرزتری هەبێت لەویتریان، بەلاّم ئەم زیرەکی‌و رەوشتبەرزییە لەوانەیە هۆکاری شکستخواردنەکەی بن لەبازاڕدا، بەجۆرێك

وەیانلێكردووە بەرزتربێت لەو ئاستەی بتوانێت تێبگات لەڕووداوەكانی بازاڕو بەركەوتەكانی واقیع، بەمەش زیهنی خۆی سەرقاڵدەكات بەو كاروبارانەوە كە ناگونجێت لەگەڵ سروشتی خەڵكداو لەگەڵیدا ڕێ ناكات، لەمەشدا گەورەترین شكست ئەنجامدەدرێت.

٣. لەلایەنی سێهەمەوە بیركردنەوەی لۆژیكی شكست دەستەبەردەكات: ئەو ناڕاستەكردنەیە لەنێوان تاك و لەنێوان بەرهەمهێنراوی هێزە دەروونیە كاریگەرەكانی ئەو تاكە.

هێزەدەروونیەكان لەقوڵاییەكانی نەستەوە هەڵدەقوڵێن بە هەڵقوڵانێكی كوتوپڕو لەناكاو، ئەوەش پێویستی بە پێشەكییە فیكری و پێوانەكارییە لۆژیكییەكان نییە. یان ڕاشكاوانەتر بڵێین: پێویستی بە خاوبوونەوە (سستی) یان واقوڕمانە كە لێڵ و لیخن نابێت بەهیچ چەواشەكارییەكی فیكری هۆشیار.

كەسی گیرۆدەبوو بەبیركردنەوەی لۆژیكی بە كارێك هەڵناسێت تەنها مەگەر لەپاش بیركردنەوەیەكی ڕێكوپێكی وردە كاردا نەبێت. ئەو لەكاتێكدا سەرقاڵە بەمەوە زۆر لەكەڵك و سودی ئەو ئیلهامە كتوپڕیانە لەدەست دەدات كە پەردەی غەیب دەبڕن.

ئێمە نامانەوێت بەمە سەرپێچی بكەین لەسودی بیركردنەوەی لۆژیكی لەزۆر كاروباردائەمەو بەڵام دەمانەوێت دووبارە ئاوڕێك بدەینەوە لەزیانەكانی لەهەندێ كاروباری تردا. بازرگانی دیارو سەركەوتوو بیرناكاتەوە كاتێك ڕێك دەكەوێت لەسەر گوژمەیەكی بازرگانی بەڵكو ئەو لەسەر بەدیهیات و دڵنیاییەكانی خۆی دەڕوات و زۆرجاریش وا ڕێكدەكەوێت بڕیارێك پەسەند دەكات یان دەیداتە دوواوە بەبێ هۆكارێكی لۆژیكی دیارو ئاشكرا، ئەو لەم كارەیدا ئیلهام بەخشی نەستی خۆی دەبێت و لەسەری دەڕوات بە گوێرەی هاندان و پەیبردنە داهێنەرەكانی خۆی.

یەكێك لەو پەندە بەناوبانگانەی وتراوە لەبارەی بازاڕەكانی بازرگانییەوە دەڵێت:- ((پێویستە لەسەر هەر كەسێك ڕۆشتە بازاڕەوە عەقڵی لەسەر ڕەفەكەدانێت)). ئەم وتەیە مەبەستێكی لەڕاستی تێدایە گاڵتەی پێ ناكرێت. ئەوەی دێتە ناو مامەڵەی بازرگانییەوە لەسەر بنەمای لۆژیكی ئەرستۆتالیسی ئەوا ڕۆژێك دێت وای لێ دەكات بازاڕ بەجێبهێڵێت و داخیشی بۆ نەخوات. یان بە واتایەكی دی: دەبێ بەرۆكی مینبەر بگرێت و (بچێتە سەر مینبەر) و بەركەوتەبێت لەگەڵ واعیزەكان یان ئاژاوە چییەكان.

ناپلیۆن گوتوویە: بیرم نەکردۆتەوە لەدەربازبوون لەتەنگژەیەکدا پێش ئەوەی بکەومە ناوی. بۆیە یەکەمجار موجازەفەی بە گیانی خۆی کردووە پاشان لەوەی ڕوانیووە چی لەتوانایدایە بیکات پاش ئەوەی کەوتە نێو کێشەکانەوەو مەترسییەکان لەسەری زیادبوون. ئەو لەپێش کەوتنە نێو کێشەکەوە حەقیقەتەکەی نەزانیوە لەسەر شێوەیەکی راستو دروست بەڵام لەکاتێکدا ڕووبەڕووی بۆتەوە بەروبەڕوبوونەوەیەکی کردەیی ئەو کاتە زیهنی هەڵتەقاندووە لەبارەی حەلکردنێکی سەرکەوتوانەوە بۆی. بەدەربڕینێکی تر: یەکەمجار کەوتۆتە نێو تەنگژەکەوە پاشان دوای ئەوە ئیلهامی وەرگرتووە لەدنەدانو هاندانە نەستییەکانیو لەسەری ڕۆشتووە بەگوێرەی ئەو سروشەی بۆی هاتووە.

ئەو کەسەی گیرۆدەبووە بە لۆژیکی ئەرستۆ رەزامەندی دەرنابڕێت لەسەر ئەم رایە. چونکە ئەو لێکۆڵینەوە دەکات لەسەر هەموو حاڵەتو ڕووداوەکان پێش ئەوەی بچێتە ناویانەوەو هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی پێوانەکاریە لۆژیکییەکەی خۆیو پۆلێنکردنە دووفاقیەکەی جار لەدوای جار. لەوانەیە ئەم لێ نەبووبێتەوە لەم بیرکردنەوە وردەکارییەی کەچی وادەبینێت موجازەفە چییەکان پێشیانداوەتەوەو ئەمیان بۆڕداوەو سەرکەوتنیان وەدەستهێناوەو بە خۆیانو غەنیمەتەکانیانەوە لەپێشەوەنو ئەمیش لەدوایانەوە جێماوەو دەگەڕێتەوە، شیعری ناسكو قەسیدەی هەستبزوێن بە باڵای دنیادا دەخوێنێتو لۆمەو زەمی دەکات.... بەدەنگێکی ماتو مەلولەوە.

(ولیەم مارستۆن) لەبەشێك لەبەشەکانی کتێبە بە نرخەکەیدا ((هەنگاوێك بڕۆ پێشەوە)) ئەمەی خوارەوەی نوسیوە:

((..... زۆرینەی ئەوانەی سەرکەوتنی گەورەیان بەدەستهێناوە... هۆکاری ئەو سەرکەوتنەیان دەگەڕێتەوە بۆ تاوتوێکردنی ئیشەکان بەو گرنگی پێدانەی کە لەدەروونو ناخیانەوە هەڵقوڵاوەو هەستیانپێکردووە. زۆربەمان گەر بەکردەوە دەستەو یەخەی هاندانە چاکەکانی خۆمانبین لەڕۆژێکدا تەنها جارێك ئەوا بەسمانە بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانمان. ئەم ڕووناکی دانەوەی هاندانە ناوەکیانەمان عەقڵ ڕووناك دەکەنەوەو پاشان وندەبنو دەشارێنەوە، دەکەینە قەناعەتێك لەڕووناکیدانەوەی تیشکە سەیرەکەیو ئینکاری لەوە دەکەین کە ئەمە لەپێکهاتەی خۆمانەوە سەری هەڵدابێت، لەدەرونیشماندا هەست پێکردنێکی پەردەپۆشکراو هەیە لەوەی کە ڕۆژێ لەرۆژان بتوانین شتێکی لەم جۆرە

 

دروست بکەین لەخۆماندا، یان بە لانی کەمەوە نیەتەکانمان باش بێت بەرامبەری. بەبێ ئەوە بتوانین رزگارمان بێت لەناوەوەی خۆمان، چونکە پاڵنەرەکان هێڵە بەیەکگەیشتووەکانی نێوان عەقڵی ناوەوەو کاری رۆژانە هەڵدەسەنگێنن))[٢٥].

ئەو هاندانە نەستیانەی وا (مارستۆن) بانگەشەیان بۆ دەکات بەرووناکیدانەوەیان رێنمایی مرۆڤ دەکەن لەژیانی رۆژانەیدا بەجۆرێك کە هیچ بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیناتوانێت ئەو کارە بکات هەرچەندە رێکخراوو وردەکاریش بێت.

ئەو کەلەپورە نەزۆکەی بۆمان ماوەتەوە هەر لەسەردەمە کۆنەکانی یۆنانەوە، فێریانکردووین کەبیرکردنەوەی رێکوپێك سەرچاوەی سەرکەوتنە لەژیاندا، بۆیە ئەوەی دەستمان کەوتووە لەم کەلەپوورە لەزەرمەرۆ زیانێکی بێشومار زیاتر هیچی ترنیە.

رۆژێکیان بە یەکێ لەهاورێکانم وت کە لەهەڵوێستێکی زۆر نالەبارو ئیحراجدا بوو نەیدەزانی چی بکات:-

((بە گوێرەی ئەو سروش‌و بەدیهیاتە سەرپێییانەی خۆت بجولێرەوە)).هاورێکەم پێکەنی‌و گومانی ئەوەی لێکردم گوایە دەمەوێ زیانی پێبگەیەنم. ئەوە نموونەی قوربانییەك بوو لەقوربانییەکانی لۆژیکی یۆنانی، هەروەك چۆن زۆربەمان قوربانی بەخشی پزیشکێتی یۆنانی بووین تا سەردەمانێکی نزیکیش. پاش ئەوە هاورێکەم وەڵامی دامەوە: ((ئەو کارە ئەنجام ئەدەم کە لەلایەن عەقڵ‌و بیرکردنەوەی راستەوە فەرمانم پێ بدرێت)). لەبەرئەوە لەسەر ئەم دۆخە مایەوەو هەر بیردەکاتەوەو بیردەکاتەوەو هیچیش زیادناکات بەو بیرکردنەوەیەی تەنها واقوڕمان‌و سەر لێتێکچوون نەبێت.

ئەو برادەرە بە بیرکردنەوەی خۆی بریسکانەوە داهێنەرەکانی ناخی خۆی قەدەغەدەکرد، هەروەك چۆن پەردەیەك بەری روناکی رۆژبگرێت. ئەو هەرچەندە میتۆدێکی (بەرنامەیەکی) وەردەگرت‌و دەستی پێ دەکرد ئەوا لایەنە باشەکانی بەرنامەیەکی تری لەلا گەڵاڵە دەبوو ئیتر ئەمی پشتگوێ دەخست‌و وازی لێ دەهێنا. بۆیە هەمیشە دەتبینی کەڕاڕاو دوودڵ بوو نەیدەتوانی لەسەر بیروڕایەك سەقامگیربێت، ا وای لێهات هەموو کاتی بەفیڕۆ چوو لەو پێناوەدا.

خەوشی بیرکردنەوەی لۆژیکی ئەوەیە کە پشت دەبەستێت بە پێشەکییە دانراوەکان‌و زانیارییە پێشینەکان. لەبەرئەوە ناتوانێت سودمەندبێت لەشوێن پێهەڵگرتنی کات‌و شوێن

لەرووداوە نوێیەکاندا یان دەرك بەرووداوە نوێیەکان بکات کە لەودیوی کاتو شوێنەوە روودەدەن. بەڵام هاندانە دەروونییە کتوپڕیەکانی خود ئەوانەن کە لەقوڵایی عەقڵی شاراوە (ناوەوە) هەڵدەقوڵێن. عەقڵی شاراوەش جەوهەرێکی سنوردارنییە بەسنوری کاتو شوێن بەڵکو هێزو توانای هەیە بەسەر بینینی نادیار (غەیب)داو تێگەیشتنی هەیە بۆ ئەو شتانەی لەپشتی پەردەو ماوە (دووری)ییە کانەوەن[٢٦].

ئەو بازرگانەی کە گوژمە بازرگانییەکانی گرێ بەست دەکاتو لەسەری رێدەکەوێت لەسەر بنەمای بەدیهییە بەلگە نەویستەکانو هێدیو ئارامشی دڵو دەروونی، سەرکەوتووترە لەو بازرگانەی وا بیردەکاتەوە لەهەموو جوڵەیەکی بازرگانی کە پێی هەڵدەستێت. بازرگانی یەکەم شێوە هەواڵێکی لاسلکی پێ دەگات بە دابڕانی یان بە لەسەرخۆچوونێکی شێوە بابەت کە بەم کارەشی تێگەیشتنو زانینێکی ناهەستی لادروستدەبێت لەسەر نرخەکانی بازاڕە دوورەکانو نرخە داهاتووەکانیش، کە لەبەر تیشکی ئەم حاڵەتەدا کارەکانی مەیسەر دەکات بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت بەڵام بازرگانی دووەم بیرکردنەوەی دەبێتە رێگر لەبەردەم دەرککردنی بە رووداوەکانی غەیبو سودمەندبوون لێیان. بۆیە بە حەپەساویو ڕاڕایی دەمێنێتەوە.

هەندێجار پاڵنەرە نەستییەکان (هاندانە ناهەستییەکان)هەڵە دەکەن، چونکە لەبووندا رابەرێك یان رێنیشاندەرێك نیە هەرگیز هەڵە نەکات. هەروەها زەمانی حەقیقەتە رەهاکان بەسەرچوو، ئێستا زەمان زەمانی شتە گشتگیرییەکانو گریمانکارییەکانە.

پاڵنەرە نەستییەکان هەڵەش دەکەنو راستیش دەکەن بەڵام راستییەکانی زۆرترە لەهەڵەکانی لەزۆربەی حاڵەتەکاندا. هەروەها شوێنکەوتوانیشی لەوانەیە جارێك شکستبخواو جارێکیش سەرکەوێت، بەڵام لەکۆتایی مەبەستدا هەر دەگات بەو ئامانجەی کە خۆی دەیەوێتو بە دوویدا وێڵە.

سەیری ئەو یاریچیە لێهاتووەی تۆپی تێنس بکەو رامێنە لەجموجوڵەکانی چۆن ئاراستەیان دەکاتە تۆپە هاوێژراوەکەو چۆن بەرەو پیری دەڕواتو چۆن لێی دەداتەوەو چۆن شوێنی خۆی دەگۆڕێت جار لەدوای جار. بەچەشنێك ئەو رۆچووەتە نێو یارییەکەی خۆیەوە ناتوانێت هەست بەبوونی ئەوانەی دەوروبەری خۆی بکات لەخەڵكو لەشتەکان.

بێتو گەر ئەم یاریچییە لەشوێنكەوتوانی ئەرستۆ بووایە، خوانەخواستە، دەستیبكردایە بە بیركردنەوە لەكاتی یاریەكەیدا بە بیركردنەوەی لۆژیكیانەو بەشێوەیەك نەیدەتوانی جوڵەیەك ئەنجامبدات تەنها مەگەر لەدوای تێرامانێكی قووڵ نەبوایە، ئەو كاتە بێگومان پاش ماوەیەكی كورت بێ یان درێژ بۆ خۆی لەبرسان دەمرێت.

یاریچی شارەزاو لێهاتوو خۆی لەبیردەكات لەكاتی یاریداو خۆیو تۆپەكە دەبن بە یەك شت. بۆیە دەبینیت هەست بەئاراستەی تۆپەكە دەكات پێش فڕێدانی لەهەواداو كەوتنەخوارەوەو فڕێدانی لەو شوێنە پێویستەدا كە مەبەستییەتی. ئەو پەلكێشكراوە یان (پاڵپێوەنراوێكە) لەجوڵە كوتوپڕییەكانیدا بەو پاڵنەرانەی كە خۆشی نازانێ لەكوێوە هاتوون...

دەتوانرێت ئەم نموونەیە بكاربهێنرێت لەبارەی هەر شارەزایەكەوە لەبواری نیشەكەیدا یان لەئارەزووەكەیدا یان لەهونەرەكەیدا یان لەزانستەكەیدا بەوەی دەیبینیت كە ئەو دابڕاوە لەبارەی خۆیەوە لەچركەساتی داهێناندا، بۆیە دەبینیت وەستاوە لەپاڵتاو كەچی لەڕاستیدا لەجیهانێكی تردایەو تەنها بە جەستە لەلای تۆدایە.

پارێزەرێكم دەناسی گیرۆدەبووبوو بەدەست مشتومڕی لۆژیكەوە، هیچ فەرمانبەر یان دادوەرێك نەمابوو ئەم لەگەڵیا مشتومڕی نەكردبێتو لەو مشتومڕانەشیان هەموو هۆشوگۆشی خۆی تەرخانكردبوو بۆ بەكارهێنانی شێوازی ڕێگەی ئەرستۆ تالیس، پاشان لەكۆتاییدا هیچی دەستنەدەكەوت لەوەزیاتر كە سەری خۆیشیو سەری گوێگری بەرامبەریشی ئەیەشاندو بەدەستی بەتاڵ هەڵئەسایە سەر پێیان. تا وای لێهات لەهیچ هەنگاوێك لەهەنگاوەكانیدا سەركەوتنی بەدەست نەدەهێناو زیاتر هیوا بڕاو دەبوو. پارێزەری سەركەوتوو ئەوەیە كە لەئیشو كارەكانیدا لەسەر سروشتو ئیلهامە سادەو سروشتییەكانی خۆی دەڕوات. بەم كارەشی بیرو بۆچوونی دادوەر دەخوێنێتەوە بەبێ ئەوەی هەستبكات سروشی بۆ دێت ئەوەندەی كە پێویستییەتی لەڕێگایەكی ناڕاستەوخۆوە.



دەڵێن هەندێ لەوتاربێژە ناودارەكان كاتێ ڕادەوەستان بۆ وتار خوێندنەوە ئەوا خۆیانیان لەبیردەچوویەوە، تەنانەت لەسەرمای زستانیشدا عارەقیان دەكردەوە [٢٧].

جارێكیان پرسیارم كرد لەیەكێ لە وتاربێژەكان سەبارەت بە نهێنی ئەو وتاربێژییەی، لەوەڵامدا وتی: لەكاتێكدا دەچمە سەر سەكۆی وتارخوێندنەوە نازانم چی دەڵێم. چونكە ئەو لەو چركە ساتانەدا هاوشێوەی رادیۆیەكەو شەپۆلەكانی وێستگەی پێدەگات لەوێستگەكانی ئیزاعەوە.

ئەویش لەو كاتانەدا دەچێتە نێو هاوشێوەی لەهۆشخۆچوونێك یان دابڕانو بێئاگاییەكی واوە كە لەوانەیە بەم رێگایە زیهنی پاكو بێخەوش بێتو ئامادەبێت بۆ وەرگرتنی شەپۆلە دەروونییەكان لەئامادەبووانەوەو وەڵامدانەوەیان لەسەر ئەو بەدیهیاتانەی خۆی كە پێویست بە خۆخەریككردنو دروستكردن ناكات.

وتاردانی سەرپێیی یان موحازەرە یان مێزگرد یان هەر شتێكی لەم بابەتانە پێویستی بەئیلهام بەخشی نەست هەیە زیاتر وەك لەوەی پێویستی بەهەر شتێكی تربێت. هەرچەندە لەوانەیە بۆ ئامادەباشیو ڕەوانكردنی شتەكان لەم جۆرە حاڵەتانەدا پێویستی بە پێشینەو خۆ تەیاركردن هەبێت. وتاربێژی بەناوبانگ پێش خوێندنەوەی وتارەكەی خۆی ئامادەدەكاتو بگرە هەندێ زانیاری كۆدەكاتەوە لەبارەی وتارەكەیەوەو دەیان نوسێتەوە لەسە ر پارچە كاغەزێكی بچووك، بەڵام لەو كاتەدا ڕادەوەستێ بۆ وتاربێژیو قسەكردن پابەند نابێت بە هیچ شتێك لەوانەی كە پێشتر بیری لێ كردۆتەوەو خۆی بۆ ئامادە كردووە.

بەڵام دەشێ هەندێ جار پەنابەرێتە بەر ئەو زانیارییانەی وا لەپارچە كاغەزەكەدا نوسیویەتی بە كورتی لەكاتێكدا كە رادەوەستێت لەكاتی وتار خوێندنەوەكەیدا، چونكە زیهنی وتاربێژیش قابیلی وەستانە لەكوتوپڕدا هەروەك چۆن رادیۆیەك كوتوپڕ دەوەستێت لەئیشكردن. بۆیە ئەو وتاربێژە لەوەها حاڵەتێكی كتوپڕو حەریجدا پێویستی بە هۆكارێك هەیە تا بگەڕێتەوە سەریو بە دزە نیگاوە لێی بڕوانێت.

بەداخەوە دەبینین هەندێ خەڵك هەن هەوڵدەدەن لەهەموو شوێنێكدا وتار بدەنو خۆیان لەهەموو ئاهەنگێكدا دەرخەن یان (خۆیان دەخزێننە هەموو بۆنەیەكەوە). چونكە ئەوانە وا گومان دەبەن كە داهێنانو بلیمەتیی وتاربێژی پیشەسازییەكی لۆژیكیەو دەتوانێت هەر كەسێك بۆ خۆی دروستی بكاتو لەقسەكانیدا لەسەری بڕوات لەسەر بنەمایەكی بیركردنەوەی راستو دروست. بۆیە ئەو جۆرە كەسانە كاتێك وتاربێژی

لێهاتوو دەبینن هەوڵدەدەن لاسایی بکەنەوە لەسەر ئەو ئیعتیبارەی ئەگەر بیروبۆچوونێك جارێك بەلای گوێگرانەوە سەرنجراکێش بێت ئەوا بەهەمان شێوە جارێکی تریش سەرنج ڕاکێش دەبێت، بەڵام دەرك بە نهێنی ئەو وەڵامدانەوە نەستییە ناکەن کە ڕوودەدات لەهەڵوێستێك لەهەڵوێستەکانی وتاربێژیدا لەنێوان وتاربێژی لێهاتوو دەروونی گوێگرەکانیدا. ئەو بیرۆکەیەی وتاربێژ دەیڵێت وا دەبێت رایەڵە دەروونییەکانی زیاتر تێدابێت وەك لەمانای لۆژیکی. وەك ئەوەی شتێك دەڵێن لەهەڵوێستێکدا لەوانەیە بەکەڵك نەیەت هەمان شت بڵێت لەهەڵوێستێکی تردا هەرچەندە وێکچوونێکی شێوەیی گەورەش هەبێت لەنێوان هەردوو هەڵوێستەکەدا.

دەگێڕنەوە (عەنتەرەی عەبەسی) کە بەناوبانگبووە بە پاڵەوانێتی لەرۆژانی نەزانیدا (جاهیلیدا) رۆژێکیان پێیان وت:- ((تۆ لەئازاترینی عەرەبیتو لەهەمووشیان دڵرەقتریت)). وەڵامی دانەوە: ((نەخێر)). پێیان وتەوە:- ((کەواتە چۆن ئەم ناوبانگەت بڵاوبوویەوە بەناو هەموو خەڵکیدا؟)) لەوەڵامدا وتی:- ((ئەم ناوبانگەم بەدەستهێناوە لەئەنجامی شوێنکەوتنم لەشەڕدا لەسەر سێ بنەما کە بەکاریان دەهێنم)).

یەکەم: من دەچمە پێشەوە ئەگەر هاتوو بینیم هیچ هەنگاوێکم لەپێشەوە نییە، هەروەها دەشکەڕێمە دواوە ئەگەر بینیم هیچ هەنگاوێك نیە لەدوامەوە بۆ گەڕانەوە.

دووەم: من ناچمە ژوورەوە بۆ هیچ شتێك تەنها ئەگەر بێتوو رێگای چوونەدەرەوەی تێدا بەدی نەکەم.

سێهەم: ((من یەکەمجار هێرش دەکەمە سەر لاوازەکانو لێیان دەدەم لێدانێکی وەها چاوترسێن کە دڵی ئازاکان داخورپێنێتو بێنە سەر چۆك پاشان دەگەڕێمەوە سەر ئازاکانو لێیان دەدەم))[٢٨].

لەڕاستیدا ئەم سێ بنەمایە کە دەدرێتە پاڵ عەنتەرە، راستبێت یان درۆ، شایانی ئەوەیە هەموو وتاربێژێك یان مێژگردەوانێك یان محازەرچییەك یان جگە لەمانەش شوێنەکەوتەی بن تەنانەت هەوادارانی هونەری قسەزانیش.

وتاربێژ پێویستە خۆی هەڵنەقورتێنێتە هەموو بۆنەو کۆبوونەوەیەك یان دەنگی زوڵاڵی خۆی هەڵبڕێت لەهەموو بۆنەو نابۆنەیەکدا، کەواتە شایانی ئەوەیە وەك عەنتەر وابێت:-

((من دەچمە پێشەوە ئەگەر هاتوو بینیم هیچ هەنگاوێکم لەپێشەوە نییە، هەروەها دەشگەڕێمەوە دواوە ئەگەر بینیم هیچ هەنگاوێك نیە لەدوامەوە بۆ گەڕانەوە)).

پێویستە ئەو حاڵەتە رابەری بێت لەو پاڵنەرانەدا کە هەڵدەقوڵێن لەقوڵاییو ناخی عەقڵی ناوەوەیدا. بیرکردنەوەی لۆژیکی لەوەها حاڵەتێکدا دەبێتە هۆی وەستان لەسەر هەڵوێستی بێ ئابڕوویی (گەڕێتی)و مشەخۆریو ئەوجا قێزەونو بێزراو دەبێت پەنا بەخوا.

هەروەها وتاربێژ شایانی ئەوەیە نەچێتە هیچ شوێنێکەوە ئەگەر هاتوو دەرچەیەکی تێدا نەبێت بۆ چوونە دەرەوە، تا لەکاتی وتارخوێندنەوەدا پەنای بەرێتەبەر لەحاڵەتی وەستانو دۆشداماندا، هەروەها بەرکەوتە بێت پێی لەهەڵوێستی زۆر حەریجداو روانینی خۆی هەلگەڕێنێتەوە لەخەڵك بەبێ ئەوەی بتوانێت بەشتێك خۆی لێ قوتاربکات. لەم بەرکەوتەیەشدا وەك ئەو مشکەی لێ دێت گەیشتە جیوەکە. کارامەو لێهاتوو ئەوەیە کە پێش خوێندنەوەی وتارەکەی بیرۆکەیەکی دیاریکراوی بۆ خۆی ئامادەکردبێت یان چەند سەرە قەڵەمێکی دەستنیشان کردبێت تا پەنایان بەرێتەبەر لەکاتی پێویستدا ئەمەش هاوشێوەی ئەو هێڵی گەڕانەوەیەیە کە جەنگاوەران لەکاتی تێکشکانو هەرەسدا لێوەی دەگەڕێنەوە بۆ دواوە.

دووبارە وتاربێژ شایانی ئەوەیە یەکەمجار لەدەرگای ئەو بیرۆکەیە بدات کە جێگای مەترسییە بۆی. هەروەك چۆن هەمیشە لۆژیکییەکان پەنایان دەبردە بەر لەپۆلێنکردنی بیرو بۆچوونەکانو رێکخستنیاندا، بەشێوەیەك لێیاندەدا یەك لەدوای یەك لەسەر ئەو شێوازەی کە پێشتر بۆیان ئامادەکردبوو، کە زۆرجار دەبوویە هۆی لاوازکردنی هەڵوێستی وتاربێژو قەدەغەکردنی لەبەرهەمهێنانی پاڵنەرە داهێنەرەکانی.

هەروەك چۆن عەنتەرە دادەبەزییە سەر پاڵەوانەکانو یەکەمجار دەیدا لەلاوازەکانیانو بەمەش بەهێزەکانی بۆ نەرم دەبوو لەپاشاندا. بیرو بۆچوونەکانیشی (ئەفکارەکانیش) وەك پاڵەوانەکان پێویستیان بەهەمان پێچو دەورە هەیە بۆ چوونە پێشەوە لێیان. لەوەدا کە یەکەمجار وا دەردەکەوێت زۆر نارەحەتو گرانبێت بەڵام هەر ئەوەندە یەکێکیانت بەکارهێناو ئاشنای بوویت، هەتا وای لێدێت پاشماوەی هەموو فیکرەکانی تر لەنێوان

دەستو پەنجەتدا نەرمدەبن بەشێوەیەكی پلەكاری (تەدریجی) یەك لەدوای یەك. هەروەها نوسەریش پێویستی بەم جۆرە پێچو دەورمیە هەیە بۆ چارەسەركردنی نوسینەكانی.

زۆر جێگـای شـەرمە كـەدەبینین مامۆسـتایانی زمـانی عـەرەبی لەقوتابخانەكانـدا قوتابییەكانیان رادێنن لەسەر هونـەری نوسـینو دارشـتن بـە راهێنـانێكی هەڵەو چەواشـە، ئەوان قوتابیان فێر دەكەن چۆن چاودێری زنجیرەی لـۆژیكی بكـەنو لـەپێش چـاوی بگـرن لەنوسینەكانیانداو كاریگەری پاڵنەرە نەستییەكانیان پشتگوێ بخەن، بۆیـە دەیـانبینین بـۆ دارشـتنی وتارێـك نموونەیـەكی پێوانـەكاری خـۆ پـڕوكێن دادەنـێن كـە دەسـتپێدەكات بەپێشەكیو تەواودەبێت بە پاشەكی(واتە: وتارەكە پەیوەسـت دەبێـت بـە لەبەرچـاوگرتنی مەرجەكانی نوسینی پێشەكیو پاشەكیو دادەماڵرێـت لەمەبەسـتی دیـاریكراو. و: كـوردی)، بـەبێ ئـەوەی دیـدی قوتـابی ئاگادارکاتـەوە لـەوەی كە ئاوڕبداتـەوە لـەگرنگی ئـەو سروشە ئیلـهام بەخـشەی خـەیاڵی خـۆی كـە ناگونجێـت لەگـەڵ پێـشەكیو پاشـەكیداو پێویـستی بەگەڕانەوە نیە بۆ سەر پێوانەكاریو ریزبەندی.

شارەزایان لەبواری نوسینی نوێدا دەڵێن:- یەكەمین شتێك كـە دێـت بەخەیاڵتـدا لەسـەر زیهنی خۆت بینوسە، درێژە مەدە بەوەی كە دەینوسی، ئەو كاتە دەبینیت پاش چـركەیەك پێنوسەكەت رۆچۆتە نێـو باسـەكەوە بەڕۆچوونێكی سەرسوڕهێنەر بەشـێوەیەكی وا پـاراو دەنوسێت كە بەهیچ شێوەیەك خۆیشت لەوەو پێش بڕوات نەدەكرد وابنوسێت.

گرنگیدان بە پۆلێنكاری دەستكردو ریزبەندی لۆژیكیو رێكخستنی پێـشەكیو پاشـەكی دادەنرێـت بـە هاوشـێوەی ئـەو بەردانـەی كـە دادەنرێـت لەبـەردەم شـەپۆلەكانی رووبـارداو دەبنە كەندو كۆسپی رێگای رۆیشتنی. پێویـستە داڕێـژەر (نوسـەر) ئاگـاداری حەقیقـەتێكی گـەورەبێت لەهونـەری نوسـیندا ئـەوەش:- داهێنـان شـتێكی خەیاڵبەخـشە یـان (داهێنـان بەرەنجامی هەڵقوڵاوە نەستییەكانە). هەرشتێك تەگـەرە بخاتـە بـەردەم بەخششی خـەیاڵ بەدەوری خۆی هەڵدەستێ بە كەمكردنەوەی داهێنان.

رێگای داهێنان لەنوسیندا پێویستی بەسێ قۆناغ هەیە:-

١. قۆنـاغی یەكـەم: بریتییـە لەتوێژینـەوەی هۆشـیاریو پاڵفتـەكردنو كۆكردنـەوەی زانیارییـەكانو پۆلینكردنیـان. ئـەم قۆناغـە بەتـەنها خـۆی بـەس نیـە بـۆ داهێنـان بـەڵكو هەنـدێجار پێویـستە. دەشـكرێت نـاوی لێ بنـێن قۆنـاغی هـەلگرتن یـان (كۆكردنـەوە) وەك

گەنجینەیەك. عەقڵی نادیار (ناوەوە) کارناکات‌و بەتاڵە. پێویستە یەکەمجار پڕکرێتەوە بە ناوەڕۆکە هەمەجۆرەکان. دەشێ ئەم ناوەڕۆکانەش هاوشێوەی ماددە سەرەتاییەکان (خامەکان)بێت کە کاڵاکانی لێ دروستدەکرێت لەکۆتاییدا.

(مازنی) دەڵێت:- نوسەر وەك ئۆتۆمبیلی ئاوپرژێن وایە، هەر دەبێت بخوێنێتەوە بۆئەوەی بنوسێت. ئەم وتەیە راستە بۆ ماوەیەکی دوور. وەیل بۆ ئەوخوێنەرانەی کە نوسەرەکانیان لەونوسەرانەن وا ناخوێننەوە. ئەو نوسەرەی زانیارییەکان گرد ناکاتەوەو هەڵیاننناگرێت لەعەقڵی ناوەوەیدا ئەوا وەك ئەو مەشکە فوتێکراوەی لێدێت کە:- چاوەڕێی ئەوە دەکات پڕبێت لەئاوو هەواکەی ناوی بێتە دەرەوە —بەداخەوە-.

٢. قۆناغی دووەم: بریتییە لەقۆناغی هەڵقوڵینی ناهەستی: نوسەر دوای ئەوەی زانیارییەکان کۆدەکاتەوە لەعەقڵی ناوەوەیداو لێی دەگەڕێت تا دەترشێت‌و یەقدەداتەوەو (هەڵدێت)و پیتێنەکردار ڕوودەدات، پاشان خۆی دەبینێتەوە پاڵنەرێك پاڵی پێوە دەنێت بۆ نوسین خۆشی نازانێت لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە ئەو دەیەوێت بنوسێت تەنانەت ئەگەر لەو پێناوەشدا سەری تیابچێت، وەك ئەوەی بڵێی بووە بەکۆیلەیەك بۆ پاڵنەرە نەستییەکانی‌و دەقێك شکنابات تا بگەڕێتەوە سەری‌و لەو کاتەدا پێنوسەکەی دەبێتە گەورەی ملکەچبووان‌و بۆ هەر شوێنێك ئارەزوو بکات لەگەڵ خۆیدا دەبات.

٣. قۆناغی سێهەم: بریتییە لەقۆناغی ڕێکخستن‌و رازاندنەوە سەلیقەی لۆژیکی. ساتەوەختی ئیلهام‌و بەهرە بەزۆری کۆتوبەندی لەسەر نیەو قیرسیچمەیەو بەشێوەیەك بواری خاوەنەکەی نادات کە بیربکاتەوە لەنوسینەکانی خەڵك‌و ئەو لێوەرگرتنەی کەئەم لەخۆیدا گەڵاڵەی کردووە، لەقۆناغی کۆتاییدا پێویستە لەسەر نوسەر پێداچوونەوەیەك بکات بەسەر ئەو نوسینەدا کە لەساتەوەختەکانی ئیلهامدا نوسیویەتی‌و بەشێکی لێ بسڕێتەوەو رازاندنەوەو جوانکاری بکات لەبەشەکەی تریدا. بەمەش نوسەر لەم قۆناغەدا لەجیهانی نەست دەچێتە دەرەوە بۆ جیهانی هەست...ئەوجا دەبێتە کەسێکی کۆمەڵایەتی پاش ئەوەی کەسێکی عەبقەری بوو...

 

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١. بڕوانە: Dewey, Logic, p.٨١.

٢. بڕوانە: Oleaey, Arabic Thought…, p.١٥٣.

٣. بڕوانە: Macdonald, The Development Of Muslim The Ology…, p.٢٥١.

٤. بڕوانە: Thomas, op.cit, p.٩٩.

٥. ئەمە بە کەسێك دەوترێت کە ئەو کەسە موتەدەین بێتو ئەگەر بیەوێت ببێتە نیشتمانپەروەر ئەوا پێوانەکارییە لۆژیکییەکەی دەگوازێتەوە بۆ دژایەتیکردنی ئەوانەی زیان بە نیشتمان دەگەیەنن. لەڕاستیدا ئەو بانگەشە دەکات بۆ دژایەتیکردنی ئەوانەی کە رقیانە لێی، بۆیە لەم پێناوەدا تۆمەتی ئەوە دەداتە پاڵیان گوایە ئەوە زیان بەئایینو نیشتمان یان هەرشتێکی تر دەگەیەنێت.

٦. بڕوانە: Thomas, op.cit, p.٩١.

٧. هەمان سەرچاوە p.١٠٢.

٨. بڕوانە: احمد امین- ضحی الأسلام- ج٣. ص٣٤٩-٣٥٠.

٩. بڕوانە: ابن خلدون –المقدمە- ص٣٩٢.

١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو ص٥٤٣.

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو ص٥٤٢.

١٢. بڕوانە: Joad, Guide to philosophy, p.١٤٢.

١٣. بڕوانە: DEWEY, Logic, p.٨٤.

١٤. بڕوانە: Kluckhohn and murray personality, p.٤.

١٥. بڕوانە: Mead, Movement of Thought…, ch.٧.

١٦. چەمکی چاکسازی لای ئیبن خەلدون جیاوازە لەچەمکی چاکسازی لای فەقیهەکانو لۆژیکییەکان، ئیبن خەلدون وەك پێوانەچیەکان وایە لەم رووەوە، لەوەدا چاکسازیو سەرکەوتن دەگەڕێنێتەوە بۆ یەك سەرچاوە.

١٧. بڕوانە: ئیبن خەلدون — المقدمە- ص١٧٠-١٧١.

١٨. لەبەر ئەم هۆیە لۆژیکی کۆن ناو دەبرێت بە لۆژیکی دوو فاق (دووسەر) یان جمکە لۆژیك (bivalent) بە بەراود لەگەڵ لۆژیکی نویٚ کە خاوەنی سنوری زۆرە (polyvalent).

١٩. بڕوانە: Schiller, Formal Logic, p.٢٩٨-٩٩.

٢٠. بڕوانە: جینز- الكون الغامج (ترجمە عبدالحمید مرسی)ص٦٣.

٢١. چاکترە زیاتر روونکردنەوەی لەسەربکەین بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەش بریتییە لەو دەنگە زۆر نزمانە یان ئەو دەنگە زۆر بەرزانە. بەڵام ئێمە نایان بیستین چونکە لەدەرەوەی ئەوهێزو توانایەدا کە دەمارەکانی بیستنمان پێی کاریگەربن. لەگەڵ ئەوەشدا هەیە دەیبیستێت لەوانەی وا دەمارەکانیان وردترن لەدەمارەکانمان بەشێوەیك لەشێوەکان.

٢٢. لەبەشی داهاتوودا دێینە سەر باسی شێتی بەشێوەیەکی دوورو درێژ. دەکریٚ لێرەدا بەکورتی پێناسەی شێتی بکەینو بڵێین:- ((بریتییە لەنقومبوون لەخودی خودداو کەمی دانپیانان بە ناخودا)).

شێتێتی زۆر توندو بەهێز ئەوەیە کە جیهانێکی تایبەت بۆ خاوەنەکەی دەخولقێنێت کە ئاکارو پەندو ئامانجی خۆی هەیە، بە شێوەیەك بەربەستی تێگەیشتنی لەجیهانی دەرەوە لێدەکاتو هەواداری نابێت، بەم پێودانگە هەمووومان شێتین بەڵام لەسەر پلەی جیاواز. هیچ کەسێك لەئێمە خاڵی نیە لەوەی کە رۆبچێتە نێو خودی خۆدی خۆیەوە کەمبێت یان زۆرو پشتگوێخستنی چەمکەکانی کۆمەڵگا جاروبار. ئەو پشتگوێخستنەی تاك هەیەتی بۆ چەمکەکانی کۆمەڵگا ئاکارەکەی ئەوەیە کە کۆمەڵگا بانگەشەی بۆ دەکات بە شورەیی‌و نەنگی‌و دایدەنێت بە شورەیی (شێتبوون).

هەرچەندە زۆری شێتەکان لەکۆمەڵگادا بگاتە ئاستێك کە تەنها کەسێکی تێدا بمێنێت عاقڵ بێت ئەوا لەوانەیە ئەو کەسە شێت بێتو هەموو ئەوانی تر عاقڵبن.

٢٣. سەبارەت بەم بیرۆکەیە بڕوانە کتێبی((کەسایەتی تاکی عیراقی)) نوسینی: د. عەلی وەردی.

٢٤. لێرەدا مەبەستمان لەم زاراوەیە جیاوازە لەو مانایەی کە زانایانی دەروونناسی مەبەستیانە، ئێمە مەبەستمان لەوە نیە (کەسێتی دوو فاق) نەخۆشییەکی دەروونی بێت، بەڵکو راشکاوانەتر مەبەستما لێی ئەوەیە کە ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە لەزۆر کۆمەڵگادا هەیە، وەك کۆمەڵگای خۆمان، هەروەها هۆکارەکانی دەروونیو کۆمەڵایەتیو شارستانی خۆی هەیە. بۆیە دەگونجێ لۆژیکی ئەرستۆ دابنرێت بە هۆکارێکی گرنگ لەبەرهەمهێنانی ئەم دیاردەیەدا لەوەدا کە تاك رادەهێنێت لەسەر ئەوەی کە لەسەر شێوازێکی بیرکردنەوەی وا بڕوات جیاوازبێت (دژبێت) لەواقیعی ژیانو بەمەش ئەو کەسە دووکەرت دەبێت لەدەروونی خۆیداو لەسەر شێوازێك بیردەکاتەوەو لەسەر شێوازێکی تر کارەکانی ئەنجام دەدات.

٢٥. بڕوانە: مختار المختار –هل انت حی-ص٧.

٢٦. بڕوانە: Rhime, The Heach of the mind.

٢٧. بڕوانە: جرجی زیدان- التمدن الٳسلامی، ج٢، ص٣١.

٢٨. بڕوانە: یعقوب صروف، سرالنجاح، ١٦٤.

بەشی سێهەم

# ئیرادەو سەرکەوتن

هەر لەدێر زەمانەوە زۆربەی بیریاران لەسەر ئەو رایەن کە ئیرادە رۆڵێکی گرنگی هەیە لەپێناوی سەرکەوتندا. هەروەها هەموو شکستەکانیان داوەتە پاڵ لاوازی ئیرادەو کەمی کۆششکردن لەوپێناوەدا، بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتن پێویستە بەجددی هێزو توانای خۆت بخەیتە گەڕو عزمت جەزمکەیت لەئیرادەو ویستی خۆتدا بۆ گەیشتن بەو ئاواتە.

بۆیە دەبینین کتێبە عەرەبییەکان لەکۆن‌و تازە سیخناخن لەم بیرۆکەیە. روو لەهەر شوێنێك بکەیت دەبینیت لەسەر ئەم تەرزە ئامۆژگاری دەکرێیت: سەرکەوتن لەکۆڵنەداندایە، لەسەر هەر شێوازێك بڕۆیت دەگەیت بەو شێوازە، گرنگی لەگرنگیپێدانەوە دەستدەکەوێت‌و بێبەشبوون ئەنجامی تەمەڵییە، کێ هەوڵی دابێت‌و داواکاربێت ئەوا مەبەستی خۆی بەدەستهێناوە، ئەوەشی کە سەرکەوتنی بەدەستنەهێناوە دەیگەڕێننەوە بۆ هێزی ئیرادەی خۆی...بابەتی تر لەم جۆرە قسە زلانە کە لەلایەن‌و سوڵتان‌و پادشایان‌و خاوەن کۆیلەکانەوە کراون‌و کردویانە بە مەزەندە بۆ خۆیان‌و دەست‌و پێوەندو هەموو خەڵکی هەژارو نەدار.

لەسەرەتای ژیانی سیاسی نوێی عێراقدا کۆمەڵێك لەم بڕیارو ئامۆژگارییە پڕوپوچانەمان بینیوە. هەروەها کتێبەکانی قوتابخانەش پڕیانە لەم جۆرە قسانەو ئەمە سەرەڕای ئامۆژگارییەکانی مامۆستایان کەبوونەتە مایەی سەرێشە بۆمان زیاد لەپێویست. ئەو برادەرانەی وا بارودۆخێکی شاز یان رێکەوت یارمەتیداون بۆ بەدەستهێنانی پلەو پایەی بەرز ئەوا ئیتر بە لوتبەرزی‌و کەش‌و فشەوە دەڕوانن بۆ کەسانی دەورو بەریان لەبێنەوایان‌و هەژاران‌و بە چاوێکی سوکەوە سەیریان دەکەن‌و خۆیان رادەوەشێنن بە

 

سەریاندا گوایە ئەوان ئەم پلەو پایەو سەرکەوتنەیان بەهۆی کۆشش‌و ماندووبون‌و هێزی ئیرادەی خۆیانەوە بەدەستهێناوە.

زۆربەی ئەم کەسانە ئەوانەن کە لەجەنگی جیهانی یەکەمدا دابویانە پاڵ ریزەکانی دەوڵەتی عوسمانی‌و دژی دوژمنەکانی ئەم دەوڵەتە دەجەنگان. بۆیە لەئەنجامدا بەخت یاوەریانبوو ئەم دەوڵەتە سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەو جەنگەداو ئەمانەش لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنەدا بەرزکرانەوە بۆ پلەو پایەیەکی وا کە خەویشیان پێوە نەدیبو، بۆیە دوایی وایان لێهاتبوو لەزۆربەی کات‌و ساتەکانی ژیانیاندا قسەیان لەسەر ئەو خەبات‌و تێکۆشانە رابردووەی خۆیاندەکردو وەك نموونە لەقسەکانیاندا ئاماژەیان بۆ دەکردو پاشان پڕ بەدەم هاواریاندەکرد: ئەمە بەرهەمی ئیش‌و کارو ماندوبون‌و کۆڵنەدانی خۆمانە!...

بێتو گەر بهاتایە ئەو جەنگە جیهانییە پێچەوانەی ئەوە کۆتایی بهاتایە کە کۆتایی هات بەکردەیی، ئەو کاتە ئەم حاڵەتە هیچ دەستێکی ئەمانەی تێدانەدەبوو لەشکستیانداو چارەنوسیشیان وەك چارەنوسی ئەوانەی لێدەهات کە ئێستا ئەمان پێیان دەڵێن خۆفرۆش‌و هەڵگەڕاوەکانی دژی دەوڵەت.

زۆربەی ئەو کەسانەی بواریان بۆ رەخساوە یان بەهۆی ماڵ‌و داراییەکی زۆر یان ناوەندێکی بەهێز یارمەتیدەریانبووە بۆ بەدەستهێنانی ئەو بەخت‌و چارەنوسە، بەڵام هاوڕێکانیان ئەم بەخت‌و چارەنوسە باشەیان بۆ فەراهەم نەبووە، لەبەرئەوە تەماشا دەکەیت ئەو جۆرە کەسانە بەلوتبەرزی‌و بایی هەواییەوە دەڕواننە خەڵك‌و تڕوفیز لێئەدەن بەسەر خەڵکیدا گوایە ئەو سەرکەوتن‌و بەدەستهێنانەیان بەهۆی هەوڵ‌و کۆشش‌و ئارامگری‌و ویست‌و ئیرادەی خۆیانەوە چنگ کەوتووە- بەڵام ئەوەیان لەبیرچووە کە بەهۆی کاریگەری بارودۆخی لەبارو گونجاوی دەوروبەریانەوە بووە کە تێیدا بوون هەر لەسەردەمی پێگەیشتنیانەوەو ناویانی خستۆتە لیستی خوا پێداوان‌و خۆشگوزەرانانەوە... لەم وڵاتە هێمن‌و ئارامەدا!...

هەندێ لەو بەختەوەرانەی وا بارودۆخ یارمەتیدەریانبووەو چونەتە قوتابخانەو بەسەرکەوتوویی تەواویانکردووەو بڕوانامەی باشیان وەدەستهێناوە تێیدا دەڵێن: ئێمە بە هەوڵ‌و کۆشش‌و خوێندنی جددی خۆمانەوە ئەم سەرکەوتنەمان بەدەستهێناوەو ئەمەش پاداشتی ئەو ماندووبوون‌و کۆششەمانە کە ئەمڕۆ دەیخۆین‌و لەسێبەریدا دەحەسێینەوە

چونكە ئێمە لەكاتی خوێندنەكەماندا ئارامگرو بەئیرادەو توانای بەهێزەوە چوینەتە پێشێ لەهەموو كاتێكدا بۆیە ئێستا ئەم تاجی سەركەوتنەمان لەسەرناوەو ئاسوودەین. بەڵام دیسان ئەوەیان لەبیرچووە كە ئەو كابرا هەزارە هەوڵ و تێكۆشان ئەدات لەرۆژانی هاوین و قرچەقرچی گەرمادا هەر لەكازیوەی بەیانییەوە تا خۆرئاوابوون بەكوڵ خاك و خۆڵ و خشتی سور دەگوازێتەوەو ئارەق بەگیانیا دێتە خوارەوە، ئەم زیاتر لەوان خۆگرتوو ئیرادەی بەهێزترە.

جارێكیان هەندێ منداڵم بینی كرێكاریاندەكرد لەدروستكردنی خانوویەكدا كە بەشیلاق و دار ناردبونیان بۆ ئیشكردن لەژێر گەرمای پڕوكێنەری هاویندا، ئەمانە لەبەر هەژاریان نەیان توانیبوو بچنە قوتابخانە هەروەك چۆن برادەرانی خواپێداو ڕۆیشتبوونە قوتابخانەو بۆیان لوابوو. ئەمە هیچ سوچ و تاوانی ئیرادەی ئەوانی تێدا نیە كە ئێستا ئەمە چارەنوسیانەو باجەكەی ئەدەن بەم شێوەیەو بە ئازارو كولەمەرگی ژیان بەسەر دەبەن، بەڵكو ئەوانە بوونەتە قوربانیی ڕۆژگارو ئەو بارودۆخەی كە تێیدا لەدایكبوون[١].

هەموو سەركەوتوویەك توشی لوتبەرزی و لەخۆباییبوون دەبێت جائیتر كەمبێت یان زۆر، بۆیە دەبینیت شانازی ئەو سەركەوتنەی دەگەڕێنێتەوە بۆ دووربینی و هەوڵی زۆرو هێزی ئیرادەی خۆی. بەڵام لەواقیعدا چەند هۆكارێكی تر هەیە سەرەڕای ئەم هۆكارانە بۆ گەیشتن بەسەركەوتن كە هەمیشە سەركەوتوان لاف و گەزافی پێوەلێدەدەن.

هەرچەندە گەر پرسیاربكەیت لەهەریەكێك لەوانەی وا ئەو پلەوپایە بەرزو ناوو ناوبانگە گەورەیان بەدەستهێناوەو پێیان بڵێیت: ((ئایا لەسەرەتای ژیانتدا دووربینی و چاوەڕوانی ئەم پلەوپایەتكردووە تا خۆتی بۆ ئامادەبكەیت و هەوڵی بەدەستهێنانی بدەیت؟)) ئەوا وەڵامت ئەداتەوە بە نەخێرو گومانێكی زۆر لاوازە.

زۆر بەدەگمەن هەڵدەكەوێت كەسێك بدۆزینەوە كە لەسەرەتادا نەخشەو پلانی دانابێت بۆ كارەكانی و لەسەری بڕوات هەنگاو بەهەنگاو تا لەكۆتایدا سەركەوتن بەدەستبێنێت لەسەر ئەو بنەماو بنچینەیە. زۆرینەی خەڵك لەسەرەتای ئیش و كاریاندا ڕوودەكەنە ئامانجێك و پاشان بۆ دواجار لێی لائەدەن. چونكە واقیعی ژیان بەهێزترە لەهەر هەنگاوێك كە عەقڵێكی سنوردار داینێت. زۆرجار مرۆڤ دەكەوێتەبەر تەوژمی شەپۆلەكانی ژیان و لەگەڵیاندەڕوات بەگوێرەی پێویستییەكانی كات و ڕۆژگار، هات و گەر سەركەوتنی

 

بەدەستهێنا لەرێی رێکەوتەوە ئەوا دەبینیت خۆی لێ بالآنی دەبێت‌و روو وەردەگێرێت لەخەڵك‌و دەیانداتە بەر پلارو توانج‌و سەرکۆنەکردن بەو پێیەی گوایە ئەو بێ بەختی‌و چارەرەشییەیان بە دەستی خۆیان دروستکردووەو پێوەی دەناڵێنن.

سەیر لەوەدایە کە (بەخت) کەس بڕوای پێی نیە تەنها شکستخواردووەکان نەبێت. بۆیە هەوڵدەدەن کە لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەو شکستەیان دەستکەوێت‌و حەزیشناکەن مەبەستی ئەو شکستەیان بدەنە پاڵ بیر تەسکی خۆیان، بۆیە بەناچاری پەنادەبەنەبەر بیروباوەڕی بەخت‌و هۆکاری شکست‌و بەدبەختییەکەیان دەگەڕێننەوە بۆ بێ بەختی خۆیان. بەڵام کەسانی سەرکەوتوو لەخۆی بایی دەبێت‌و هەروەك باسمانکرد، هۆکاری هەموو سەرکەوتنەکانی دەگەڕێنێتەوە بۆ خۆی‌و دەیانداتە پاڵ ئیرادەو لێهاتوویی خۆی.

کەسانی شکستخواردوو باوەڕیان بەبەخت هەیەو بەڵام کەسانی سەرکەوتوو باوەڕیان پێی نیە، بۆیە ئێمە لەنێوان ئەم دوو هەڵوێستەدا رادەوەستین‌و (ناوەندە هەڵوێست) وەردەگرین‌و هەوڵدەدەین کە لەهەر یەکە لەو دوانە ئەوەندە فێربین کە شایانی فێربوونە لێوەی لەهەموو رووەکانی ژیانەوە.



لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا خوالێخۆشبوو (یعقوب صروف) نوسەری ناسراوی میسری هەڵسا بە وەرگێرانی کتێبێکی ئینگلیزی‌و ناوی نا(سر النجاح- نهێنییەکانی سەرکەوتن)و برەوێکی زۆری هەبوو لەنیشتمانی عەرەبیدا زیاد لەپێویست، ئەمەو هەروەها پێشتریش برەوێکی زۆری هەبووە لەولآتانی خۆرئاواداو بۆ زۆر لەزمانە زیندووەکانی ئەوێش وەرگێردراوە. ئەم کتێبە زۆر تەئکید لەسەر گرنگی ئیرادەو کۆشش‌و خەبات دەکاتەوە بۆ حاڵەتی سەرکەوتن بە تەئکیدکردنەوەیەکی زۆر گەورە، هەر بۆیە نموونەی زۆرمان بۆ دێنێتەوە لەسەر سەرلماندنی راستییەکانی ئەو شتانەی کە دەیڵێت.

ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەوانەی کە ئەم نوسەرە دەیڵێت: ((ئیرادە بریتییە لەو شتەی کە توانا دەبەخشێتە مرۆڤ بۆ ئەنجامدانی کارێك کە بیەوێت ئەو کارە ئەنجامبدات. دەگێرنەوە: دارتاشێك دەبێت خەریکی دروستکردنی کورسیەك دەبێت بۆ قازییەك (دادوەرێك)و زۆر خۆی پێوە خەریك دەکات‌و جوانکاری تێدا دەکات زیاد لەپێویست، پێی

دەڵێن بۆچی ئەوەندە خۆتی پێوە خەریکدەکەی؟ دەڵێ: چونکە ئەمەوێت رۆژێك بێت لەسەری دانیشم، بەم شێوەیە زەمان هاتو چوو ئەو دارتاشە رشتەی مافی خوێندو بوو بە قازیو لەسەر هەمان کورسی دانیشت. پێویست ناکات ئەو بەڵگانە بێنینەوە کە لۆژیکییەکان پێی هەستاون لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ ئازادە لەئیرادەو توانای خۆیداو هەموو مرۆڤێکیش هەست بەوە دەکات ئازادی پێ دراوەو سەرپشکە لەوەی چاکە یان خراپە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت.

مرۆڤ پارچە کاغەزێك نیە فرێیدەیتە نێو دەریایەکەوە تا ئاراستەی ئاوەکەی پێ دیاری کەیتو بزانیت گوری تەوژمی شەپۆلەکانی چەندە، بەڵکو مرۆڤ مەلەوانێکی چالاکەو بەرهەڵستی رێرەوی شەپۆلەکاندەکاتو لەگەڵیاندا دەکەوێتە زۆرانبازی بە هێزی باسکەکانیو لەسەر ئەو ئاراستەیە دەروات کە خۆی دەیەوێت. بەڵێ ئێمە ئازادو سەربەستینو ئازادی ئەدەبیمان هەیە بۆ ئەو شتەی کە دەمانەوێت کاری تێدابکەینو ئەنجامی بدەین بۆیە وابەستەنین بە تەلیسم یان جادوو (سیحر)ەوە تا بمانبەستێتەوە بەکارێك لەکارەکانەوە. ئەو کەسەشی پەی نابات بەم هەستکردنە سودی گەورەی لێ بەدی ناکرێت))[٢].

نوسەری کتێبەکە بۆمان دەگێرێتەوە: سەبارەت بەو سەربازە فەرەنسیەی کە لەژوورەکەیدا هەر دێتو دەچێتو لەبەر خۆیەوە دەڵێت:- ((هەر دەبێ ببمە سەرۆکێك)) بۆیە ئەم سەربازە لەو پێناوەدا هەوڵو تێکۆشانی خۆی دەخاتە گەڕ تا لەدواجاردا گەیشت بەو مەبەستەی کە خۆی داواکاری بوو. هەروەها نوسەر دووبارە لەبارەی (بکستۆن)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: ئەو پیاوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەژیانیا بەسەرکەوتنێکی زۆر گەورە چونکە ئەو لەو بڕوایەدابوو کە گەنج دەتوانێت بگات بەو مەبەستەی کە خۆی دەیەوێت بە مەرجێك هەوڵی بۆ بدات. بۆیە (بکستۆن) رۆژێ لەرۆژان نوسراوێك دەنوسێت بۆ یەکێ لەکورەکانیو تیایدا دەڵێ: ((... من دڵنیام لەوەی کە هەمو گەنجێك دەتوانێت بگات بەو ئاواتەی کە خۆی ئارەزووی دەکات. من خۆم ئەم رێگایەم تاقیکردۆتەوەو هەموو سەرکەوتنو بەختەوەرییەکم لەو بەرنامەیەدا بەدەستهێناوەکە دامنابوو بۆ خۆم ئەو کاتەی وا لەتەمەنی تۆدابووم....))[٣].

بێگومان ئەم قسانە بۆ فێركردنی منداڵان سودو بایەخی خۆیان هەیە، بگرە هەندێجار پێویستن بۆ پەروەردەكردنی منداڵان، لەوەدا كە هانیبدەیت لەسەر كارێكو رابێت لەسەر بەهێزكردنی ئیرادەی خۆی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچەسپێت بەسەر ژیانی واقیعیدا بە چەسپاندنێكی تەواو. بۆیە بەزۆری ئەم ئامۆژگاریو قسانە بەسەر زاری ئەو سەركەوتووانەوەیە كە گۆرانی دەڵێن بە باڵای ئەو سەركەوتنانەدا كە لەژیاندا بەدەستیان هێناوە بەڵام لەبیریان چووە یان لەبیری خۆیانی دەبەنەوە كە بەدەستهێنانی ئەو سەركەوتنانەیان بە هۆی چەند هۆكارێكی شاراوەی یارمەتیدەرەوە بووە كە ئەوان ئاگایان لێنەبووە.

بێتو گەر ئێمە ئامارێك بكەین لەنێوان ژمارەی ئەوانەی وا ویستویانە سەركەوتن وەدەستبێنن بەڵام پێی نەگەشتوونو ئەوانەی وا سەركەوتنیان بەدەستهێناوە، ئەوا دەبینین ژمارەی ئەوانەیان كە نەگەیشتوونەتە سەركەوتن زۆر زیاترە لەژمارەی ئەوانەی واپێی گەیشتوون. كێشەكە لەوەدایە ئێمە گوێڕاناگرین لەوەی دۆڕاوەكان (شكستخواردووەكان) دەیڵێن، هەموو هۆشوگۆشمان دەدەینە پاڵ سەركەوتووەكانو سەرسامدەبین بە گوێگرتن لەقسەكانیانو سەركەوتنەكانیان. لەبەرئەوە كاتێك كەسی سەركەوتوو دەمانبینێت ئێمە پێی سەرسامینو گوێبیستی قسەكانی دەبین ئەوجا ئەویش خۆی لێ بایی دەبێتو شانازی هەموو سەركەوتنەكانی دەگەڕێنێتەوە بۆ كۆششو هەوڵو ماندووبوونو ئیرادەی بەهێزی خۆی.

بەڵام بۆ دۆڕاو و شكستخواردوو ئێمە هەمیشە حەزدەكەین سەركۆنەی بكەین و ڕقمان لێیەتیو زەمی ئیشو كارەكانی دەكەین. هەرچەندە ئەو سوێندمان بۆ دەخواتو بەوپەڕی باوەڕەوە ویستویەتی سەركەوێتو هەوڵو كۆششی زۆریشی بۆداوە بەڵام سەركەوتن نا پاكی لەگەڵداكردووەو یاوەری نەبووە، بۆیە لەئاكامدا رقمان لێیەتیو قسەكانی پشتگوێ دەخەینو گوێی پێ نادەین، بەمجۆرە گۆشەنیگایەكی گرنگمان لەكیس دەچێت كە شایانی ئەوەیە گرنگیپێبدەینو بە بایەخەوە سەیری بكەینو پەندی بەسوودی لێوە فێربین.

(سمیلز) نوسەری كتێبی (نهێنی سەركەوتن) چیرۆكی ئەو سەربازە فەرەنسییەمان بۆ دەگێڕێتەوە كە ویستوویەتی ببێتە سەركردەیەكو پاشان بووە بەو سەركردەیە كە خۆی ویستوویەتی. ئێمە لێرەدا دەمانەوێت پرسیارێك لەو نوسەرە بكەینو بڵێین: ئایا چەند

 

سەربازی بینی کە ویستوویانە ببنە سەرکردەو لەو پێناوەشدا خەباتیانکردووەو کەچی سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناوە؟ بەڵام تەنها یەك سەرباز سەرکەوتنی بەدەستهێناوە ئەوا مستەر (سمیلز) دەیکا بەگاڵەو هاتوهاوارو دەڵێت: بڕوانن بۆ هێزی ئیرادە چۆن سەربازێکی سادەی ئاسایی بەرزکردەوە بۆ پلەی سەرکردایەتیکردن! بەڵام (سمیلز) ئەو مەلایین سەربازە هەژارانەی لەبیرکردووە کە لەشەڕگەکانداو لەبەرەکانی کوشتاردا تیاچوون‌و خۆیان هاویشتۆتە باوەشی مەرگەوە لەپێناوی بەرزبوونەوەی تەنها یەك پلەی سەربازیدا، بەڵام بە ئاوات نەگەیشتون‌و بەو داخەوە سەریانناوەتەوەو بوونەتە کۆچی قوربانی لەپێناویدا.

هەروەها نوسەر مەدحی ئەو دارتاشەمان بۆ دەکات کە بەجوانترین شێوازو وردەکارییەوە ئەو کورسییەی دروستکردووە چونکە ویستوویەتی ببێتە قازی‌و لەسەری دانیشێت. لەروانگەی منەوە ئەو دارتاشە لەهەندێ رووەوە هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ ئەو هەژارە دەستکورتەی کە بەلای پیاوێکی قەرتاڵە (سەبەتە) دروستکەردا تێپەڕ دەبێت کە لەپەلکی دارخورما قەرتاڵە دروستدەکات‌و ئەمیش دەچێتە نزیکەوەو لێی دەپاڕێتەوەو پێی دەڵێ: وەستا گیان تا دەتوانی با قەبارەی قەرتاڵەکە گەورەبێت کە دروستی دەکەیت، کابرای وەستاش هۆکاری ئەمەی لێ دەپرسێ‌و لەوەڵامدا هەژارەکە دەڵێ: ((لەوانەیە ئەو قەرتاڵەیە یەکێك لەهاوڕێکانم لێتبکرێت‌و پڕی کات لەخورماو پاشان حەزکات بە دیاری بیدات بە من....)).

بەڕاستی گریمانەی سەرکەوتنی بەدیهاتنی ئەو هیوایەی کابرای هەژار بۆ قەرتاڵە خورماکە کەمتر نیە لەگریمانەی سەرکەوتنی کابرای دارتاش کە ئیرادەی وابووە ببێتە قازی. بەڵام مستەر (سمیلز) ئەوەی لەبیرچووە کە ژمارەی ئەو دارتاشانەی وا بوونەتە قازی بە ئیرادەی خۆیان زۆر کەمترە لەژمارەی ئەو دارتاشانەی کە خراونەتە بەندینخانەوە لەسەر بڕیاری قازی‌و دادپرسەکان.

لەواقیعدا ئەو کەسەی کە دەیەوێت بگاتە پلەو پایەیەکی بەرزو بەڵام خۆی مەوهیبەو سیفاتی ئەو شوێن‌و پلەو پایەیەی تیا بەدینەکرێت‌و کوڕی ئەو مەیدانە نەبێت بەڕاستی زیان بەخۆی دەگەیەنێت زیاتر وەك لەوەی سوودی پێ بگات. چونکە ئیرادە بە تەنها خۆی هەرگیز بەس نیە بۆ بەدەستهێنانی شتێك، لەوانەشە ئیرادە کۆسپێکبێت لەو پێناوەدا.

مرۆڤ وەك ئامێرێكی گوێڕایەڵ نیە تابتەوێت لەهەر ڕوویەكەوە ئاڕاستەی كەیت بەگوێت بكات.

بۆ هەر جۆرێك لەجۆرەكانی سەركەوتن تایبەتمەندی خۆی هەیە. هێزە دەروونیە كاریگەرەكان ڕۆڵێكی گەورە دەبینن لەدروستكردنی ئەم تایبەتمەندیانەدا، ئەوەی دەیەوێت شتێك بكاتو دەروونی ئامادە باش نەبێت بۆی ئەوا زیان بەخۆیو نەتەوەكەشی دەگەیەنێت زیانێكی گەورە.

(سمیلز) دێتو وەك نموونە چیرۆكی ناپلیۆنمان بۆ دەگێڕێتەوەو هەوڵدەدات گرنگی ئیرادە بخاتە ڕوو لەحاڵەتی سەركەوتندا بۆیە لەم بارەیەوە وشەگەلێكی زۆر دەداتە پاڵ ناپلیۆن كە دەیكاتە بەڵگەی ڕاستیو دروستی قسەكانی. ناپلیۆن داوایكردبوو وشەی (مەحاڵ) لەفەرهەنگی زماندا بسڕێتەوەو نەمێنێت. بەلام لەكاتێكدا ڕۆژێك پێیان وت ریزە چیای ئەلپی سەخت و سەركەش ڕێگری دەكەن لەپێشكەوتنەكانت. وەلامیدانەوە: ((پێویستە لەسەر زەوی نەمێنێتو لەگەڵ خاكدا یەكسان بكرێت )). نوسەر لەزمانی ناپلیۆنەوە ئەم سەرنویشكەی خوارەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە:- ((ناپلیۆن وتی من لەڕووداوی (ئەركۆلا) سەركەوتنم بەدەستهێناوە بە خۆمو بیستو پێنج جەنگاوەرەوە ئەمەشم لەو ڕێگایەوە بەدیهێنا كە هەلم قۆستەوە لەهیلاكی سوپای دوژمنو دام بەسەریانداو هەریەكەش لەو جەنگاوەرانەی خۆم (كەڕەنا) زوڕنایەكم دابوونێ تا بەكاری بێنن لەكاتی هێرشكردنداو ئەوەبوو تێیدا سەركەوتین)) (٤).

دەبینین ئەو ناپلیۆنەی كە دەیویست چیاكانی ئەلپ بسڕێتەوە لەگەڵ خاكدا یەكسانیانكات، كەچی نەیتوانی ئەو ڕنە بارانە یان ئەو دڵۆپە وردانەی كە دەبارین لەگۆڕەپانی (واترلۆ)و بوونە هۆی دواخستنی گوێزانەوەی تۆپەكانی تەنها بۆ ماوەی نیو سەعات لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا، ئەوەبوو ئەو تێكشكانە گەورەیەی بەسەرداهات وەك هەمووومان دەیزانینو ناسراوە بەشەڕی واترلۆ.

ناپلیۆن كاتێ بە چیاكانی ئەلپدا هەڵدەگەڕا لەسەرەتای لاوێتیو گوڕی چالاكیو گەشبینی ئەو كاتەیەوە بووە بڕیاریداوە كە وشەی (مەحاڵ) نەهێڵرێتو بسڕێتەوە لەكتێبەكانی زماندا، بەلام لەوانەیە كاتێك تێكشكاوە لەشەڕی (واترلۆ)دا بڕیاریداوە ئەو وشەیە بگەڕێتەوە بۆ شوێنی یەكەمجاری. بێتو گەر لێمان بپرسیایە لەو ساتەوەختەی

كلۆڵیەدا كە هاتووە بەسەریداو تێكشكاوە لەو شەڕەدا، لەوانەیە ئەمە وەڵامی بوایە: ((كوڕی خۆم هەموو شتێك، هەرچەندە ئاسانبێت، دەشێ مەحاڵبێت ئەگەر بارودۆخ بۆی لەبارنەبێت)) ئەمەش ئەوەیە كە خۆی بەچاوی خۆی بینیو روویدا لێی.

(سمیلز)و ئەوانەی ئەو پێچو دەورەیە دەكەن لەئەنجامی پێچو دەورەپێكردنی بۆ شیكردنەوەی تێكشكانی ناپلیۆن لەشەڕی (واترلۆ)دا، دەیكەن بە هۆكاری ئەوەی گوایە لەئەنجامی لاوازییەكی كتوپڕدا بووە لەسەر ئیرادەی خۆی لەو ساتەوەختەدا، بێتوگەر ناپلیۆن ئیرادەی بەهێزبووایە لەوكاتەدا ئەوا سەردەكەوت بەسەریانداو شكستی نەدەخوارد هەروەك چۆن لەكاتی پەڕینەوەی بەسەر چیاكانی ئەلپدا ئیرادەی بەهێز بوو. ئەوا نەلەشیكردنەوەكانیاندا بۆ ئەم حاڵەتە وەك ئەو پیرەژنە بەساڵاچووانەیان لێ هاتووە كە باوەڕیان بەسیحر هەیەو بەڵام ئەگەر یەكێكیان شكستیخوارد لەنیشێك لەنیشە سیحریەكانیاندا ئەوا دەستبەجێ ئەو شكستەی دەداتە پاڵ كەمیو لاوازی بڕوابوونی بەسیحرو سستی لەئەنجامدانیدا.

سمیلز دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: ((ناپلیۆن زیاد لەپێویست زیرەكو بیرتیژبوو، بۆیە سەیری هەر پیاوێكی بكردایە ئەوا دەستبەجێ خورەوشتو هەڵسوكەوتی دەزانیو مەزەندەی دەهاتە دەستی، لەبەرئەوە زۆر بەكەمی دەكەوتە هەڵەوە لەدەستنیشانكردنی پیاوەكانیدا)) .(٥)

لێرەدا دەمانەوێت پرسیارێك بكەین لەنوسەر دەربارەی ئەو بیرتیژییە زۆر بەهێزەی ناپلیۆن كە ناوبانگی پێ دەركردووەو بووەتە هۆكاری سەركەوتنەكانی: ئایا ئەو بیرتیژیو زیرەكییەی بەرەنجامی ئیرادەو كۆششەكانی ناپلیۆنە یان هەر بەخۆرسكو شێوازێكی سروشتی تێیدا بووەو بەسەرپێوەو لەبەدیهیەتی خۆیەوە بڕیاریداوە بەسەر شتەكاندا بێ ئەوەی دۆشدابمێنێت بەدیاریانەوە؟

لەراستیدا ناپلیۆنو ئەوانەشی وەك ئەو خاوەنی بیرتیژیو زیرەكی راستگۆیانە بوون، لەوانەیە ئەو زیرەكیو بیرتیژییەیان لەدەستبدایە بێتو گەر بهاتایە ئیرادەو ئارەزووكاریان بەكاربهێنایە. خاوەن بەهرە دەرونیەكان پێویستە لەسەر پەیامەكەی خۆی بڕوات لەژیانداو پێداگیریو مەبەستی سودوەرگرتنی نەبێت لەو بەهرانە. چونكە هەر كاتێك ئەو

هێزە دەرونیە کوتوپڕیانە هەڵقوڵێن بۆ ئاڕاستەکردنی کارێكو سەرکەوتن تێیدا ئەوا پێویستیان بە خۆ هیلاککردنو ڕێکخستنی بڕیار لێدانیان نییە.



توێژینەوە دەرونییە نوێیەکان، بەتایبەتی توێژینەوەکانی قوتابخانەی (نانسی) لەفەرەنسا، لەم دواییانەدا ئەو دۆزینەوەیەمان بۆ دەردەخات لەبارەی حەقیقەتێکی دەرونی گەورەوە کە بیریاران لێی بێ ئاگابوون لەرابردوودا. ئەو حەقیقەتەش ئاماژە بەوە دەکات کە ئیرادە هەندێجار کۆسپو تەگەرە دێنێتە ڕێگای سەرکەوتن، بۆ ئەو کەسەشی کە ئیرادەی خۆی بەکاردێنێت لەهەموو کاروبارەکانیداو بەشێوەیەك زیانی پێ دەگەیەنێت کە خۆشی پێی نەزانێت.

ئەم حەقیقەتەش ناودەبرێت بە یاسای (کویە) یان یاسای (کۆششی پێچەوانە) ، ئەوەی جێگای داخە دەبینین لاوان لەم وڵاتەی ئێمەدا گرنگی ئەم یاسا دەروونیەیان پشتگوێخستووەو بێئاگان لێی بە هەموو جۆرە پشتگوێخستنێكو بێئاگاییەك، چونکە بەڕاستی زۆر هەوڵو کۆششیان بەفیڕۆ دەڕوات بەبێ ئەوەی سودی لێ وەرگرن.

یاسای (کویە) بەعیبارەت ئاسانە بەڵام ترسێنەرە لەگرنگی پراکتیکیدا (عەمەلیدا). دەکرێ ئەم یاسایە کورتکەینەوەو پوختەکەی بەکورتی لێرەدا دەربڕین:

((ئەگەر بیرۆکەیەك زاڵبوو بەسەرکەسێکداو بەشێوەیەك چووبووە نێو قوڵایی عەقڵی ناوەوەی ئەو کەسە، ئەوا هەموو هۆشیاریو هەوڵو تێکۆشانەکانی ئەو کەسە بۆ سەرپێچیکردنی ئەو بیرۆکەیە دەبێتە هۆی بەدیهێنانی ئەنجامێکی پێچەوانەی ئەو ئەنجامەی کە خۆی ویستویەتی)) (٦).

بۆ ڕونکردنەوەی ئەم یاسایە نموونەی پاسکیل سوارێك دێنینەوە. ئەم نموونەیە هەموو ئەو کەسانەی لەسەرەتادا سواری پاسکیلبوون دەیزانن، ئەو کەسە پاسکیل سوارە ناتوانێت بەردێك یان پارچە شوشەیەکی شکاو ببینێت کە دێتە بەردەمی لەڕێگاداو کاتێ دەزانێت وا بەرەورووی دەڕوات بەخۆیو پاسکیلەکیەوەو ئەو کەسە هەرچەند دەیەوێت خۆی لێ لاداو لێی دوورکەوێتەوە کەچی بە پێچەوانەوە زیاتر بەرەو ڕووی دەڕواتو هێڵێکی ڕاست

وەردەگرێت لەبەرەو پیرەوەچوونی ئەو بەردە یان ئەو پارچە شوشەیەدا، بۆیە بەبێ ویستی خۆی کاتێك دەزانێت تایەی پاسکیلەکە چووە بەسەر پارچە شوشەکەدا.

لەبەرئەوە ئەو کەسە زۆر سەری سوڕدەمێنێت لەوەی کە چۆن دەستەکانی توانیویەتی سوکانی پاسکیلەکە بەرەو ئاراستەی ئەو پارچە شوشە شکاوە بەرێت، ئەمەو بۆ زانین لەکاتەکانی تردا بە هیچ شێوەیەك دەستەکانی ناتوانن سوکانی پاسکیلەکە بەقەدەر تۆزقاڵێك بەرەو لایەکی تر بسوڕێنن ئەگەر خۆی ئارەزووی لێ نەبێت.

ئەم رووداوەی خۆم دەگێڕمەوە: کاتێ لاو بوومو هەوڵمدەدا پاسکیل سواری فێربمو بیئاژووم، ئەوەبوو زۆر باش فێر بوومو لێم دەخوڕیو ماوەیەکیش تێپەڕی بەسەر ئەو فێربوونو لێخوڕینەمدا، بەلام لەبەدبەختی من جارێکیان پاسکیلم لێ دەخوڕیو کابرایەکی هەژار هاتە سەر رێگام بە خۆیو سندوقێك(سەبەتە)یەکی پڕ لەکاهووی بەرزکراوە بۆ ئاسمان. وا چاوم تێبڕیبوو بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم بەرەو رووی دەرۆیشتم بە خۆمو پاسکیلەوە زۆر بە وردییەکی سەرسوڕهێنەرەوە، کاتێکم زانی تەنها ئەو چرکە ساتەم ئاگالێبوو خۆمو پاسکیلو کابرای هەژارو کاهوو بوین بەیەكو هەرهەموومان تێکەڵبوین لەگەڵ یەکداو بوینە کۆمەڵێکی هەڵرژاوی تێکەڵوپێکەڵ (بەجۆرێك وەك دەڵێن دۆو دۆشاو تێکەڵبوو بوو. و- کوردی) شیرازەی هەمووو شتەکان پچڕابوو. (کویە) ئەم دیاردە دەروونییە سەرسوڕهێنەرە راڤەدەکات بە (ناتەبایی ئیرادەو ئەندێشە) یان بەدەربڕینێکی تر: ناتەبایی هەستو نەست. کاتێك پاسکیل سوارەکە شتێك دەبینێت لەپێشەوەی خۆی ئەوا دوو ناتەبایی پێچەوانە لەزیهنیدا هەڵدەقوڵێن:- یەکەم ناتەباییەکی نەستییە دەستی پاسکیل سوارەکەی تیا نیە لەوەدا کە پاڵی پێوەدەنێت بەرەو ئەو شتەو زاڵدەبێت بەسەر ئەندێشەو خەیاڵی پاسکیل سوارەکەداو دەیکاتە کۆیلەی خۆی بەجۆرێك بیەوێت یان نەیەوێت (پێی خۆشبێت یان پێی ناخۆشبێت). بەڵام ناتەبایی دووەم بریتییە لەئیرادەی پاسکیل سوارەکە لەوەی وا هانی دەدات بۆ دوورکەوتنەوە لەو شتە، هەرچەندێك ئیرادەی ئەو پاسکیل سوارە بەهێزتربێت بۆ دوور کەوتنەوە لەو شتە هێشتا ئەگەری ئەوەی زیاتر لێدەکرێت کە بەرکەوتە بێت بەو شتە.

ئەمەش بەو مانایە دێت ئەگەر ئیرادە پێچەوانەی خەیاڵبێت ئەوا بەرکەوتەیەکی زیان بەخشە. بۆیە شایانی ئەوەیە تاك لەوەها حاڵەتێکی وەك ئەمەدا گوێ نەداتێو بایەخی پێ

نەدات چونکە ئەوەی باشترە وەك لەوەی پێداگیربێتو ئیرادەی بەهێزبێت لەسەری. هەموو یەکێك ئەوە دەزانێت کاتێك دەیەوێت چاوپێکەوتنێك ئەنجامبدات لەگەڵ کەسێکی وەك گەورە پیاواندا، لەوەدا کە ئەو کەسە هەرچەندە ئەیەوێت کارامەو سەلیقەکار بێت لەو چاوپێکەوتنەداو پێشتر ئامادەکاری بۆ دەکات، کەچی لەکاتی چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ گەورە پیاودا ئەم دەشڵەژێو خۆی دەردەخات بەشێوە دەرخستنێکی خۆهەڵکێشو ئابڕووبەر (یان کورد واتەنی وەك کەسێکی کەرتڕ خۆی پیشاندەدات. و: کوردی).

(کویە )وای دەبینێت: لەحاڵەتی پێچەوانەبوونی ئیرادەو خەیاڵدا هێزی خەیاڵ زیاددەکات لەبەرهەمهێنانی کارە ناپەسەندەکان بە زیادبونێکی هەڵکشاو، بەشێوەیەك لەوکاتەدا بگونجێت بە گونجاندێکی راستەوانە لەگەڵ دووجای هێزی ئیرادەدا [٧].

بەشێوازێکی تر:- هێزی پاڵنەر بەرەوڕووی خاوەن کاهوو گونجاوبووە بە گونجانێکی راستەوانە لەگەڵ دووجای ئەو توندییەی کە من ویستوومە خۆم بپارێزم لێی. کەواتە لەئەنجامی گەرمبوونو تاوسەندنی من لەو ساتەوەختە ناخۆشەی کاتەکانی ژیانمدا دەشێ کەمتەرخەمبوبم لەروانینمدا بۆ کابرای خاوەن کاهوو لەگەڵ سەبەتە کاهووی هەڵگیراو لەسەر سەری. کەمتەرخەمیم لەو کاتەدا بە دەوری خۆی توندی ئەگەری بەرکەوتنمی بەو کابرا هەژارە کەمکردۆتەوە. لەراستیدا من حەزمدەکرد دوور کەومەوە لەخۆپیاکێشانی بەڵام بەپێچەوانەوە پاڵپێوەنانم بەور ڕووی بەهێزتر دەبوو بەرێژەی دووجا...

لەم بارەیەوە نموونەیەکی تر دێنینەوە، کە ئەوەش نموونەیەکی ناسراوەو لەوانەیە هەر یەکە لەئێمە کردبێتی لەژیانی رۆژانەیدا. ئەگەر یەکێکمان ویستبێتی بڕوات بەسەر لێواری دیوارێکی بەرزدا یان بڕوات بەسەر پارچە چینکۆیەکی دانراو لەنێوان دوو خانووی بەرزدا کە لەشێوەی پردێکی بچوکدایە، ئەوا دەبینین چۆن هەردوو قاچی دەلەرزێو وەك جۆلانە بەملاولادا لاسەنگ دەبێتو دڵی پڕدەبێت لەترسو هەناسە بڕکێی پێ دەکەوێ. بەجۆرێك لەوانەیە نەتوانێت پێ بخاتە سەر پارچە چینکۆکە وادێت بە خەیاڵیدا کە زۆر نزیکە لەوەی بکەوێتە خوارەوە. ئەم خەیاڵەشە دەبێتە هۆکاری کەوتنەخوارەوەی و بەهێزتریشە لەکاریگەری دەرونیدا لەهەر ئیرادەیەکی پێچەوانەی خۆی.

بەڵام ئەوانەی رادێن لەسەر ئەم حاڵەتەو بەسەریا دەپەڕنەوە جار لەدوای جار ئەوا ئەگەری کەوتنەخوارەوەیان زۆر کەم دەبێتەوە ئەمەش لەبەرئەوەی کە ئیرادەو خەیاڵ

یەکیانگرتووە لەناوئەوانەدا، چونکە کاتێك ئەوانە دەیانەوێت بڕۆن بەسەر پارچە چینکۆکەدا ئەوا خەیاڵیان پاڵپشتییان لێدەکاتو هاندەریان دەبێت لەوکارەدا بۆیە مەترسی کەوتنەخوارەوە نایەت بەخەیاڵیاندا تەنها بە دەگمەن نەبێت.

هەندێ لەنوسەران زیادەڕەوی دەکەن لەپیشاندانی گرنگی ئەم یاسایە لەژیانی پراکتیکیدا. بۆ نموونە ئەوانە سەرکەوتنی ناپلیۆن لەجەنگە بێ شومارەکانیدا دەگەڕێننەوە بۆ هاوسەنگی ئیرادەو خەیاڵ لای ناپلیۆن. لەم ڕووەوە (سەلامە موسی) دەڵێت: ((ناپلیۆن هەرگیز بیری لەتێکشکانو نسکۆ نەکردۆتەوە، ئەگەر بیری لێبکردایەتەوە وەکو ئەو کەسەی لێدەهات کە دەیەوێ بڕوات بەسەر پەتەکەدا بەلام مەترسی کەوتنەخوارەوەی هەیە. ئەو بۆ تەنها جارێك گومان چووە دڵیەوە ئەویش لەشەڕی (واترلۆ)دا بوو ئەوەبوو بوویە هۆی دۆڕاندنو تێکشکانی لەو شەڕەدا)) [٨]، بەهەرحاڵ زیادەڕەوییە سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن لەشەڕەکانیدا بگێڕینەوە تەنها بۆ هاوسەنگی نێوان ئیرادەو خەیاڵ (نەست)ی ناپلیۆن. سەرکەوتنی ناپلیۆنو –ئەوانی تریش جگە لەناپلیۆن- هۆکار گەلێکیان هەیە ئەستەمە هەموویان بزانین.

بەلام هاوسەنگی لەنێوان ئیرادەو نەستدا کاریگەری خۆی هەیەو گاڵتەی پێ ناکرێت لەسەرکەوتندا بێگومان. ئێمە پێویستمان بەم هاوسەنگییە هەیە لەزۆربەی ئیشوکاری ڕۆژانەماندا. ئەوانەی ئەم حاڵەتی هاوسەنگییە پشتگوێدەخەن لەژیانیاندا ئەوا لەحاڵەتی کۆتاییدان بۆ شکستو دۆڕاندن زۆرجار.

هەر شوێنێك مرۆڤ ڕووی تێبکات لەڕووە جیاوازەکانی ژیانەوە کارتێکردنی یاسای (کویە) دەبینێت زۆر بەڕوونی. بۆ نموونە ئەو دەیەوێت ناوێکی دیاریکراو بێتەوە بیری، بەلام بێ ئومێد دەبێت لەهێنانەوەی یادی ئەو ناوەو وازی لێدێنێتو دەگەڕێتەوە سەر باری ئاسایی خۆی، کەچی لەپڕ ناوەکە دێتەوە خەیاڵی، ئەو لەکاتێکدا دەیویست بێتەوە یادی نەهات، کاتێکیش پشتگوێی خست هاتەوە یادی.

مرۆڤ هەندێجار هەوڵئەدات سەرخەوێك بشکێنێتو ئیسراحەتێك بکات، بۆیە هەر تەپاوتلیەتیو گێنگڵ دەخوات لەسەر جێگەکەی وەك ئەوەی داوای شتێکی مەحاڵبکات، ئەمەو کەچی بۆ زانین لەچایخانەیەك یان لەناو ئۆتۆمبیلدا پرخەی لێ هەڵدەستێو پار

خەوتووە نەك ئەمساڵ، یان لەهەر کاتێکی تردا کە بیەوێت نەخەوێت ئەوا بێ ویستی خۆی خەوی لێ دەکەوێت.

زۆرجار بینیومانە یەکێك لەئێمە هەوڵیداوە پێنەکەنێت، کەچی پێکەنینێکی وای بۆ هاتووە بەهیچ شتێك زەوتناکرێت بۆی وەك بڵێی دوژمنایەتی لەگەڵیاهەیە (یان وەك ئەوەی دەڵێن: ئەوە چیتە ئەڵێی حەبی پێکەنینت خواردووە؟! و: کوردی)، هەرچەندە ئەو کەسە هێز لەخۆی دەبڕێت ئەوەندە هەوڵئەدات ئەو پێکەنینە کەمکاتەوەو نەیهێڵێت بەلاّم بەپێچەوانەوە تا دێ زیاتر پێدەکەنێت‌و خۆی بۆ زەوتناکرێت‌و وای لێدەکات دەیخاتە هەڵوێستێکی ناخۆش‌و ئابڕووبەرەوە لای کەسانی دەوروبەری.

هەندێ کەس هەن لەعیراقدا بەدەس دەردێکەوە گیرۆدەبوون کە ناودەبرێت بە (نەگبەتی شەوی پەردە). ئەو پیاوەی لەو شەوەدا دەچێتە لای هاوسەرەکەی‌و بۆ یەکەمجارە دەبێتە قوربانییەك لەقوربانییەکانی ناتەبایی ئیرادەو خەیاڵ. خەڵکی پێشتر وا مێشك‌و خەیاڵ‌و ئەندێشەیان پڕکردووە لەشتە پڕوپوچ‌و وەهمییەکانی شەوی پەردە (شەوی زاوا) کابرایان چوارچاو کردووەو مەگەر خوا بەگەورەیی خۆی رەحمی پێ بکات.

(یان وەك دەڵێن کارەکەیان ئەوەندە قورس‌و ئاڵۆزکردووە خوا بە گەورەیی خۆی کاری لەوجۆرەی نەداوە بەسەر سوڵتان‌و فەرمانڕەوایاندا. و: کوردی)، بۆیە ئەو پیاوە (زاوا) کاتێ دەچێتە ژوورەوە بۆ لای بوکێ وا دەزانێ لەخەیاڵی خۆیدا بەرامبەر مەترسییەکی زۆر گەورە زۆرانبازی دەکات‌و ناتوانێت ئاوقای بێت، ئەمەش لەئەنجامی ئەو ترس‌و تۆقەی کە پێشتر خستوویانەتە دڵیەوەو پێیان وتووە ئەبێ پاڵەوان‌و جەربەزەو خاوەن پیاوەتییەکی وا دەگمەن‌و گەورە بیت ئەوجا دەتوانیت ئەو کارە مەیسەربکەیت، دووبارە خەڵك هێندەی تر باری سەرباریان قورسکردووە لەسەر ئەو زاوا بەستەزمانە بەوەی کە بەکۆمەڵ لەدەرەوە دانیشتوون‌و چاوەڕێی ئەوە دەکەن ها ئێستا ها تاوێکی تر ئەو پاڵەوانە قارەمانە دێتەدەرەوە لەژووری چالاکی‌و بەسەرکەوتوویی خۆی رادەوەشێنێت بەرامبەریان وەك بڵێی لەجەنگێکی زۆر گەورە هاتبێتەوە. بۆیە لەبەر ئائەم هەموو کۆت‌و بەندو مەرج‌و داخوازیانە زاوای هەژار دەبینیت لەو حاڵەتەدا دەکەوێتە نێوان دوو ناتەبایی پێچەوانەوە: لەلایەکەوە ئیرادەی هۆشیارە بەوەی کە دەبێت سەرکەوێت‌و بگات بەخێرو خۆشی زاوایەتی یان پشکی غەنیمەت پیاوەتی خۆی وەرگرێت، لەلایەکی تریشەوە خەیاڵی

 

نەستیی وای لێدەکات لەم کارەدا دەدۆڕێت و بەڕونی لەبەرچاوی دیارە کە دەبێتە جێگای سەرزەنشتی قەوم و قیلەی.

ئەم ململانێ و ناتەباییە هەمیشە کۆتایی دێت بە هەڵوەشانەوەی شیرازەی خێزان لەزۆر جاردا کە لەوانەیە لەئەنجامی ئەم حاڵەتە نەگریسەدا زۆر لەخێزانەکان لەبنەڕەتەوە هەڵتەکێن و دووبەرەکی گەورە بکەوێتە نێوانیانەوە ئەمەش هەر لەبەرئەوەیە کە خەڵك راهاتوون لەسەر پێڕەوکردنی ئەو دابونەریتە پڕوپوچەو لەسەری دەڕۆن پێچەوانەی ویستی یاسای (کۆششی پێچەوانە) بەبێ گوێدانە دەرەنجامە نەگەتیڤەکانی.

بۆیە بەزۆری خەڵك لەم جۆرە حاڵەتانەدا پەنا دەبەنەبەر چارەسەری پزیشکی جۆراوجۆر. زۆربەی ئەو چارەسەرانەش ئامانجی خۆیان ناپێکن و سودیان نابێت چونکە ناچنە ناو ناخی بابەتەکەوەو بەرکەوتەنابن پێی و هیچ پەیوەندییەکیان نیە بەو بابەتەوە، لەبەرئەوەی ئەم حاڵەتە دیاردەیەکی دەرونیەو هیچ چارەسەرێك کەڵکی نیە تەنها چارەسەری دەرونی نەبێت زۆر جاران.

دەگێڕنەوە جارێکیان کەسێکی گیرۆدە بەم حاڵەتە دەروونیە نالەبارە (لەناو کوردەواری خۆماندا بەو کەسە دەڵێن بەستراوە. واتە لەشەوی پەردەدا نەیتوانیوە ببێتە زاوا و: کوردی) دەچێت بۆ لای هاوڕێیەکی و سکاڵای دەردی خۆی لا هەڵدەڕێژێت کە چۆن توشبووە بەم پەتایەو رزگاری نابێت لێی. بۆیە هاوڕێ کەشی هەڵدەسێت دوعایەکی بۆ دەنوسێت و بە داخزاوی دەیداتێ و پێی دەڵێ: ((ئەم دوعایە زۆر کەس بردویانە لەوانەی وا بەو حاڵەتەی تۆوە دەناڵێنن و سودیان لێوەرگرتووەو سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە بەسەرکەوتنی یەکجارەکی)). کابرای توشبووی هاوڕێمان دوعاکە وەر دەگرێت و باوەڕێکی زۆری پێدەکات و لەخۆشیا هەردوو پێی زەوی ناگرێت. کەچی بەهۆی ئەو دوعایەوە سەرکەوتنی بەدەستهێناو رزگاری بوو لەو پەتایە بەشێوەیەك جێگای سەرسوڕمانە کە چۆن ئەو دوعایە کاریگەری وای دەبێت؟! بەلاّم لەدواجارداو بۆ کۆتایی دوعاکە دەکرێتەوەو دەخوێنرێتەوە تەماشا ئەکەن ئەوەی تێیدا نوسراوە قسەی قۆڕو جنێوی ناشرینە نەك چارەسەرکردن و هیچ شتێکی لەو بابەتە. (لەکوردەواری خۆشماندا ئەو بەزمە رویدابوو، پاش ئەوەی ژنێك منالی نابێت و دار لەدەوا دەبڕێت بۆی دەکەن و هەموو پزیشك و داودەرمانەکان تاقی دەکاتەوە چاری نابێت تا دوایی دەچێتە لای کۆلکە مەلایەکی

 

جادوگەرو نوشتەنوس‌و ئەویش دوعایەكی بۆ دەكات‌و دەیپێچێتەوەو دەیداتە دەستی. لەپاش تێپەڕینی ماوەیەك دوعاكە هەڵدەپچڕن‌و دەیكەنەوە تەماشا ئەكەن نوسراوە: ((دەزێی بزێ، نازێی بەگونی باوالێمەوە)) و: كوردی)). بەڵام دەشێ ئەو جوێن‌و قسە قۆڕانەی كابرای پێشوو كە سەركەوتنی بەدەستهێنا لەدوعاكەدا هەرچۆنێك بێت سودی خۆی هەبووبێت چونكە ئەو لەكاتێكدا كە باوەڕی پێهێنا ئیتر خەیاڵی گۆڕاو پڕبوو لەهیوای سەركەوتن‌و وەهمی بردنەوە. بەم ڕێگایە تەحەدای ئیرادەو خەیاڵی خۆیكرد لەو ئیشەداو گەیشت بە ئاواتی خۆی لەو ئەنجامەی كە داواكاری بوو.

لەراستیدا لەهەر كارێكدا گەر هات‌و خەیاڵ‌و ئیرادە پێچەوانەبوونەوە لەزیهنماندا ئەوا تێك دەشكێین. لەوانەیە زیادەڕەویمان نەكردبێت ئەگەر وتمان كەسێتی سەركەوتوو ئەوەیە كە خەیاڵی ئەو سەركەوتنە دەكات بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت. یەكەمین كارێك ئەنجامی بدەین لەم بوارەدا ئەوەیە دەبێ منداڵەكانمان رابێنین لەسەرئەوەی كە خەیاڵی سەركەوتن لەزیهن‌و مێشكیاندا بچەسپێت وەك لەوەی هانیانبدەین لەسەر ئیرادەی سەركەوتن، پێویستە پێیان بڵێین:-((ئێوە لەسەر كەوتووەكانن)) نەك پێیان بڵێین:-((ببن بەسەركەوتووەكان)).

زۆر بەداخەوە دەبینین باوكانی ئێمە لەم وڵاتەدا بەپێچەوانەوە منداڵەكانیان پەروەردەدەكەن لەم بارەیەوە – ئەوان منداڵەكانیان وا فێركردووە كاتێك داوای سەركەوتن بكەن كە دەگەنە بێ هیوایی‌و ئینجا دێت بەخەیاڵیاندا.

دەشێت ئەو گوتەیە راستبێت كە دەڵێت بەدبەختی (بەخت ڕەشی) گرێیەكی دەروونیە. هەر بۆیە بەخت ڕەش و نەگبەت ئەو كەسەیە كە خەیاڵی بێ هیوایی‌و شكست لەهەموو كارو كردەوەیەكیدا زاڵەو هەمیشە داڕووخاوە لەبوارەكانی ژیاندا. چونكە ئەو دەیەوێت سەركەوتن بەدەستبێنێت‌و زۆر شێلگیرانەش لەو پێناوەدا هەوڵی بۆ دەدات بەڵام لەقوڵایی عەقڵی ناوەوەیدا وێنای شكست‌و سەرنەكەوتن دەكات بۆ شتەكان‌و لەئاكامدا بەئەنجام ناگات، دووبارە وەك ئەو كەسەی لێ دێت كە دەڕوات بەسەر پەتەكەداو دەترسێ لەكەوتنە خوارەوە، جێگای سەرسوڕمانە كە دایكان لەم وڵاتەدا یارمەتیدەرن بە یارمەتیدانێكی زۆر چالاك‌و كارا لەسەر پەرەپێدانی ئەم جۆرە گرێیانە لەزیهنی منداڵەكانیدا. دایكان لای ئێمە فێرە گریان‌و راهاتوون لەسەر ئەوەی بەدوای بەختی

خۆیاندا ڕاگەن لەهەموو كاتێكدا (دادو بێدادیانە لەسەر بەخت ڕەشى خۆیان)، هەربۆیە بەو جۆرەش ئەو پەیامە دەگەیەنێتە منالەكانىو ئەو بەخت ڕەشییەیان لا دەكاتە بیروباوەڕێكى چەسپیو بەبێ ئەوەى ئەوانو خۆشى هەستى پێ بكەن. ئەو كاتێك مێردەكەى (پیاوەكەى) زولمى لێ دەكاتو دەیچەوسێنێتەوە، ئەمیش دێت لاى منالەكەى باسى دەكاتو بۆ كلۆلى خۆى دەگرىو هەست بە چارە ڕەشىو ئازارو مەینەتییەكانى دەكات. ئەوەى كە دایك هەلێدەڕێژێ لەناسۆرو نەهامەتىو زوخاوەكانى دەروونى بۆ منالەكەى دادەنرێت بە بەهێزترین جۆرەكانى (نیحا ) لەهێزو كاریگەریدا لەپێكهاتنى كەسێتى ئەو منالەدا، چونكە ئەو دایكە هەمیشە گلەیى لەرۆژگار دەكاتو لەو زولمەى كە لێى كراوەو تا ئێستاش پێوەى دەنالێنێ بۆیە لەقولایى عەقلیدا وێنەیەكى ڕەشى تۆماركردووەو هیچ شتێك لەماناى ژیان ناگەیەنێت، هەر لەبەرئەوەشە واى لێكردووە ڕەشبین بێو هیواى بە چاكە نەبێتو چاوەڕوانى ئەوەنیە لەژیاندا سەركەوتن بەدەستبێنێت.

وشەى (بەدبەخت) لەناو دایكانى ئێمەدا لەزۆرترین ئەو وشانەیە كە رۆژانە بەكاردەهێنرێت، ئێوارەو بەیانى دایك ئەم وشەیە وەكو قەوان لێئەداتەوە. بە زۆرى كاتێك لەمنالەكەى دەداو بەزللە تێى بەردەوبێتو پێى دەلێت: ((بڕوانە بۆ كوڕى فلانەكەس هەى بەدبەخت... بڕوانە ئەو چۆن ڕۆژ بەرۆژ سەردەكەوێو تۆش هەر بەناخى زەویدا دەچیت هەى تەمەلى تەوەزەل... خەتاى بەختى ڕەشو بێچارەیى خۆمە تۆشى بەدبەختو چارەرەشكردووەو لەمنالى خەلك ناچیت...)).

دروشمى بەخێوكەرانمان زۆربەیان دەسوڕێنەوە بە دەورو خولى ئەم دەربڕینەدا كە دەلێت: ((ببە..مەبە...)) هەروەها بەهەر منداڵێك لەمنداڵەكانیان دەلێن: ((تۆ لەمنالى خەلكى ناكەیت... هەولبدە تا وەكو ئەوانت لێدێت)). ئەم ڕێگایەش لەدوو لاوە زیان بەخشە:-

لەلایەكەوە لەخەیالى منداڵدا وێنەیەكى ڕەشبینى لەبارەى دەرونى خۆیەوە دەچێنێت، لەلایەكى ترەوە هانى دەدات لەسەر ئیرادەى سەركەوتن. دووبارە ئەمیش دەبێتە قوربانییەك لەقوربانییەكانى یاساى (كۆششى پێچەوانە)- بەوەى كە لەعەقلى هۆشیاریدا

دەیەوێت سەرکەوێت و لەگەڵ ئەوەشدا لەعەقڵی ناوەوەیدا دەیەوێت بدۆڕێت و شکستبێنێت.

هاوڕێیەکم دەردە دڵی خۆی بۆ گێڕامەوە سەبارەت بە خراپی خووڕەوشتی منداڵەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا بەخێویکردوون لەسەر پەروەردەیەکی چاک و سودبەخش (بەپێی بۆچوونی خۆی)، پاشان هاتە سەر باسی ئەو پەروەردەکردنەی کە منداڵەکانی پێ پەروەردەکردووەو وتی: ((بە زۆری بەسەریاندا دێم و ئامۆژگاریان دەکەم، ناهێڵم سەعاتێك بەفیڕۆ بڕوات بە خۆڕایی هەتا ئامۆژگاری و ڕێنماییەکی وایان فێرنەکەم کە سودی لێوەربگرن... بەڵام بەداخەوە کاتێ گەورەبوون لەسەر ئەو پەروەردەیەی من ناڕۆن بەڕێوە کە خۆم ئەمەوێت)).

گومانی تیا نییە بەهۆی ئەو ئامۆژگاریکردنە زۆرەی منداڵەکانییەوە کە ئێستا خراپییان لێدەرچووە، ئەو لەسەرەتادا بە خراپی فێریکردوون پاشان کە گەورەبوون فەرمانیان بەسەردا دەکات کە پابەندی چاکەبن، ئەمە وەك نموونەی ئەو (واعیز)ە ئامۆژگاریکارانەی لێهاتووە کە لەمەوعیزەکانیاندا چاکسازی خەڵکیان دەوێت و بانگەشەی بۆ دەکەن بەڵام خەڵکی خراپ دەردەچن.

دەگێڕنەوە رۆژێکیان باوکێك هەڕەشەو گوڕەشە لەمنداڵەکەی دەکات لەسەر ئەوەی کە دواکەوتووە لەخوێندن و پێی دەڵێت: ((ناپلیۆن کاتێك لەتەمەنی تۆدابوو دەرچوو بۆ پۆلی پێنج کەچی جەنابت ئێستا تازە لەپۆلی دوودایت لەقوتابخانە)). منداڵەکەش لەبەدیهیەتی خۆیەوە بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە: ((بەڵام ناپلیۆن، ئەی باوکی خۆم، کاتێك لەتەمەنی تۆدابوو، بوو بە ئیمپراتۆر)).

مەرایی نیە گەر بڵێین وەڵامی منداڵەکە نزیکترە لەحەقیقەتەوە هەتا پرسیارەکەی باوکی، ئەو خراپەیەی بەخێوکەرانمان لەگەڵماندا کردوویانە ئەوەیە کە لەپەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا نموونەی منداڵانی خزم و ناسیاوەکانی خۆیان دێننەوە بۆیان و هانیاندەدەن لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئەمانیش وەك ئەوانبن. هەموو تاکێك لەڕاستیدا دروستکراوە لەسەر شێوازێکی تایبەت بەخۆی، کەواتە ناتوانێت وەك ئەوانیتر وابێت بەتەواوی هەرچەندە هەوڵ و تەقەلاشی بۆ بدات لەو پێناوەدا.

کاتێك باوکێك دەبینێت یەکێك لەکوڕەکانی کابرایەکی تر سەرکەوتووە لەلایەنێك لەلایەنەکانی ژیانیدا، بۆیە خێرا بە هەڵەداوان ڕۆشتە سەر کوڕەکەی خۆیو بەتوندوتیژیو توڕەییەوە لۆمەو سەرزەنشتیکردو داوای ئەوەی لێدەکرد کە ئەبێ ئەمیش لەسەر هەمان ڕێچکە بڕوات کە ئەو کوڕە سەرکەوتووەی لەسەر ڕۆشتووە بەبێ چاوپۆشیکردن لەو جیاوازیو تواناو بەهرانەی کە لەنێوانیاندایە. هەروەها کوڕەکەش هەستی بەوەکرد ئەگەر ئەمیش وەك نموونەی ئەو کوڕە نەبێت ئەوا نرخی نییە لەبەرئەوە پێویستە لەسەری هەوڵو تێکۆشانێکی زۆربدات تا بگات بەوداو لەهاوشێوەی ئەوبێت. بۆیە کوڕە لەم پێناوەدا ناڕەحەتیو دەردی سەری زۆری چەشت بەدەست ناتەبایی ئیرادەو خەیاڵەوە لەناوەوەی دەروونی خۆیداو لەکۆتاییشدا توشی شکستو دۆڕاندن دەبێتو سەرکەوتن بەدەستناهێنێت لەو کارەدا.

بۆ نموونە باوکێك کاتێك دەبینێت پیشەی پزیشکی ماڵو سەروەتێکی زۆر دەبەخشێتە خاوەنەکەی بۆیە ئەمیش دەیەوێت کوڕەکەی بنێرێتە کۆلیژی پزیشکیو هەموو هەوڵو کۆششێکی لەگەڵدا دەدات لەو پێناوەدا. چونکە ئەو لەو بڕوایەدایە کوڕەکەی توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو دەتوانێت سەرکەوتن بەدەستبێنێت لەخوێندنی پزیشکیدا تەنها بەوەی کە ئیرادەی بەهێزبێتو عەزمی جەزمبێت لەسەری. ئەو هەمیشە ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات تا ببێتە پزیشکێکی شارەزاو لێهاتوو بۆیە پێی دەڵێت: ((... ئایا کوڕی فلانەکەسی سوکوڕسوا لەتۆ چاکتربوو...ئێستا بووەتە باشترینو ناودارترین دکتۆر لەشارەکەدا، هەموو ڕۆژێك کۆڵێك پارەی دەستدەکەوێت)) ئەو بەم کارەی کوڕە هەژارەکەی دەخاتە نێوان دوو بەرداشەوە. بۆ نموونە لەوانەیە ئەو کوڕە ئارەزووی لەشیعر یان دادوەری یان دارتاشی بێتو کەمترین حەزو ئارەزووی لەخوێندنی نەخۆشییەکانو توێکاری لاشەکان بێت.

بوون بە پزیشکی ئەو کوڕە لەحاڵەتێکدا ئەگەر خۆی ئارەزووی لێ نەبێت ئەوا بێگومان دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەخۆیو نەتەوەکەی پێکەوە. چونکە لەوانەیە لەئەنجامی ئەوەدا ببێتە پزیشکێکی نەشارەزاو نەزانو ژمارەیەك لەهەژارو بێ تاوان لەژێر دەستیدا گیان لەدەستدەن. دکتۆری نەزان جەلادی شارەزایە.

کۆمەڵگای مەدەنی و پێشکەوتوو لەبنیاتنانی شارستانێتییە ئاڵۆزەکەیدا پشتدەبەستێت بە جۆرەکانی پسپۆڕیو تایبەتمەندیو دابەشکردنی کار. لەشکۆدارییەوە نیە کە لەم کۆمەڵگایەدا باوکان رۆڵەکانیان هاندەدەن بۆ لاساییکردنەوەی کەسانی تر. هەموو منداڵێك ئامادەیە تایبەتمەندبێت لەلایەنێکی دیاریکراودا لەلایەنەکانی شارستانیداو بەشداربێت لەبەرهەمهێنانی کەلەپوری کۆمەڵایەتی بەپێی توانای خۆی. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر باوکان بەوردی چاودێری نەوەکانیان بکەن لەکاتی گەشەکردنیاندا هەتا ئەو بوارەیان بۆ دەردەکەوێت کە بەکەڵکی منداڵەکانیان دێتو ئەوانیش سود لەو بوارە وەردەگرنو باوکانیش یارمەتیدەریانبن لەو بوارانەدا.

ئەوانەی نەوەکانیان هاندەدەن لەسەر لاساییکردنەوەی کەسانی تر لەراستیدا ئەوانە خێڵەکینو جلوبەرگی مەدەنییەکان دەپۆشن. کۆمەڵگای خێڵەکی لەسەر جۆرەکانی تایبەتمەندی راناوەستێت تەنها بەدەگمەن نەبێت چونکە ئەو کۆمەڵگایەکی داگیرکەرو تاڵانچییە. ژیانی خێڵەکی زۆرینەی دارێژراوە لەسەر شکۆدارکردنی ئازایەتیو بەخشندەیی. خێڵەکی لەلایەکەوە خەڵك تاڵان دەکاتو لەلایەکی ترەوە ئەو تاڵانییە سەرفدەکات بۆ میوانداریو رێزگرتن لەخەڵك. لەبەرئەوە دەبێتە پێویستی لەسەر باوکی خێڵەکی تا منداڵەکەی هانبدات لەسەر چاولێکەریو لاساییکردنەوەی کەسانی تر. لەبەرئەوەی تەنها تایبەتمەندییەك هەیە کە پێویستە هەموو کەسانی هۆزەکە شارەزای بن. ئەو کەسەشی کە تیایدا شکستدەهێنێت ئەوا مافی دەخورێتو بێبەشدەکرێت، دەستبەجێ وەك پۆڕی خوراوی لێدێت لەو پێکداهەڵپژانە توندوتیژەی بیابان نشیندا.

دەکرێ بیابان بە هاوشێوەی ((بێژنگ)) دابنێین، هیچی تێدا نامێنێتەوە کە بخواتو نەخورێت تەنها ئەوانەی بەهێزنەبن واتە (پێست ئەستورەکان نەبێت کەسی تر بەرگەی مانەوەی بیابان ناگرێت بەمانایەکی تر ئەوانەی کە ڤیرسیچمەو سینەسەختو جەربەزەن دەتوانن هەڵبکەن لەبیاباندا- و: کوردی). ئەوەش دووبارە کارگەیەکی وەبەرهێنانی یەك جۆر مرۆڤە- ئەوانەش پاڵەوانی بەخشندەن. کەواتە منداڵی خێڵەکی ناچارە یان پاڵەوانێکی بەخشندەبێت یان بمرێت، ئەگینا پاڵەوانە بەخشندەکانی تر دەیخۆن.

کۆمەڵگای پێشکەوتوو پێچەوانەی ئەمەیە، پێویستی بە هەوڵو تێکۆشانی هەموو تاکێکە، لاوازبێت یان بەهێز، هەموو تاکێکیش لەو بوارەی خۆیدا کاردەکات کە دەتوانێت شتێکی تێدا بەرهەمبهێنێت لەو پسپۆڕییەی کەتێیدا سەرکەوتنی وەدەستهێناوە.

بەکورتییەکەی: ڕێگەی خێڵەکی لەپەروەردەکردنی ڕۆڵەکانی شاردا دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی نەوەیەکی گیرۆدەبوو بە زۆرینەی گرێ دەروونییەکان. ئەمەش ئەوەیە کە هەندێکمان سکاڵای لێدەکەین لەم کۆمەڵگا نوێییەماندا[٩].



لەکاتێکدا منداڵ گەورە دەبێت لەسەر ئەم شێوازی پەروەردەکردنەو پاشان ئارەزوو دەکات بۆ لاساییکردنەوەی هەموو سیفەتێك لەو سیفەتانەی کە چاوی پیا خشاندوون لەکەسانی تردا و سەرنجی ڕادەکێشن و سەرسامدەبێت پێیان. وەك ئەوەی سەرسامدەبێت بە جموجوڵی یەکێك لەمامۆستاکانی یان شێوازی قسەکردنی یان ڕێگای بەڕێوەڕۆشتن و هەوڵدەدات لاسایی بکاتەوە بەمەش دەبێتە جێگەی پێکەنینی خەڵك.

جارێکیان بینیم هاوڕێیەکم دەڕۆیشت بەڕێگادا لەسەر شێوەی قەلەڕەش و بەیناوبەین قەڵەمبازی دەداو هەڵدەقونییەوە بەشێوەیەکی دروستکراو. پاش پرسیارکردن و لێکۆڵینەوەم لەسەر ئەو هاوڕێیە بۆم دەرکەوت کە ئەم برادەرە قوتابی بووە لەکۆلێژی پزیشکی و ڕۆیشتنی یەکێك لەمامۆستا بیانییەکانی سەرسامیکردووەو ئەویش دەیەوێت لاسایی ئەو بکاتەوە لەڕۆیشتندا، بەمەش هەردوو ڕۆیشتنەکەی تێکداوە بەسەریەکداو شارەزا نیە تێیداو لەهەر دووکیان بووە.

زۆربەی لاوە ئەدیبەکانمان هەڵدەسن بەلاساییکردنەوەی (طه حسین) یان ئەدیب و نوسەرە بەناوبانگەکانی تر. بۆیە دەیانبینین خۆیان خەریك دەکەن بە لاساییکردنەوەی ئەو شێوازی نوسینەی کە ئەوانە نوسیویانەو داواش دەکەن لەخەڵکی کە سەرسامبن بە نوسینەکانی ئەمانیش هەروەك چۆن سەریان سوڕماوە لەنوسینەکانی ئەو نوسەرە بەناوبانگە- بەڵام بێ ئاگان لەوەی کە شێوازی نوسەر بەشێکە لەکەسایەتی نوسەرو لێی جیانابێتەوە، چاولێکەری و لاساییکردنەوەی بەشێکی دیارکراو لەکەسایەتی یەکێك لەخەڵکی دەبێتە هۆی دروستکاری و هیچ و پووچی.

هاوشـێوەی ئەمــە دەگێڕنــەوە لــەبارەی ئــەو وتاربێژانــەوە کــە لاسـایی وتاربێــژە میـسرییەکانیان کردۆتـەوە لەوشـەیەکدا کـە ئـەو وشـەیە بـۆ تەئکیدکردنـەوە بـەکاردێت لەکاتی قسەکردندا، بەڵام بەپێچەوانەوە هەنـدێ لـەگوێگرەکانی وتاربێـژەکانی لای خۆمـان لەئەنجامی ئەوەدا بەجۆرێکی تـر لەوشـەکە تێگەیـشتوون کـە مانایـەکی هیـچوپوچی هەیـە لایان.

پێویستە نەکەوینە هەڵەوە کە دووجۆر لاسایکردنەوە هەیـە: ئـیرادیو نائیرادییـە واتـە (ویـستراوو نەویـستراو). کەسـێتی مـرۆڤ لەگەشـەکردنیدا پێویـستی بەلاسـاییکردنەوەی نەویستراو (نائیرادی) هەیە بەشێوەیەك سیفەتی ئەو چاولێکەرییە دەچێتە نێـو پێکهاتـەی کەسێتییەکەیو رەنگی ئەو دەگرێتو دەبێتە بەشێك لێی.

گومانی تێدانیـە هـەموو منداڵێـك ناچارە لاسـایی کەسـانی تـر بکاتـەوە بۆئـەوەی ببێتـە مرۆڤێك. بەڵام ئەم چاولێکەریو لاسـاییکردنەوەیە کـە پێویـستە بـۆ بنیاتنـانی کەسایەتی مرۆڤایـەتی لاسـاییکردنەوەیەکی نائیرادییـە یـان بـێ مەبەسـتە. یـان بـە جـۆرێکی تـر ئـەو لاسـاییکردنەوەیەیە کـە مـرۆڤ لاسـایی تیادەکاتـەوە لەسـەر پـەیامو سروشـتی خـۆی واتـە لەخۆڕسـکەوە بـەبێ ئـەوەی خـۆی مەبەسـتی بێـت. یـان بیـەوێت یـان چـاوی تـێ بڕیبێـت. لەراستیدا ئەم لاساییکردنەوەیە نابێت ناوببرێت بە مانای ئەو لاسـاییکردنەوەیەی وا لـەناو خەڵکدا باوە. چونکە ئەمە بریتیە لەجوینو هەرسکردنی سـیفەتێکی لاسـاییکراوەو پاشـان چـوونەناوەوەی بـۆ نێـو نـاخی پێکهاتــەی کەسـایەتی، هـەروەك چـۆن پارووپـەك پـاش هەرسکردنی دەچێتە ناخی پێکهاتەی بەدەنەوە.

بەڵام لاساییکردنەوەی ئـیرادی (ویـستراو)، بریتیـە لـەو لاسـاییکردنەوەیەی وا هەمیـشە رۆڵــەکانمان هانــدەدەین لەســەری بۆئــەوەی ئیلتیزامــی پێــوە بکــەن، ئەمــەش هــەروەك پەرەپێدانی شتێکە بەهۆی پێوەلکانی خستنەسەرێکەوە لەدەرەوەی خۆی بەئەنجامدێت (بـۆ نموونـە وەك لەپێوەنـدکردنی درەختێکـی زڕدا بـە درەختێکـی بـەردارو لەئەنجامـدا ئـەو بەرهەمەی کە دەیـدات بەرهـەمی درەختـە بەردارەکەیـە بـەڵام لەسـەر جەسـتەی درەختـە موتوربەکراوەکە پێدەگاتو گەشەدەکات. و: کوردی).

کەسێتی تاك هەمەلایەن و گشتگیرییەو خاوەنی پێکهاتەیەکی گشتییەو هەموو بەشەکانی پێکەوە بەستراون بەپێکەوەبەستنێکی ئەندامی. کەواتە پێگەیشتنی کەسایەتی راست نیە تەنها ئەگەر لەناوەوە برەوی پێنەدرێت.

کەسێکی پێگەیشتوو کاتێك سەرسامدەبێت بەسیفەتێکی دەرەوەی خۆی بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت لاسایدەکاتەوەو ئارەزووی چۆتەسەری و پاشان بە هەڵگیراوی جێدەمێنێت لەنێو قوڵایی عەقڵی شاراوەیدا (ناوەوەیدا) و بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ دەرکەوێت لەهاوشێوەی دەستکردو خۆپێوەخەریککردن. دوایش لەکاتی خۆیدا دێتە دەرەوە هەروەك ئەوەی بڵێی لەجۆرێکی تازەیەو لەو کاتەدا بۆیەکراوە بە بۆیەکردنی کەسێتی تایبەتمەندی ئەو کەسە خۆی و بۆتە بەشێك لێی و لێی جیانابێتەوە.

بۆ نموونە یەکێکمان دەیەوێت خاوەنی کەسێتییەکی رێکوپێك و ناوازبێت، گومانی ئەوەی هەیە کە ئەم کارە بەدەست خۆی بێت. ئەو کاتێك دەبینێت کەسانێکی تر جگە لەخۆی خاوەنی قسەی خۆش و نوکتەو هەزەلیاتن و بە نوکتەی خۆش و سەرنجڕاکێش کەسانی دەوروبەریان دەخەنە پێکەنین، ئەمیش دەیەوێت لاسایان بکاتەوە لەبەرئەوە دەیبینێت خۆی خەریك دەکات بەوەوە کەنوکتەکان لەبەرکات لەناو دڵیاو هەوڵدەدات بیانڵێتەوە لەهەموو کۆڕو کۆمەڵێکدا هەرچەند زۆر رژدە لەسەرئەوەی کە بەتام و چێژی خۆیانەوە ئەدای کردوون و خۆی بەکەسێکی رێکوپێك دەخاتە پێش چاو بەڵام بەپێچەوانەوە بە گەوج و گەلحۆ دەناسرێت لەناو خەڵکیدا. نوکتە لەبەرناکرێت و لاسایی ناکرێتەوەو ناشگونجێ بە ئەنقەست و لەخۆڕا بیگێڕیتەوەو بیهێنیتە ناو کۆڕی قسانەوە. نوکتەبازی (نوکتەچی) داهێنەر نازانێت دوای چرکەیەکی تر چی دەڵێت. زۆر جار وا رووددەدات دادەبڕێت بە تابڕانێکی یەکجارەکی لەوەی کە نوکتەیەکی بۆ بێت و بیگێڕێتەوە کە ئەو نوکتەیە شیاوبێت و داوای لێبکرێت بۆ گێڕانەوەی، کەچی دەبینێت گەر لەخۆیەوە بێت و بێ داواکاری هیچ کەسێك ئەوا ئیجای کۆمەڵێك نوکتەی جوانی بۆ دێت و یەك لەدوای یەك دەیانگێڕێتەوە هەروەك بڵێی پێشتر ئامادەی کردوون و ئامادەباشی خۆی بۆ خستوونەتەکار بە ئامادەباشییەکی هێجگار گەورە.

لەراستیدا دەکرێت ئەو بەشێوەیەکی پراکتیکی خۆی ئامادەکربێت و پەنای بردبێتەبەر خۆ خەریککردن لەگەڵیدا، ئەو نوکتەکانی لەبەرکردووە بەڵام نایەوێ بێنەوە بیری

مەبەستی نیە دەریانبڕێت بەتایبەت لەکۆبوونەوەیەکی دیاریکراودا نەبێت. چونکە ئەو لەگەنجینەی نەستیدا کۆیاندەکاتەوەو لەبیریانی دەکات تا کاتی خۆی دێت ئەوکاتە دێنە دەرەوە هەر لەخۆیانەوە بەشێوەیەکی خۆڕسك‌و ئەویش هەڵدەستێ بە زیادکردنی جوانکاری کوتوپڕ بۆی هەر لەوکاتەداو رازاندنەوەو رەونەقێکی نوێی دەداتێ کە شایستەی ئەو شوێنە گەنجاوە بێت بە تەواوی.

دەکرێ لەبارەی هونەرمەندیشەوە ئەم قسەیەبکرێت‌و بچەسپێت بەسەریدا. هونەرمەندی لێهاتوو لەنێو هونەرمەندانددا ئەوەیە کە رۆدەچێتە نێو دەوری نمایشەکەی خۆیەوەو بەشێوەیەك نازانێت چی لەدەوروبەری روودەدات کاتێ دەچێتە سەر تەختەی شانۆ. چونکە ئەو دەورەکەی خۆی لەبەرکردووەو بڕیاری ئاماژەکاریە دەستی‌و جەستەییەکان‌و چۆنێتی دەربڕین‌و جوڵەکانی وازلێهێناوە بۆ ساتەوەختی پێشکەشکردن‌و نمایشکاری‌و کارتێکردنی تیشکە دەرونییەکانی بینەران کە لەو کاتەدا پێی دەگەن. بەمەش وەك ئەو وتاربێژەی لێدێت کە دەتوێتەوە لەکەش‌و هەوایەکی دەروونی زاڵبوو بەسەر هۆڵەکەداو خۆی لەبیر دەچێتەوە.

بەڵام هونەرمەندی سەرنەکەوتوو (دۆڕاو) ئەو هونەرمەندەیە کە زۆر بەخۆیدا دەنازێ‌و خۆی لێ دەگۆڕێ‌و بە جۆرێکی وا رۆدەچێتە نێو خودی خۆیەوەو ئیرادەی وەك پەردەیەکی ئەستوری لێدێت کە دەبێتە رێگر لەبەردەم تیشکی دەروونی بینەران بۆ چوونە ژوورەوەی ناوەوەی دەروونی خۆی. ئەو حەزدەکات لاسایی یەکێ لەهونەرمەندە بەناوبانگەکان بکاتەوە لەمەشدا وەك هاوڕێ قەلەڕەشەکەمانی لێدێت کە هەردوو رۆیشتنەکەی لەدەستدا.

هونەرمەند هەرچەندێك بیەوێت چالاك‌و لێهاتوو بێت دوور دەکەوێتەوە لەچالاکی. ئیرادە لەم جۆرە ئیش‌و کارانەدا پێچەوانەی بەدیهێنانی ئامانجی ویستراوە. چاکترین رێگا کە هونەرمەندو کەسانی تری ناهونەرمەندیش لەسەری دەرۆن لەرووبەڕووبوونەوەی جەماوەردا بریتیە لەوەی کە دابڕێت‌و بێئاگابێت لەئیرادەی خۆی‌و خۆی لەبیربچێتەوەو ببێتە رەخنەگرێك لەسەر ئەو بەهرە هەڵقوڵاوانەی کە لەقوڵایی دەروونییەوە دێنەدەرەوە. دەروون بەرکەوتە دەبێت لەو ساتەوەختەدا بەسەدای دەنگدانەوەی دەرونی ئامادەبووان لەسۆزداری‌و کاردانەوەکانیان.

لێهاتوویی‌و داهێنان لەهەموو كاروبارێكدا پشتدەبەستێت بە بەخششی عەقڵی ناوەوە پێویستە لەسەری بڕوات بە ڕۆشتنێكی سادەو سەرپێی‌و هیچ خۆماندووكردن‌و پێداگیرییەكی ناوێت. ئەوەی ئەم ڕاستیە گەورەیە پشتگوێ بخات لەژیانیدا پێویستە دان بە دابڕان‌و بێ توانایی خۆیدا بنێت‌و پاشەكشێ بكات لەگۆڕەپانەكەدا.



پێشتر ئەوەمان باسكرد كە (بەخت ڕەشی) گرێیەكی دەروونییەو لەنەستدا گەشەدەكات‌و وا لەخاوەنەكەی دەكات كە خەیاڵی لای شكست‌و دۆڕاندن بێت لەهەموو هەنگاوێك لەو هەنگاوانەی كە دەیهاوێژێت. بۆ ئەم گرێیەش-هەروەكو وتمان- دوو پایە هەیە:

خاوەنەكەی سوورە لەسەر سەركەوتن‌و دەیەوێت ئەو سەركەوتنە دەستەبەربكات لەلایەكەوە، لەلایەكی تریشەوە دەكەوێتە خەیاڵی تێكشكان‌و شكست‌و بڕوای پێیەتی. ئەوەشمان ڕوونكردەوە كەچۆن بەخێوكەرانمان یارمەتی گەشەكردنی ئەم گرێ دەروونییەیانداوە لەدەروونی منداڵدا، هەر ئەوانیش هاندەری ئەو منداڵە بوون لەسەر ئیرادە و سەركەوتن‌و پاشان لەدوایشدا وێنەی دۆڕاندن‌و شكستیان لەخەیاڵ‌و ئەندێشەیدا چەسپاندووە بەچەسپاندن، بۆیە شارستانێتی ڕۆژهەڵات ئەم دیاردەی هاندان‌و پشتگیریكردنەی تیایە لەزۆربەی ئاكارە فیكرییەكانیداو بۆتە هۆی یارمەتیدان‌و بلاوبوونەوەی ئەم گرێ دەروونیە لەعەقڵی خەڵكیدا.

پیاوێكم دەناسی ڕاهاتبوو لەسەرئەوەی كاتێ وتوێژی دەكرد لەبارەی هەر پڕۆژەیەكەوە كە بیویستایە ئەنجامی بدات ئەوا یەكسەر بە ڕەشبینی‌و بێ هیوایەوە قسەی لێدەكردو پێشبینی شكستخواردن‌و سەرنەكەوتنی لەو كارەدا بەدیدەكرد. ئەگەر قسەی بۆ هاوڕێیەكی بكردایە لەبارەی پڕۆژەیەكەوە ئەوا پێی دەوت ئەزانی من لەم پڕۆژەیەدا شكستدەخۆم‌و دەیدۆڕێنم، بە جارێ ماڵم وێراندەبێ‌و تێكدەشكێم‌و هەرەسدێنم. لەبەرئەوە جارێكیان گرتم‌و پێم وت هۆی چییە تۆ ئەوەندە ڕەشبینی‌و سوری لەسەر ئەوەی كەپێشبینی شكست‌و دۆڕاندن دەكەیت؟ لەوەڵامدا وتی: ((پێشبینیكردنی شكست‌و دۆڕاندن باشترە وەك لەپێشبینیكردنی سەركەوتن‌و بردنەوە، چونكە لەو حاڵەتەدا دەرون

ئامادەباشییەك وەردەگرێت لەسەر بەرگەگرتنی شۆکێك (صدمە)یەك ئەگەر روویدا)).
پاشان لەسەری دەڕوات و دەڵێ:- ((زیانی ئەو وشەیە ئەبێ چی بێ من بیڵێم چ ڕەشبینبم و چ گەشبین بم ئەگەر هاتوو قەدەری پرۆژەکە لەچارەی نوسرابوو سەرکەوێت یان سەرنەکەوێت و هەرەسبێنێت لەکۆتاییدا، خۆ تازە قەدەرەکە روویداوەو لێبۆتەوەو هەموو ئەو وشەو قسانەش کە دێن بەدەممانیدا هەروا وەك تۆزی بانان دەچن بەهەوادا بەبێ ئەوەی کاریگەرییان هەبێت لەسەر هیچ شتێك)).
ئەم بۆچوونە گەورەترین زیانی هەیە. بەداخەوە دەبینین لەنێو خەڵکیدا بڵاوبۆتەوەو بەخێراییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر خۆی خزاندۆتە نێو عەقڵیانەوە، ئەوەش لەوانەیە بەرەنجامێك بێت لەبەرەنجامەکانی ئەو فەلسەفە عەقڵانییەی کە بۆمان ماوەتەوە هەر لەدێر زەمانەوە، بۆیە خەڵکی لێرەدا لەوبڕوایەدان کە سەرکەوتن بەرەنجامی کۆشش و ئیرادەو بیرکردنەوەو تەگبیرکردنی چاکەو زیان بە مرۆڤ ناگەیەنێت زیان بە مرۆڤ ناگەیەنێت هەرچۆنێك قسەی لەبارەوەبکرێت. چونکە ((قسەکردن)) لەدیدی ئەواندا دەمەتەقێیەکی کتوپڕییەو دەڕوا بەهەدەر بەخێرایی و دەدرێتە دەم باوەو پاشان بۆ هەتا هەتایە لەناودەچێت وەك ئەوەی هەر بوونیشی نەبووبێت. لەڕاستیدا ئەو وشانەی وازیان لێدێنین و بەبایان دەدەین بریتین لەو وشانەی کە گەورەترین کارتێکردنی دەروونیان هەیە زیاتر لەو سەلماندنە لۆژیکیانەی کە هەوڵنەدەین عەقڵمان قەناعەتی پێ بێنێت. سەلماندنی لۆژیکی زۆرجار لەسنوری عەقڵی هەستیارەوە کاریگەرییەکەی (ئەژمار ناکرێت)و تێناپەڕێت لەبەرئەوە کارناکاتە سەر خەیاڵگەی (خەیاڵدان)ی مرۆڤ تەنها بەکەمی نەبێت. بەڵام ئەو وشانەی لەسەر بەدیهیەتی خۆمانەوە دەنێررێن پاش دووبارەکردنەوەیان چەندجارێك رۆدەچێتە نێو (نەستمانەوە)و گەورەترین کاریگەرییان دەبێت لەچارەنووسماندا بەبێ ئەوەی پێی بزانین.
یەکێك لەکەموکورییەکانی سەلماندنی لۆژیکی بریتیە لەوەی کە ناتوانێت ((عەقیدەیەك)) فەراهەم بێنێت لەدەرونی مرۆڤدا. چونکە عەقیدە بنیاتنراوە لەسەر ئیحاو دووبارەبوونەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە دەبینین واعزەکان و بیریارەکانمان (روناکبیرانمان) سەرکەوتوو نابن لەگۆڕینی خووڕەوشتی خەڵکیدا یان ناتوانن بیروباوەڕیان بگۆڕن تەنها زۆر بە دەگمەن نەبێت، ئەوانە هەمیشە هەوڵدەدەن کە قەناعەت بەخەڵکی

بێـنن لـەڕێگای مـشتومڕو بەڵگەهێنانـەوەو ئـەو جـۆرە شـتانەوە. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبیـنین خـەڵكی لـەكاروبارە فیكـریو كۆمەڵایەتییەكانیانـدا لەسـەر ئـەو بنەمایـە دەڕۆن بەڕێوە كە لەعەقڵی ناوەوەیانـدا (شـاراوە)یانـدا چەسـپبووە هەریەكـە لـەو بـیرو بۆچوونو دابونەریتو ئاكارانە.

هیتلـەر بـە هـۆی قەناعـەتی لۆژیكییـەوە نـەیتوانی ئـەو حەماسـەتو دەمارگیرییـە سەرسوڕهێنەرانەی خۆی بڵاوبكاتەوە لەناو نەتـەوەی ئەڵمانیـدا، بـەڵكو ئـەو ئـەم ئاكارەی ئەنجامـدا بـەهۆی ئیحـاو تـەڵقینو دووبارەكردنـەوەو هـەروەها بـەهۆی ئاهەنگـەكانو كۆبوونەوەكانو مانۆڕە سەربازییەكانەوە كە تیایاندا مۆسیقا لێدراوەو هوتافاتی لایـەنگران بەرزكراونەتـەوەو ئاڵاكـان شـەكاونەتەوەو فڕۆكـەكانیش بـەگرموهوڕیان ئاسمانیـان پڕكردووە.

وشـەیەك لەخۆتـدا دووبارەكـەرەوە چـەند جارێـك جـار لـەدوای جـار تـا وات لێـدێت دەتوانیت لەعەقڵی ناوەوەتدا شتێك لـە(ئیمـان) بـچەسپێنیت ئـیتر كـەم بێـت یـان زۆر ئـەو ئیمانە. هەروەك وتویانە — ئیمان كێو دەلەرزێنێت -.

هەندێ نوسەر رەخنە لە(قورئان) دەگرن چونكە چیرۆكو ئایەتـەكانی ئامۆژگـاری جـار لەدوای جار دووبارەدەكاتەوەو باسی خواو شوێنەوارەكانی لەبونەوەردا لەهەموو لاپەڕیـەك لەلاپەڕەكانیـدا دووبـارەو چـەند بارەكراوەتـەوە. ئـەو بێئاگایانـە چـوزانن هۆكـاری ئـەو دووبارەكردنەوانە چییە وا ئـەوان رەخنـەی لێ دەگـرن، بـەڵام بـا بـاش بـزانن بـەهۆی ئـەو دووبارەكردنەوانەوەیـە كـە ئـەو ئیمانـە قوڵـە بـەخوا چەسپیوەتە نێـو دەروونـی عـەرەبو وایلێكـردوون تـا (هـەیوانی كیـسرای رۆم)و (عەرشـی قەیـسەر)ی پـێ شـەقبەرن بـۆ مـاوەی چەند ساڵێك.

هەنـدێ لەبیرمەنـدە موسـڵمانە هاوچـەرخەكان بـۆ ئـەو رایـە دەچـن كـە (قورئـان) مـوعجیزەی پێغەمبـەری گـەورەی ئیـسلام (موحەمـەد)ە دروودی خـوای لەسـەر بێتـ.ئـەم رایـەش زانایـانی دەرونزانـی نـوێ پـشتگیری لێدەكـەن. (قورئـان) داهێنـانێكی نـوێ بـوو، هونەرێكی ناوازە بوو لەو هونەری پڕوپاگەندانەی كە جیهان تـا ئـەو كاتـە هاوشـێوەی لـەو جۆرەی بەخۆیەوە نەدیبوو. ئەمەش بەو مانایە دێـت كـە (قورئـان) جیـاوازبوو لەزۆربـەی هەموو ئەو كتێبە پیرۆزانەی كە دەركەوتبوون پێش ئەو سەردەمە.

 

وا دەردەکەوێت کە پێغەمبەر دەرکی بە کاریگەری وشەکردووە لەژیانی مرۆڤدا، بۆیە فەرموویەتی: ((تفاءلوا بالخیر تجدوه)) واتە: بەرچاوتان روونبێت بۆ خێرو چاکە هەر پێی دەگەن، بەبێ مەراییکردن ئەمەش لەمەغزادا جیاوازی نیە لەگەڵ ئەوەی کە ئەمرۆ زانایانی دەروونناسی دەیڵێن.

هەروەها لە(قورئانی پیرۆز)دا ئایەتێک هەیە کە پەیوەندیەکی گەورەی بەم بابەتەوە هەیە ئەویش ئەم ئایەتەیە ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾. بێگومان قسەکردن دەربارەی نیعمەت دەبێتە هۆی زۆرکردنی ئەو نازو نیعمەتە. هەموو وتەیەك کە مرۆڤ دەیڵێت بریتییە لەقسەکردن لەبارەی ئەو نیعمەتەوە کە لەخەیاڵیدا چەسپبووە بە بەرچاورونییەکی چاك و رەچاوکردنی سەکەوتن لەبەردەمیا خۆی دەنوێنێت.بەمەش وەك ئەو کەسەی لێدێت کە بەسەر پەتەکەدا دەپەڕێتەوە بەبێ هیچ ترس و دوو دڵییەك لەکەوتنە خوارەوە.

شارستانیەتی رۆژهەلات رۆڵەکانی راهێناوە لەسەر پێچەوانەی ئەوەی کە قورئان دەیڵێت. بەوەی کە هەر یەکەیانی ترساندووە لەوەی دەمبدەن لەگفتوگۆ دەربارەی نیعمەت. هەروەهاتۆ ناتوانیت قسە لەگەڵ ژنێکدا بکەیت لەبارەی کوڕەکەیەوەو پێی بڵێیت: کوڕەکەت ساغ و سەلیم وبەخشندەو لێبوردەیە یان کوڕەکەت زیرەك و چالاکە، ئەوا دەبینیت ئەو پێی دەشڵەژێ و پەنا بە خوا دەگرێت لەئەنجامی وتەکەی تۆو بەسەتا هاواردەکات و دەڵێ:- ((ئەوەی تۆ دەیڵێی وانیە، کوڕەکەم لاوازو گێل و کەودەنەو چاکەی تیا بەدی ناکرێت، ئای چۆن گیرم خواردووە بەدەستییەوە)).

ئەو دایکە وەنەبێت هەر تەنها لەقسەکەی تۆ بترسێت بەڵکو دووبارە لەقسەکەی خۆشی دەترسێت. ئەو حەزناکات زیان بەچاودێریکردنی بگەیەنرێت بەوەی کە کوڕەکەی ساغ و سەلیمە یان زیرەکە چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کوڕەکەی بە چاوەوە ببێت (ئەمە بە پێی بۆچوونی دایکی). بەلام کاتێ نیشانەیەکی سووك بەدی دەکات لەسەر نەخۆشی کوڕەکەی یان بەلگەیەکی لاواز دەدرێ بەدەستیەوە لەسەر گێل و گاواری یان تەمەڵی کوڕەکەی ئەوجا سەیرکە بزانە چی دەکات و چۆن سکالاو گازندەی لێ بەرزدەبێتەوەو دنیا ژێرەو ژوور دەکات لەداخی ئەو بەخت و ناوچاوە رەشە خوا داویەتی بە خۆی و منالەکانی و خەلکانی تر بێبەشن لێی.

راهاتووین لەسەرئەوەی بترسین لەباسکردنی نیعمەت بە هەموو شێوەکانیەوە. ئەم خووەش هۆکاری کۆمەڵایەتی‌و دەروونی خۆی هەیە کە زیاتر لەشارستانێتی رۆژهەڵاتدا دەستەبەرە وەك لەهەر شارستانێتییەکی تردا دەستەبەربێت[10].

لەبەرئەوە بیروباوەڕی (بەخت) بڵاوبۆتەوە لەناوماندا‌و زۆرن ئەوانەی خاوەنی بەختی رەشن لەناو ریزەکانماندا.

جێگای سەرسوڕمانە کە لەکاتێکدا شارستانێتیمان وامان لێدەکات خەیاڵ بکەینەوە لەدۆڕاندن‌و شکست‌و ڕاماندێنێت لەسەر پشتگوێخستنی ئەو سەرکەوتنەی کە بەعەفەوی بۆمان هاتووە بەبێ ئازارو ناڕەحەتی. هەروەك پەندێکی باو هەیە لەناوماندا دەڵێ:- ((پاداشت بەپێی عەزاب‌و نارەحەتییە)). {لەکوردەواری خۆشماندا پەندی لەو جۆرە زۆرن بۆ نموونە وتراوە: چی بچێنیت ئەوە ئەدوریتەوە. یان پەندێکی تر دەڵێت: کەس ناچێتە گۆڕی کەسەوە. واتە: هەرکەسەو بەپێی چاکەو خراپەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە. و: کوردی} مەبەست لەم پەندە مانایەکی ئایینیە بە جۆرێك هەوادارانی ئایینی لەسەردەمە پێشینەکاندا کۆششیان دەکرد لەپێناوی خواداو ئەشکەنجەو ئازاریان دەهاتەڕێ تا بەو هۆیەوە پاداشتی خۆیان وەربگرنەوە. بەڵام ئەم مانایە وەك خۆی نەمایەوە لەسەر شێوەی تێگەیشتنی یەکەمجاری‌و سنووری ئایینیەکەی خۆی بەزاندو لای خەڵك بوو بە ئامۆژگارییەکی پراکتیکی بە جۆرێکی وا کە پێی کاریگەربوون لەزۆربەی ئیش‌و کارەکانیاندا بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن.

عەقڵی ناوەوە دەتوانێت: هەروەك وتمان، رێنمایی‌مرۆڤ بکات لەزۆر ئەو سوودانەی کە ناتوانێت بەدەستیان بێنێت بە عەقڵی هەستیاریان بە کۆششی هەستیار، کەواتە لەژیانی پراکتیکیماندا ئێمە پێویستمان هەیە بە ئامۆژگارییەکی پراکتیکی کە پێچەوانەی ئەو ئامۆژگارییە بێت وا دەڵێ: سەرکەوتن بە پێی عەزاب‌و نارەحەتییە.

ئەوەی شایانی وتنە بیڵێین ئەوەیە کە سەرکەوتن بە ئەندازەی ئارامی‌و پەیامداری‌و خۆهیلاك نەکردنە، ئەوەش لەبەرئەوەیە تا لەژیانماندا ئەو روناکییە داهێنەرانەیە (بریسکە داهێنەرانە) وە بەرهەمبێنین کە لەنەستمانەوە دەردەپەڕن. زۆرن ئەو هەلە زێڕین‌و بەنرخانەی وەك هەور بەسەرماندا تێپەڕدەبن، واش دەگونجێ زۆر شێنەیی بێت لەکاتی تێپەڕینیدا پاشان نارەحەتە هەرچەندێك لێمان دوورکەوێتەوە. کەواتە پێویستە

 

لەسەرمان خۆمانی پێ پشکدارکەین (سودمەندبین لێی) لەکاتی تێپەڕینیدا بەبێ ئەوەی پەنابەرینەبەر بیرکردنەوە یان دوو دڵی یان خۆ ئامادەکردن.

ئەو کەسانەی لەو بڕوایەدان کە سەرکەوتن لەسەر ڕێژەی زەحمەتو ماندووبوون بەدەستدێتو ناتوانن سوود لەهەلە بەنرخەکان وەرگرن، لەوانەشە بەهۆی ئاسانی بەدەستهێنانی ئەو هەلە بەنرخانە لەکاتی تێپەڕبوون بەسەریاندا هەر خەیاڵیان بۆی نەچێتو بیریشی لێنەکەنەوە، بۆیە دەبینین ئەوانە ڕێزی نرخداریی ئەو هەلە بەنرخانە ناگرنتەنها ئەو کاتە نەبێت کە تێدەپەڕن بەسەریانداو لەدواییدا ناخوداخی بۆ هەڵدەکێشنو پەنجەی پەشیمانی بۆ دەگەزن {بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم حاڵەتە لەکوردەواری خۆشماندا ئەم پەندەی بەسەردا دەچەسپێت کە دەڵێ: لەدوای تری خەمشەی بڕێ. و: کوردی}.

زۆرجاران وا دەبێت شتە سوودمەندەکان زۆر بەسانایی و ئاسانی خۆبدەنبەدەستەوە لەسادەترین شێوازدا -لەکاتێك لەکاتەکاندا-. بەڵام ئەو ئاسانیو سادەیی بەدەستهێنانەی وا لەمرۆڤ دەکات کە بڕوا نەکات بەنرخو بەکەڵکن، ئەمەش لەوانەیە لەبەرئەوەبێت کە خەڵکی ڕاهاتوون لەسەرئەوەی بەدەستهێنانو چنگکەوتنی هیچ شتێکی بەنرخو سوودبەخش نیە بۆ مرۆڤ ئەگەر لەئەنجامی زەحمەتو هیلاکیو ماندووبوونەوە دەستی نەکەوتبێت، لەبەرئەوە لەسەر ئەم پێودانگە هەموو هەلە بەنرخەکان لەکیس خەڵکی دەچنو تێدەپەڕن بەسەریاندا.

ئایینی ئیسلام زۆربەی دروشمەکانی خۆی بۆیاخ کردووە (ڕازاندۆتەوە) بە وەلانانی (خۆماندوو کردن و ئێش و ئازار و ناڕەحەتی). هەرچەندە پێغەمبەر (محەمەد.خ) لەفەرموودەیەکیدا دەفەرموێت:- ((جئتكم بالشريعة السمحاء ))واتە : (یاسا و دەستوورێکی ئاسان و لێبووردەم بۆ هێناون) بەڵام شوێنکەوتووانی ئەمەیان فەرامۆش کردووە و ئایینەکەیان کردووە بە ناڕەحەتترینی ئایینەکان و زۆرترین ماندوو بوون و زەحمەت و گوێڕایەڵی دەوێت، هەروەها بۆنە و فەرمان و تەقسە ئایینییەکانیان زۆر ورد کردۆتەوە و درێژەیان پێداوە و بەشەکانیان ئاڵۆز کردووە و پڕیان کردووە لە: "مەکە و بقە"، ئەوانە تا ئێستاش هەر لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن و مشت و مڕیانە لەسەر دانانی شێوازی تێکەڵ و پێکەڵکردنی شتەکان و ئاڵۆز کردنیان، تا وای لێدێت کار نەگاتە ئەو

 

ڕادەیەی کەسی موسوڵمان بیەوێت هەڵسێ بە جێبەجێکردنی تەقسە ئایینییەکان ئەوا ئەبێت ناچار بێت ئیشەکەی بەجێ بهێڵێت بۆ ئەوەی بتوانێت بوار بۆ خۆی بڕەخسێنێت تا خەریکی هونەرەکانی خۆ خاوێنکردنەوە (تارەت گرتن) و دەست نوێژ گرتن و مەرجەکانی نوێژ و هەروەها مەرج و داواکاریەکانی ڕۆژوو گرتن و ئەوانی تر بێت ...

لەراستیدا عیبادەت و خواپەرستی حەقەو تاك سوودی لێ وەردەگرێت بەشێوەیەکی دەروونی. چونکە بڕواو دڵنیایی لەدڵ و دەروونی مرۆڤدا دەچێنێت و دەیکاتە کەسێکی گەشبین لەژیاندا و بڕوای بەوە دەبێت کە خوایەك هەیە چاودێری دەکات و ئاگای لەهەموو هەڵسوکەوتێکییەتی و یارمەتیدەرییەتی بۆ چارەسەکردنی کێشەکانی، ئەمانەو بەڵام پیاوانی ئایین لەم سودو کەڵکە دەروونییەیان کەمکردۆتەوە کە تاك وەریدەگرێت لەخواپەرستیدا بەوەی کە کردوویانە بە پارێزراوێکی سەپێنراوی پڕ مەرج و داخوازی وردو ئاڵۆز. ئەو بەندەیەی لەسەر ئەم شێوازەو بەم پێودانگە خوا دەپەرستێ ناتوانێت ماوەو بوار بۆ دڵی فەراهەمبێنێت بۆ پاڕانەوە لەخوای خۆی و درێژکردنەوەی چاودێرییەکان لەسەری، لەبەرئەوەی لەکاتی خواپەرستی و عیبادەتدا سەرقاڵە بە جێبەجێکردنی بڕگەو وردەکارییە ئاڵۆزەکانی ئایینەوە چونکە دەترسێ لەوەی کە شتێکی لەبیرچووبێت و نەیتوانیبێت جێبەجێی بکات.

زۆرمانبینیوە لەخواپەرست و بەندەکان کە چۆن کاتێکی زۆر خەریکن بە دەستنوێژگرتنەوە بۆئەوەی بتوانێت لەسەر شێوەیەکی زۆر وردو داواکراو دەستنوێژەکەی هەڵبگرێت و تاوەك ئەوەی کە پێویستە نوێژەکەی پێبکات. جا ئەوسا وەرە سەیرکە لەکاتی نوێژکردندا بزانە چۆن هەردوو لێوی بۆ دەکشێنێت و زمانی گێڵدەدات و دەیچەرخێنێت بەسەرو خواری ناودەمیداو لەهەر پیتێکدا بە شێوازی خۆی و فۆنەتیکی دیاریکراوی سەپێنراو دەریدەبڕێت- بەمەش مانای نوێژەکە لەدەستدەدات و هیچی بۆ نامێنێتەوە تەنها ڕسوماتی حەرەکات و سەکەناتی رووت نەبێت.

ئەم حاڵەتە هەمیشە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی گرێی دەروونی لای خاوەنەکەی و پێی دەوترێت گرێی بێ کەموکوڕی (تێرو تەسەل)- Perefection- کە بە زۆری لەناو خەڵکدا ناودەبرێت بە ڕاڕا (واسواس).

 

ئەم گرێیە لەزۆربەی خەڵکیدا هەیە بە پلەی جیاواز بەڵام لەهەندێ کەسدا بووە بە نەخۆشییەکی کوشندەو درێژخایەنو چارەسەکردنی هەروا ئاسانییە.

گرێی (تێرو تەسەل) راستە گەر ناوی لێبنرێت یان ناوببرێت بە ((ئیرادەی بەبەردبوو)) یان ئیرادەی نەگۆڕ. سەرچاوەی گەشەکردنەکەی لەیەکەم بڕیارلێدانیدا ئەوەیە کە مرۆڤ هەوڵئەدات کارەکانی بەجددیو لەسەر شێوازی داواکراو جێبەجێبکات. لەواقیعدا هەموو مرۆڤێك هەندێجار دەیەوێت ئەوکارەی کە دەستی پێکردووە بەرێکوپێکیو بێ کەموکوڕی بەئەنجامی بگەیەنێت. بەڵام ئەم جۆرە ئیرادەیە بووە بەردو جوڵەی لێبراوەو بەرکەوتەبووە بەگرێی دەروونی، وایکردووە لەکەسی تووشبوو کە زۆر بەوردیو پارێزەوە هەڵسێ بە ئەنجامدانی کارەکانی، ئەمەش وە نەبێت تەنها لەیەك حاڵەتو لەیەك بابەتی دیاریکراودا بەڵکو لەهەموو حاڵەتێكو سەرجەمی بابەتو ئیشو کارەکانیداو چاوپۆشیش دەکات لەو ئەنجامەی کە هەوڵو تەقەلای بۆ دەدات.

ئەو گرێیە سوودبەخشە بێتو گەر راستبێتو بنیاتنرابێت لەسەر بنەمای (بەدیکردن-رێبەدێیی‌و- لێوردبوونەوە). بەڵام بەداخەوە مرۆڤ زۆر بەدەگمەن ئیشو کارەکانی بەڕێ دەکات لەسەر بنەمای – راستیو رێ بەدێیی. ئەگەر هاتوو مرۆڤ ڕاهات لەسەر ئەوەی ئیشوکارەکانی بە وردەکارییەوە جێبەجێ بکات ئەوا دەگاتە ئەو ئاستەی کە خۆشەویستی وردکردنەوەو وردەکاری بگاتە پلەیەکی لەڕادەبەدەر. لەو حاڵەتەشدا دەیبینیت وردەکاردەبێت تەنها لەپێناوی خودی وردبینیداو ئەو ئامانجەی لەبیردەچێت کە لەپێناویدا وردبین بووە.

ئەم گرێیە دادەنرێت بە گەورەترین هۆکارەکانی دۆڕاندنو شکستخواردن لەژیاندا. خاوەنەکەی ناتوانێت بە هیچ کارێك هەڵسێت تەنها زۆر بە نارەحەتی نەبێت. ئەمەش لەبەرئەوەی کە توشبوو ڕوانینەکانی دووبارە دەکاتەوە لەهەموو بەشێك لەو بەشانەی کە ئیشی تێدا دەکاتو بەمەش گرنگیدان بە ئەسڵی شتەکە پشتگوێ دەخات لەپێناوی گرنگیدان بە لقو پۆپەکانی ئەو ئیشو کارە، یان بەدەربڕینێکی تر: ئەو مەبەستەکە فەرامۆش دەکاتو گرنگی دەدات بە هۆکەی، بەزۆری هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی پرۆژەکەدا مەبەستەکە لەبیربراوەو فەرامۆشکراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام دەبێت لەکارەکەیداو لەوکاتەدا هەست بە پاڵنەرێکی نامۆ دەکات کە پاڵیپێوەنەرییەتی بۆ

تـەواوکردنی کارەکـەی‌و لەتوانایـدا نییـە بەرپەرچی بداتـەوە. ئـەو لەکاتێکدا هەڵدەسێت بەجێبـەجێکردنی کارێـك عـەقڵی بۆئـەوە نەچـێت کـە کەسـێکی دیـاریکراو وەسـتاوە بەڕاسەریەوەو چاودێری دەکات، وەك ئەوەی بڵێیت تەنها کارێك ئەنجامدەدات تایبەت بێت بە خۆیەوە یان بەشێوەیکی تـر خـۆی‌و دەروونـی خـۆی پشتگیری دەکـەن لـەو کـارە بـەبێ ئەوەی کەس بیبینێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پلەی تەواوکاری وابنیاتنراوە تیایـدا تەنانـەت ناتوانێت ئەو کەسە خەیاڵیە دروستکراوەی سەر سەری خۆی هەڵوەشێنێتەوە کە لـەوەهمی خۆیـدا دروسـتیکردووەو بۆتـە چـاودێر بەسـەرییەوە، ئـەو بـەجۆرێك وردەکـارە لەهـەموو گەورەو بچوکێکی ئـەو کـارەی وا دەیکـات وەك ئـەوەی بڵێـی لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە دوایـی حسابێکی زۆر توندوتیـژی لەگەڵدا دەکرێـت هـەر بۆیـە دەشـێ ئـەم فـەرموودە کاریگـەرەی بەسـەردا بـچەسپێنرێت‌و راستدەرچـێت:- ((ئەوەنـدە خۆیـان تەنگـەتاو دەکـەن تـاخواش تەنگەتاو دەبێت لێیان )).

ئـەم گـرێ دەروونیـە بەشـێوەکی ترسـناك بڵاوبۆتـەوە لەوڵاتەکەمانـدا. بۆیـە لەوانەیـە زیادەڕەویم نەکردبێت ئەگەر بڵێم لەگرنگترین هۆکارەکانی یارمەتیـدەر بـۆ بڵاوبوونـەوەی ئەم گرێیە لەم وڵاتەدا بریتیـە لـەو وردەکارییـە تونـدەی کـە پیـاوانی ئـایینی هەوڵیانـداوە بیکەن بە بەری رێ‌و رەسم‌و تەقسە ئاینییەکاندا.

منالّ کە پێدەگات‌و ئیلتیـزام دەکـات بـە ئاینـەوەو ڕادێـت لەسـەر وردەکارییـەکانی رێ‌و رەسم‌و تەقسە ئاینیەکە، ئەو کاتە ئەو منداڵە دەبێتە خاکێکی بەپیت بۆ گەشەکردنی ئـەو گرێیـە تێیـدا. لەراسـتیدا ئـەم گرێیـە زیـاتر لـەنێو ئەوانـەدا بڵاوبۆتـەوە کـە وابەسـتەن بەئایینەوە وەك لەوانی تر. زۆرجار وا دەبێت هەندێك لەوانەی کـە ئیلتیزامیـان هەیـە بـە ئاینەکـەوەو بـە قـوڵی رۆچـوونەتە نێـوی دەبینـی دوور دەکەونـەوەو هەڵدەگەڕێنـەوە لەئایین‌و واز لەنوێژو رۆژووگرتنیش دێنن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گرێ دەرونییەکەیان هەر وازیان لێناهێنێت‌و لەکۆڵیان نابێتەوە، ئەمانە رزگاریان بووە لەحاڵەتی واسواسی کاروبارە ئاینیـەکان‌و رێ‌و رەسمـی بـەکارهێنانی داخوازییـەکانی ئـایین، بـەڵام بەدیوەکـەی تـردا لەچەند لایەنێك لەلایەنەکانی ژیاندا گیرۆدە بوونەتـەوە بـە واسواسی بـە شێوەیەکی تـرو لەوانەیە لەم جۆرەیانـدا واسواسبن لەمـەرج‌و رێنماییـەکانی پـاك‌و خـاوێنی‌و خۆپاراستنی

تەندروستی لەجیاتی دەستنوێژگرتن و پاك و خاوێنییە ئاینییەکە، یان واسواس دەبن لەرێ و رەسمی خوێندنەوەو نوسیندا لەجیاتی نوێژکردن و رۆژووگرتن.

پەندێکی باو هەیە دەڵێ: ((واسواسی گلاوە)). ئەمەش بەو مانایەدێت کە ئەو کەسەی بە لێوردبوونەوەو پشکنینێکی هێندە وردەکارەوە دەچێتە نێو خۆ پاککردنەوەو خۆ خاوێنکردنەوەوە ئەوا هەرگیز ناتوانێت پێی بگات لەبەرئەوە دەبینی هەمیشە داواکاری ئەو خاوێنییەیە بەڵام نایبینێتەوە لەخۆیداو بۆی دەستەبەرنابێت، هەر بۆیەشە لەهەوڵی بێوچان و نەپساوەدایە بە دوای مەحاڵداو پێی ناگات، تەنها هیلاکی و سەرئێشەی بۆ دەمێنێتەوە.



لەراستیدا تەواوکاری لەهەموو شتێکدا مەحاڵە بێتە دی. سروشتی ژیان وادروستبووە کە ناتەواو بێت و کەموکوڕی تێدابێت بۆئەوەی بە بەردەوامی مرۆڤ لەهەوڵ و تێکۆشانی نەهێشتنی ئەو ناتەواویانەدابێت و لەوپێناوەدا کارگوزاربێت.

جوڵە، وەك لەپێشەوە باسمانکرد، بنەمایە لەسروشتی بوونەوەر(کەون)دا، (نەجولان) نیە تەنها مەگەر بەخەیاڵ و ئەندێشە پیشانبدرێت، ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە بوونی تەواوکاری یان (بوونی بێ نوقسانی و کاملیەتی تەواو) بەزۆری ئەوانەن کە بوونەتە قوربانیی لۆژیکە کۆنەکان – لۆژیکی نەجولان و حەقیقەتی رەها-.

بەزۆری ئەو ناتەواوی و کەموکوڕییانە زیاتر سودبەخشن بۆ مرۆڤ وەك لە(کاملیەت). ئەو کەسەی بە دوای کەماڵی تەواودا دەگەڕێت ئەوە نەخۆشەو بەدوای چارەسەردا دەگەڕێت، چونکە هەرچەندێك وردبێتەوەو بە توندی بگەڕێت بەدوای وەدەستهێنانی ئەو کەماڵەدا ئەوا هێندە لێی دوور دەکەوێتەوەو بۆی فەراهەمنابێت.

ئێمە گەر بێتو ژیانی سەرکەوتووەکان بخوێنینەوەو لێکۆڵینەوەمیان لەسەر بکەین دەبینین ئەوان لەکاتی ئیش و کارو سەرقاڵی کارەکەیاندا تا ئەوپەڕی رادە بێدەنگ و ئارام و هێدی بوون لەگفتوگۆو قسەکردن و هەڵسوکەتیاندا، بۆیە کە دەیانبینیت لەکاتی ئیش و کاریاندا وەك ئەو منداڵانە دێنە پێش چاو کە خەریکی یاریکردنن و تیایدا تواونەتەوەو ئاگایان لەخەڵك وخۆی دەوروبەریان نەماوە.

(مارستۆن) دەڵێت:- ((هەمووومان ئەم جۆرە هێزەمان پێدەگات لەسەر تەركیزكردن بەڵام چاوپۆشی لێدەكەین‌و پشتگوێ دەخرێ‌و ووندەبێت، وەك ئەو تێڕامانەی سەردەمی منالّی وایە بەلامانەوە كە پێی دەوترێت بێ عەقلّی منالّی‌و كەمی لێوردبوونەوە)).

(دوس هكسلی) دەڵێت:- ((هەموو منالّێك عەبقەرییەكە بۆخۆی تا دەگاتە تەمەنی دە سالاّن. ئایا هیچ دیمەنێك لەوە سەرنجڕاكێشتر دەبێت بە لامانەوە كە ببینین مندالّێك بنوشتێتەوەبەسەر كتێبێكداو لێی قوڵبێتەوەو تێڕامانی لێبكات، یان شتێكی نوێ سەرنجی بۆ لای خۆی راكێشێت‌و مندالّەكەش گرنگی پێبدات؟ زۆرجار لەمندالّ تووڕەدەبین لەسەر شتێك ئەوە لەكاتێكدایە كە ئەو منالّە هیچ ئاگای لەو تووڕەبوونەی ئێمە نیەو هەموو هۆش‌و گۆشی خۆی داوەتە ئەو شتەی واخەریكیەتی، بەڵام لەراستیدا ئەو بە دڵ‌و هۆش‌و عەقڵیەوە خۆی تەرخانكردووە بۆ ئەو شتەو بە پەرۆشەوە دەڕوانێتە ئەو حالّەتەی كە خۆی چاودێریكەریەتی، بۆیە پێویستە لەسەرمان بەپێی توانا خۆمان دوورە پەرێزبگرین لەسەر بەتالّكردنەوەو لەباربردنی ئەو هێزو توانا پیرۆزەی مندالّ كە لەكاتێكدا سەرقالّە بە گرنگیدانێكی زۆر بەپەرۆشەوە لەشتێكدا كە خۆی بەلایەوە سەرنجڕاكێشە)) [11].

لەراستیدا گەڕان لەدووی ئەو (كامڵیەتی تەواو)ەی وا كەسی واسواس تووشی بووە گەورەترین رێگرو ئاستەنگە لەڕێگەی ئەم تەركیزە زیهنییەدا. چونكە هەروەك گوتمان هەتا ئەو ئیرادە چەقبەستوو (بە بەردبوو)انە توندترو زیاتربن لەمرۆڤدا ئەوا دەبنە هۆی گرتن‌و داخستنی پەنجەرەكانی عەقلّی ناوەوەو رێگەی داهێنانی لێدەگرن. بۆ نموونە ئەو نوسەرەی قووڵبۆتەوە لەنوسینی وتارێكدا نابێت لەكاتی نوسیندا راوەستێت لەسەر هەڵوەستەكردن لەنێوان وشەیەك‌و وشەیەكی تردا‌و خەریكی شەن‌وكەوكردنی وشەكانبێت بەڵكو پێویستە لەسەر ئیلهام‌و سەلیقەی خۆی خەریكی داڕشتنی نوسینەكەی بێت بەپێی ئەو كەف‌و كوڵ‌و سروشەی لەوكاتەدا بۆی هاتووە. بێتو گەر لەسەر هەر وشەیەك راوەستێت‌و لێكدانەوەی بۆ بكات تا بینوسێت ئەوا هەموو ئەو پێوەرانەی نوسینی لێ وندەبێت‌و وای لێدێت خۆی سەری لەخۆی سوڕدەمێنێت‌و كارە بنچینەییەكەی بۆ ئەنجام نادرێت.

كـەماڵ حاڵـەتێكی ئیعتیبارییـە. ئـەوەی ئـەمڕۆ كامـڵو تـەواوە سـبەینێ كـەمو كـورتی هەیەو ناتەواوە، ئەوەشی كە لەدیدی تۆدا بە كامڵ دادەنرێت لەوانەیە لای یـەكێكی تـر بـە ناتەواو و نا كامڵ بێتە ئەژمار.

ئەو كەسەی زۆر دەگەڕێ بـەدوای كاملبوون لـەئیشو كارەكانیـدا دەبێتـە كەسـێكی دوو دڵو ڕاڕاو ناتوانێت بڕیار لەسەر ڕاوبۆچوونێك بدات بـە تـەواوی لـەولاوە ڕاو بۆچـوونێكی تـری بـۆ دروسـتدەبێتو ئەمـەی تـر پـشتگوێدەخات، هـەروەها شـتێك پەسـەند ناكـات بـە تەواوی لەگۆشەنیگای خۆیەوە كەچی سـەیر ئەكـەی گۆشـەنیگایەكی تـازەتری بـۆی هەیـەو ئەوەی پەكەمجار فەرامۆش دەكات.

لەو حاڵەتانـەدا وا چاكە لەگـەڵ سـەلیقەو شـارەزاییدا بڕۆیـتو گوێنـەدەیتێ لەكاتێكدا گـەر هەڵـەتكرد. چـونكە لەوانەیـە ئـەو كەموكووڕییـەی لەگـەڵ سـەلیقەو شـارەزاییدا دێتـەئاراوە چـاكتربێت لـەو كـەماڵو تەواوكارییـەی كـە پێویـستی بـە مانـدووبوونو خـۆ هیلاككردنی بێسود هەیە[١٢].

یـەكێ لەتوێـژەرەكان كتێبێكـی نوسـیبوو كـە ئـەم كتێبـەی هەنـدێ بەشـی بـاشو سەركەوتووبوون هەندێكی تریـان لاوازو كـرچو كـاڵبوون. لەمبارەیـەوە پرسـیاریان لێكـردو پێیان وت: ((بۆچی بەدوای كـەماڵو تـەواوكاری بنبەسـتدا نەگـەڕاوی لەهـەموو بەشـەكانی كتێبەكەتدا، یان بەشێوەیەك لەشێوەكان بەشە كرچو كاڵو لاوازەكانت لادایەو تـەنها بەشـە تێروتەسـەلو سـەركەوتووەكانت بنوسیبایەوە؟)). نوسـەرەكەش بـەمجۆرە وەڵامـی دانـەوە: ((بێتو گەر بەشە كاڵوكرچو لاوازەكانم نەنوسیبایەو پشتگوێم بخستنایە ئـەوا نەمـدەتوانی بەشە چاكو بە پێزو تێرو تەسەلەكانیش بنووسم!)).

ئەم نوسەرە لەناوجەرگەی حەقیقەتەوە ئەو قسەیەی كردووە. لەبەرئـەوەی بێتـو گـەر بهاتایە ئەو نوسەرە بە دوای تـەواوكاریو پلـەی كـاملی نوسـیندا بگەڕایـە لـەكاتی نوسـیندا نەوەی وا ئەوان داوای دەكەن كـە تـەنها بریتییـە لەنوسـینی شـتە بـاشو شایـستەكان، ئـەوا نوورنیە ئەو نوسەرە توشی چەقبەستوویی نەهاتایەو ئەو كاتەش كتێبەكـەی خـاڵی دەبـوو لەداهێنانو شتی باش، چونكە ئەو لەئـەنجامی نوسـینی شـتە هەڵەو لاوازەكانـەوە لەچـەند ـەشـێكدا گەیـشتۆتە نوسـینی شـتە چـاكو بـەپێزو داهێنـەرەكان لەبەشـەكانی تـری كتێبەكەیدا. بۆیە لـەم بارەیـەوە وتـراوە: هەڵەكردن ڕێگـای ڕاسـتیت نیـشاندەدات، ئەگـەر

هاتوو بەرگەی هەڵەکردنو کەموکووڕی نەگریت لەئیش‌و کارەکانتدا پێویستە لەسەرت بەهەمان شێوە چاوەڕوانی سەرهەڵدانی راستی‌و کامڵبوونی تەواویش نەکەیت.

(مارستۆن) دەڵێت: ((جەراحێکم بینی خەریکی نەشتەرگەرییەکی قورس بوو لەمۆخی سەری کەسێکی نەخۆشدا، بە جۆرێك بێتو گەر ئەو جەراحە بچوکترین هەڵە لەدەستەکانی بترازێت ئەوا دەبێتە هۆی مردن یان کەمئەندامبوونی ئەو کەسەو تووشی ئیفلیجی دەماخی دەکات. بەراستی لێهاتووییەکەی نەچەسپیبووە دەروونمەوە هێندەی ئەو لەسەر خۆیی‌و هێمنیە سەرسوڕهێنەرەی کە کاری کردبووە من. چونکە مەگەر هەر خۆم بزانم کە پێش چەند چرکەیەك لەنەشتەرگەرییەکە چۆن شڵەژابوو بەڵام کاتێك گەیشتە بەردەم مێزی نەشتەرگەرییەکە هێدی‌و ئارام بوویەوەو دەستیکرد بە ئەنجامدانی کارەکەی بە پێڕەوکردنی بڕگەکانی کارەکەی زۆر بە وردی‌و شارەزاییەوە، دووبارە هێندەی تر بەم کارەشی سەرسامبووم))[١٣].

ئەم جەراحە دڵنیایە جاروبار هەڵەدەکات، چونکە لەهەموو بونەوەردا کەسێك نیە کە هەرگیز هەڵە نەکات بە هیچ شێوەیەك. بەڵام لەوانەیە گرێمانی هەڵەی ئەم کەسە دڵنیاو ئارامگرتووە زۆر کەمتربێت لەو گریمانی هەڵەیەی کە بیکات لەئەنجامی وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای تەواوکاری‌و بێ خەوشیدا لەهەر جوڵەیەکدا کە ئەنجامی دەدات‌و پێی هەڵدەستێت. لەوانەیە ئەم گوتەیە راستبێت: رێژەی هەڵەکردنی کەمترە لەچاو ئەو ئاستەی کە رۆچۆتە نێو کارەکەیەوەو زۆر بە توندی خۆی پێوە خەریك دەکات. یان بەدەربڕینێکی تر: هەرچەندێك ئەو هەوڵی ئەوە بدات لەهەڵە دوور کەوێتەوە بە پێچەوانەوە هەڵەکانی زیاتر دەبێت [١٤]، هەرچەندێکیش بیەوێت وردەکارو بەدیقەتبێت ئەوەندە لێی دوور دەکەوێتەوە.

(جیمس) دەڵێت: ((جیاوازی نێوان عەبقەرییەکان‌و خەڵکانی ئاسایی سەرچاوەکەی ناگەڕێتەوە بۆ سیفەت یان بەهرەی فیترەت لەعەقڵدا، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بابەت‌و ئامانجانەی کە خەمەکانیانی بەرەوڕوو دەکەنەوە،هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ پلەی ئەو تەرکیزکردنەی کە پێویستە پێی بگەن)).

کەواتە چاکترە لەکاتی ئیشکرندا دوورکەوینەوە لەسەر پێداگیری‌و چەقبەستوویی‌و وردبوونەوەو توندوتیژی ئیرادە. داهێنەر ئەو کەسەیە قووڵدەبێتەوەو رۆدەچێتە نێو

کارەکەیەوەو تێیدا دەتوێتەوە. وە نایەوێت لەکارەکەیدا سەرکەوێتو لەجێبەجێکردنیشیدا مەبەستی لەتەواوکاری نییە. چونکە ئەو لەکاتێکدا کاردەکات بەخۆی نازانێتو هەست بەوەش ناکات کە مەبەستێك هەیە لەدوای کارەکەیەوەو هەوڵی بۆ دەدات. بەڵکو ئەو لەکاتی ئیشکرندا دەبێتە بەشێك یان پارچەیەك لەئیشەکە، کە ئەوەش بەهەماهەنگی لەگەڵ سەلیقەو شارەزایی خۆیدا دەیگونجێنێت، بەم کارەشی عەقڵی ناوەوەی دەخاتە بەردەم بڕیاری چارەنووسسازو ڕێبەرایەتی دەکات بۆ ئەو مەبەستە داواکراوەی بە جۆرێك کە خۆشی نەزانێت.



تکام ئەوەیە خوێنەری بەڕێز نەڕوات بەلای ئەوەدا کە وابزانێت ئیرادە لەهەموو کاتێکدا زیانی هەیە [15]. نەخێر بەڵکو کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە بۆ سوودلێوەرگرتنی. پێویستە لەسەر مرۆڤ جیاوازی بکات لەنێوان ئەو کاتە سوودبەخشانەو ئەو کاتانەش کە تێیدا ئیرادە دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ نارەحەتیو زەرەرو زیان.

مێژووی گەورە پیاوان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان زۆرترینی خەڵکانێکن کە کارو تێکۆشانو هێزی ئیرادەیان زیاترە لەخەڵك. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاهاتوون لەسەر ئەوەی کە پشووبدەن لەدوای کارەکانیانو عەقڵی ناوەوەیان سەرفرازکەن لەو شتانەی کە وا دەیەوێت جێبەجێیان بکاتو بە ئازادی خۆی ئیش بکات بەبێ هیچ ساتمەکردنێك.

کێشەی کەسێکی ئاسایی لەوەدایە کە ناتوانێت هەموو داب‌ونەریتە جیاوازو دژەکان لەخۆیدا کۆبکاتەوە. هەروەها ناتوانێت عەقڵی ناوەوەو دەرەوەی پێکەوە بەرهەمبهێنێت، بۆیە ئەو کەسە یان ئەوەیە ئیرادەیەکی زۆر بەهێزو چالاكو بەردەوامی هەیە هەمیشە لەکارەکانیدا، یان تەممەڵو تەوەزەل دەبێتو لەهیچ کاتێکدا گوێنەداتیو نەژنەوایە.

عەقڵی دیار پێچەوانەی عەقڵی نادیارە لەکارەکەیدا، هەروەك بەدرێژی لەبەشی داهاتوودا لەسەری دەدوێین. لەبەر ئەم هۆیە دەبینین یەکێك لەم دوو عەقڵە ناتوانێت

کارو فەرمانەکانی یان بەرهەمهێنانەکانی ئەنجامبدات لەکاتێکدا دەبێتە هۆی کپکردن‌و دامرکاندنەوەی ئەویتریان.

کێشەکانی مرۆڤ لەوەدایە ئەگەر هاتوو لەسەر شێوازێکی دیاریکراو لەهەڵسوکەوت ڕاهاتبوو ئەوا زۆر زەحمەتە کە بگۆڕێت لەکاتێکدا کە خۆی دەیەوێت، ئەگەر هاتوو کەسێك ڕاهاتبوو لەسەرئەوەی کە عەقڵی دیار (دەرەوە)ی خۆی بەکاربێنێت‌و پەنای بەرێتەبەر بۆ نەهێشتنی کێشەکانی ئەوا زۆر زەحمەتە بتوانێت سوودمەندبێت لەپەیبردنەکانی عەقڵی نادیار (ناوەوە)ی خۆی.

هەروەها زەحمەتە بتوانێت واز لەپێداگیری‌و ئیرادەی خۆی بێنێت لەکاتی پێویستدا ئەگەر ڕاهاتبوو لەسەریان لەهەموو کاروبارەکانی تری ژیانیدا.

لێرەوە جیاوازی‌و لێهاتوویی‌و هۆکاری سەرکەوتنی عەبقەری دەردەکەوێت بەسەر ئەوانی تردا. چونکە عەبقەری کەسێکی دەگمەن‌و هەڵکەوتەو ناوازەیەو دەتوانێت ئیرادەی بەهێزبێت‌و عەزمی توندوتۆڵبێت لەهەر کاتێکدا کە خۆی بیەوێت، دەشتوانێت خۆی بکاتە کەسێکی تەمەڵ‌و تەوەزەل‌و لاکەوتە لەکاتی پێویستدا.

داهێنانی فیکری پێویستە بە دوو قۆناغدا تێپەڕێت ئەوانیش قۆناغی (کۆکردنەوەو عەمبارکردن) لەگەڵ قۆناغی (دەرهێنان‌و ڕاکێشان). یان بە گوزارشتێکی تر: هەموو داهێنەرێك یان بیرمەندێك پێویستە لەسەرەتای کارەکەیدا کە دەستپێدەکات چالاك‌و کۆڵنەدەربێت بەشێوەیەك هەموو زانیارییە پێویستەکان کۆبکاتەوەو کەڵەکەیان بکات‌و هەڵیانبگرێت لەعەقڵی ناوەوەیدا تا هەڵدێن‌و پێدەگەن بە تەواوی.

ئەمەش ئەوەیە کە ناوی دەبەین بە قۆناغی (هەڵگرتن). ئەگەر بیریار ئەم قۆناغەی بڕی‌و تیایدا سەرکەوت ئەوا دەچێتەر سەر قۆناغی دووەم پەنا دەباتەبەر قۆناغی دووەم کەئەوەش بریتیە لەقۆناغی (داهێنان) یان دەرهێنان، بۆیە دەیبینیت لەو دوورەوە لێی دانیشتووە، (وەك مانگایەك چۆن دەست بە کاوێژکردن دەکات‌و ئەو خواردنەی گەدەی

دووباره دێنێتەوه ناو دەمیو جارێکی تر دەیەوێت بیجوێتەوه بۆئەوەی بۆ جاری دووەم بەتەواوی هەرس بێت لەگەدەیدا)، بۆیە ئەویش کەوتۆتە مەلەکردن لەنێو دەریای خەیالاتو ئەندێشەیداو لەهاوشێوەی زیندەخەو دایە بە روالەت، بەلام ئەو بیریارە لەو کاتانەدا عەقلی ناوەوەی سەرپشك کردووه تا سەوداسەرو سەرسامبێت لەو خەیالاتانەی وا خۆی ئارەزووی لێیەو بۆیدەکرێت. بۆیە لەو کاتەدا زۆربەی بیرو بۆچوونە داهێنەرەکان تێیدا هەلدەقولێنو سەرهەلدەدەن هەروەها لەگەل داهێنانو دۆزینەوەکانی تریشدا [16] .

بۆیە هەروەك ئەمە دەوترێت لەبارەی هەر کەسێکەوه کە شارەزاو لێهاتووه لەهەموو بواره هونەریەکانو پیشە دەسترەنگینییەکانو پیشەسازییە جۆراوجۆرەکان. کەسی شارەزاو لێهاتوو دەبینی چالاكو تێکۆشەرو رەنجدەرە لەکاتێکدا دەچێتە سەر هونەرەکەیو شارەزای بنەماکانی کارکردنەکەیەتی تێیدا بەلام لەبەرهەمهێناندا خۆی لەبیردەچێتەوەو بە تەواوی رۆدەچێتە کارەکەیەوەو تێدا دەتوێتەوه بۆیە ئا لەوکاتانەدا وەك ئەو کەسە خەوتووەی لێدێت کە لەکاتی خەوبینیندا نەهەستی هەیەو نەئیرادەش.



## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

١. لەسەردەمێکی نزیك لەم سەردەمەی خۆمانەوە ئەوەم بیستبوو دەربارەی چیرۆکی ئەو منالەی کە دەچێت بۆ فەرمانگەیەك لەفەرمانگەکانی بە سەربازکردنی زۆرە ملێ (تەجنیدی ئیجباری)و داوایان لێدەکات بۆئەوەی بیکەن بە سەرباز، بۆ زانین ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەو منالە هێشتا نەگەیشتۆتە تەمەنی ئەوەی کە بگیرێت بە سەربازو سەردانی تەجنید بکات بۆ رەوانەکردنی. دەمبینی کە خەلکی قسەیاندەکردو وتووێژیانبو لەبارەی ئەم مندالەوەو لەسەرسامییەکی زۆر توندو کاریگەردابوون لەو بارەیەوە، بەجۆرێك کە دەگمەن لەم ولاتەدا کەسێك خۆ بەخشبێت کە لەخۆڕسکەوە خۆی پێشکەشکات بۆ خزمەتیسەربازی. لەدواییدا بۆمدەرکەوتو زانیم کە ئەو منالە هەژارە ویستوویەتی هەلبێت لەو کارەی کە بە ناچاری چۆتە ژێر بارییەوە لەلایەن دایكو باوکییەوە کە سەپاندوویانە بە سەریدا بۆیە پەنای بردۆتەبەر خزمەتکردنی سەربازی بۆئەوەی رزگاری بێت لەکرێکاری بیناسازیی تاقەتپڕوکێن.

٢. بڕوانە: صاموئيل صميلز، سر النجاح، (ترجمه يعقوب صروف) ص١٦٠-١٦١.

٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو ص١٦١-١٦٢.

٤.هەمان سەرچاوەی پێشوو ص ١٦٣.

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو ص ١٩٦.

٦. بڕوانە: Baudouin, Suggestion and Autosuggestion, p.١١٦.

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو ص١٢٥.

٨. بڕوانە: سلامة موسى، أسرار النفس، ص ٧٧-٧٨.

٩. بابـــەتی كـــارلێكردنو بەریەككـــەوتن (شـــۆك) لـــەنێوان ئاكـــارە خێڵەكییـــەكانو مەدەنییەكاندا لەكۆمـەڵگای عێراقـی نوێـدا بابـەتێكی زۆر گرنگە. لێكۆڵینـەوە لەبارەیـەوە زۆر لـەو كیـشانەمان بـۆ روونـدەكاتـەوە كـە لـەم رۆژانـەدا دەبنـە بەربەسـت لـەژیانی كۆمەڵایەتیماندا.

١٠. لەبۆنەیەكی تردا دەگەڕێینەوە سەر لێكۆڵینەوە لەم بابەتە.

١١. بڕوانە كتێبی: هل انت حیَ – ص١٩.

١٢. سـوكرات دەڵـێ: ((ئەگـەر بێـت و خواوەنـدێك هـەردوو دەسـتی خـۆیم بۆدەرخـات بەجۆرێك :لەدەستی ڕاستیدا سەركەوتنی كامـڵ و لەدەسـتی چەپیـشیدا كۆشـشی بـەردەوام لەپێناوی سەركەوتندا بەدی بكـەم ، ئـەوا بێگومـان لەودوانـە ئـەومیان دەستنیـشان دەكـەم كەلەدەستی چەپیدایە)).

١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو- ص١٨.

١٤. دەگێڕنـەوە لەبارەی حەزرەتی (عـەلی)یـەوە كـە گوتویـەتی: ((ئەگـەر حاڵـەتێك یـان رووداوێك هات بەسەرتاو لەو كارەتـدا زۆر بـە پـارێزو لێوردبوونـەوەوە لێـی چویتە پێـشێ ئەوە زۆر خراپترە لەوەی وەك بكەویتە ناوجەرگەی رووداوەكەوە)).

١٥.بڕوانە: جمیل صلیبا، علم النفس –ص ٤٣٩.

١٦. پاستێر دەڵێت: ((هێـزی نـەنگاوتنو درەوشـانەوەی بـەدیهی بەدەست نایـەت تـەنها بـــەئارامگرتنو ئامادەباشـــی نـــەبێت لەپێناویـــدا بـــۆ ماوەیـــەكی درێـــژ تـــا پرشـــنگی تیشكاوەرییەكەی پێت دەگات)).

بەشی چوارەم

# هێزە نەستیەکان

لەسەدەی رابردوودا هیچ بیرۆکەیەك هێندەی بیرۆکەی (ناهەست) یان (عەقڵی شاراوە) بایەخی پێنەدراوەو بڵاونەبۆتەوە. بەجۆرێك تەنانەت ئەوانەشی کە سەرپێچی لەبوونی ئەم عەقڵە دەکەن ناتوانن سەرپێچی لەهەندێ لەو هێزە شاراوانە بکەن کە لەقوڵایی و ناخی دەروونـدا بـەجۆرێك لـەجۆرەکان کاردەکاتـە سـەر رێـڕەوی مـرۆڤو کاریگـەردەبێت لەهەڵس و کەوتیدا بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات.

پاش ئەوەی لەڕابردوودا مرۆڤ وا دادەنرا کە ئازادو دەستنیشانکەرەو لەبەر رۆشنایی عـەقڵی هەسـتیاریدا هـەڵس و کەوتـەکانی ئاڕاسـتە دەکـاتو بـە ئـیرادەی خـۆی بڕیـار لەچارەنووسـی خـۆی دەدات، بـەڵام ئـەمڕۆ دەگۆڕێـت بـۆ ئـامێرێکی بێـدەنگو پاڵنــەرە نەستییەکان زاڵدەبن بەسەریداو پاڵی پێوەدەنێن بەپاڵپێوەنان.

بەهەڵەدا ناچین گەر ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە بوونی عـەقڵی نـاوەوە بکـەین بـە دوو گرووپەوە:-

١. گرووپی یەکەم: ئەوانەن کە شوێنکەوتەی قوتابخانـەی دەرونـشیکارین، لـەوباوەڕەدان کـە عـەقڵی شـاراوە پـەناگای ئـەو ئـارەزووە سـەرکوتکراوانەیە کـە مـرۆڤ نـەیتوانیوە لێیـان تێربێت بە هەر هۆیەك لەهۆیەکان. بۆیە ئەم ئارەزووانە لەدیدو بۆچوونیاندا ماوەتـەوەو دەست بەسەر کراوە (زیندانیکراوە) لەعەقڵی شاراوەداو لـەژێر فـشارێکی زۆر توندایـە کـە ئەو فشارە بەرەنجامی چاودێریکردنی عەقڵی هەستیارە. بێتـو گـەر ئـەم عەقڵە هەسـتیارە بێهۆشبکرێت (سەرخۆش)بێت یان لاوازبێت یان غافڵ بێت یان بخەوێت ئـەوا لـەو کاتانـەدا

ئارەزووە سەركوتكراوو خەفەكراوەكان پشوويەك يان دەرفەتێكيان بۆ دەرەخسێت بۆ هاتنە دەرەوەيان لەو بەندكردنە، لەو كاتەشدا ئەو ئارەزووانە دەردەكەون لەسەر چەند وێنەيەكی جياوازو شێوازی جۆراو جۆر.... بەپێی بيرو بۆچوونی ئەم گروپە گرنگترين ئەو بوارانەی كە ئەم ئارەزووە سەركوتكراوانەی تيا دەردەكەوێت بواری خەونەكانە:-

يەكێك بێتاقەتت دەكاتو ئازارتدەداتو تۆش ناتوانيت تۆڵەی لێبكەيتەوە دەستوبرد لەئاگاييتدا بۆيە لەو حاڵەتەدا پەنادەبەيتەبەر خەوتن بۆ تۆڵەكردنەوەتو لەوێدا دەبينيت لەخەوتا هەموو سەرو گوێلاكی كابرا دێنيتە خوارەوەو تۆڵەی خۆتی لێدەكەيتەوە. هەروەها هەندێجار سەير نەكەی برسيتەو هيچ شتێك شك نابەيت بيخۆيتو برسێتييەكەت لەبير بەريتەوە بەلأم گەر هاتو خەوتيت ئەوا لەخەوتا خزمەتكارو سفرەچی دێن بە دەورو خولتاو هەموو خواردنێكی خۆشو بەتامت بۆ ئامادە دەكەن. يان وا دەبێت هەندێجار تووشی برسێتی سێكسی دەبيتو هيچ كەسێك نايەت بەلاتا هەتا ئەم برسێتييە ڤێزەونەت دامركێنێتەوە تەنها لەخەودانەبێت [1].

٢.بەلأم گروپی دووەم لەو بڕوايەدان كە عەقڵی شاراوە شوێنگەی تيا گيرسانەوەی سروشو دۆزينەوەو ئيلهامەكانە لەمرۆڤدا، هەروەها سەرچاوەی عەبقەريەتو پێغەمبەرايەتیو داهێنانو ئەو جۆرە شتانەيە. بۆيە هەندێكيان لەوانەی ئەم گروپە زياتر پێی لێ رادەكێشنو زيادەڕەوی دەكەنو دەڵێن عەقڵی شاراوە بريتييە لەگيان (رۆح)، يان بەڕای هەندێكی تريان بريتييە لە(بەشێك لەو خوايەی كەلە مرۆڤدا تواوەتەوە).

ئێمە ئەو سەرنجەمان لا دروستدەبێت كە لەبيرو بۆچوونی ئەم گروپەدا شتێك لەدووركەوتنەوە هەيە لەرۆحی زانستيانە. چونكە ئەمانە وای دادەنێن كە هێزە نەستييەكان بەلگەن لەسەر بوونی جيهانێكی تر جگە لەم جيهانەی كە ئێستا ئێمەی لەسەر دەژين. لەراستيدا چوونە ژوورەوە بۆ لێكۆڵينەوەی بابەتە غەيبييەكان لەم جۆرە توێژينەوانەدا لەنرخی زانستی خۆی كەمدەكاتەوە.

ئێمە مادام دەتوانين كە ئەم هێزانە شيكەينەوە بە شيكردنەوەيەكی پەسەندكراوو بڕوا پێكراو لەبەر رۆشنايی توێژينەوە سروشتیو فەلسەفييە نوێيەكاندا كەواتە هيچ پێويستمان نييە بەوەی پيسيانكەينو بيانگلێنين بە بيرو بۆچونە چاولێكەرييەكانەوە (تەقليدييەكانەوە)كە ئيتر لەزانستدا جێگەيان نابێتەوە.

 

زانستی نوێ، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، تا ئێستا لەتوانایدا نەبووە بچێتە بابەتە غەیبییەكانەوە یان بڕیاریان بەسەردا بدات وە یان بڕیار بدەن بەسەریدا. لەزانستدا ئەوە نیە كە بڵێت ئەو شتە غەیبیانە هەن یاخود نین. هەردوو قسەكە دەكرێ بەوە ئیعتیباربكەین كە دەمارگیرییەك دروستدەكات لەدیدی زانستدا. بێباوەڕو باوەڕدار وەك یەكن‌و نابێت توێژەرێكی لایەنگیربێت لەوەها بابەتێكی گوماناویدا [٢].

توندڕەوی ئەم گروپە پەرچەكردارێكی بەهێزی وروژاندووە لەناوەندە زانستییەكاندا. بەجۆرێكی وا كار گەیشتۆتە ئەو رادەیە ژمارەیەكی زۆر لەتوێژەرەوان (لێكۆڵەران) ئینكاری هێزە دەروونییە كاریگەرەكان دەكەن ئەوەش لەكاتێكدا بوو كە بینیان ئەو هێزانە تێكەڵكراون لەگەڵ كاروبارە غەیبی‌و رۆحانییەكان.

شاراوە نیە لای خوێنەر بڕی ئەو دوژمنایەتییە تەقلیدییەی كە روویداوە لەنێوان پێشەوایانی زانست‌و پیاوانی ئایین لەسەدەكانی رابردوودا، بەشێوەیەك لەئەنجامی ئەو كارەدا لەدەروونی زانایاندا گرێیەكی شاراوەی دروستكردو بانگهێشتی دەكردن بۆ قەلاَچۆكردنی هەر بیروڕایەك كەشتێكی تێدابێت لەكەلەپوری ئایینی كەم بێت یان زۆر.

هەروەك لەمەوپێش وتمان هێزە دەروونیە نائاساییەكان ئەمڕۆ بوونەتە راستییە زانستییە حاشا هەڵنەگرەكان‌و ئەزمونگەرییە تاقیگەییەكان ئەو راستییەیان سەلماندووەو پشتگیری دەكەن بە پشتگیری كردنێكی شیاو. بەلاَم ئەوەی جێگای ترسە بۆ هەندێ لەتوێژەرەوان ئەوەیە كە ئەم توێژینەوانە كۆتایی پێبێنن بە دەست لەملانكردنی ئەو توێژینەوانە بە بیرو بۆچوونە رۆحییە كۆنەكان، كە لەسەدەكانی رابردوودا خەباتێكی دوورودرێژكراوە لەپێناوی نەهێشتنی ئەو بیرو بۆچوونانە.

لەبەرامبەر ئەم توێژەرەوانەدا چەند توێژەرەوەیەكی تر دەركەوتن كە دەڵێن پێویستە لەگەڵ توێژینەوەی زانستیدا بڕۆین بەرەو هەر كوێیەكمانبەرێت، بە جۆرێك كە شایانی ئەوەبێت لەهیچ شتێك نەترسین مادام شوێنكەوتەی رێگای زانستین لەتوێژینەوەدا.

پێویستە ئێمەش لەگەڵ ڕاو بۆچوونی ئەم توێژەرەوانەدا گوێڕاگرین بۆئەوەی كە زانست دەیڵێ لەسەر هەر حاڵەتێك بێت، جا ئیتر لەو حاڵەتەدا بمانگێڕێتەوە بۆ بیرو بۆچوونە كۆنەكان یان رێگایەكی نوێمان لەبەردەمدا دەكاتەوە. لەبیرو بۆچوونی ئەو توێژەرەوانەدا زانست ئەو مەشخەڵەیە كە پێویستە ئەو رێگایەی پێ روونـاك بكەینەوە،

شایستەی کەسی زانستخواز نیە کە دەمارگیربێت لەپێناوی بیرۆکەیەکی دیاریکراودا یان دەمارگیربێت لەدژی‌و پاشان لێی بترسێت.

لەسەر ئەم بیرو رایە ژمارەیەکی گەورەی زانا بەناوبانگەکان کۆک‌و تەبان، لەو زانایانەش وەك: ئۆلیڤەر لۆدج‌و ولیەم کرۆکس‌و ولیەم جیمس‌و شارڵ ریشیەو هینری سدجوك‌و هانز دریش‌و هینری برجسۆن.... ئەم ژمارەیەش لەزۆربووندایە رۆژ لەدوای رۆژ.

توێژینەوەی زانستی لەبابەتی هێزە لەرادەبەدەرەکاندا دوو رێگا دەگرێتەبەر:-

١. رێگای یەکەم: ئەو رێگایەیە کە توێژەرەوان لەسەری دەڕۆن لەئینگلتەراو کۆمەڵێکی زۆر لەوڵاتانی تر شوێنکەوتەیانن. ئەم رێگایە لەوەدا کورتدەکەینەوە بەو گرنگیپێدانەی کە درا بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکان لەبارەی هەموو ئەو رووداوانەوە کە کارێکی لەرادەبەدەری تێدا دەرکەوتووە. بێتو گەر ئەم توێژەرەوانە بیانبیستایە کە تەنها کەسێك هەیە لەهەر شوێنێك لەپارچەزەوییەکی ئەم جیهانەداو خاوەنی بەهرەیەکی سەرسوڕهێنەرە لەپێشبینیکردنی یان خوێندنەوەی بیرۆکەکان یان لەم جۆرە شتانە... ئەوا هەڵدەسان بەناردنی تێبینی کەران بۆ لای ئەو کەسە لەو تێبینیکەرانەی کە مەرجەکانی پاکی‌و راستگۆیی‌و بێلایەنی‌و وردەکارییان تێدابوو. ئەو تێبینیکەرانە هەڵدەسن بە لێکۆڵینەوەی ئەو کارە نائاساییانەی کە ئەو کەسە خاوەن بەهرەیە پێی هەڵدەستێت‌و دەیخەنە ژێر چاودێرییەکی وردەوەو پاشان راپۆرتێك لەوبارەیەوە پێشکەش دەکەن لەو شتانەی کەبینیویانە لەو کەسە. بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵەیەك پێکهات لەبەریتانیا لەساڵی (١٨٨٢)داو ناودەبرا بە کۆمەڵەی توێژەرەوانی دەروونی (The Socicty For Psychical Research).

لەم کۆمەڵەیەدا ژمارەیەك لەزانایان‌و فەیلەسوفان بەشداریان تێداکردو هەڵدەسان بەدەرکردنی گۆڤارێك وەك زمانحاڵی ئەو کۆمەڵەیە، هەروەها یەکەم سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە کە هەڵبژێردرا بۆی پرۆفیسۆر (سدجوك) بوو کە مامۆستای فەلسەفە بوو لەزانکۆی (کمبردج).

مەبەست لەپێکهێنانی ئەم کۆمەڵەیە لەم وتارەی (سدجوك)دا کورتکراوەتەوە کە بە بۆنەی کردنەوەی ئەم کۆمەڵەیەوە خوێندویەتیەوەو تیایدا دەڵێ:-

 

((زۆرمان بیستووە لەبارەی ئەو كارە نائاساییانەی كە چەند كەسێك پێی هەڵدەسن، هەروەها بۆمان دەگێڕنەوە بە گەواهیدانە بێگومانەكانیان، بەڵام گاڵتەجارییەك دەئاڵێتە گەردنمان‌و ڕووبەڕوومان دەبێتەوە یان ڕاستتر بڵێین (ڕووی خۆمانی لێوەردەگێڕین)، بەڕاستی جێگەی شەرمەزارییە دەبینین كە جیهانی پێشكەوتوو ئەو جۆرە مشتومڕە بەخۆیەوە دەبینێت لەنێوان گێڕانەوەی ئەو كارە نائاساییانەو لەنێوان بەدرۆخستنەوەیاندا. بێتو گەر تەنها (دە) دانە لەو هێزە لەرادەبەدەرانەی كە خەڵك هەواڵەكانی دەگێڕێتەوە بەراستی بۆمان، ئەوا نرخە زانستییەكەی بەرادەیەك گرنگە كە پێوانە ناكرێت. یەكەمین ئامانجی ئەم كۆمەڵەیە بەدواداچوونی ئەو هەواڵانەبوو كە لەناو خەڵكیدا دەگوازرایەوە لەهەموو كات‌و شوێنێكداو دانانی لەژێر مەرجەكانی زانستدا كە بە هیچ شێوەیەك ڕێچكەی گومانی لێنەبێتەوە.

ئێمە دەمانەوێت سنورێك بۆ ئەم شەرمەزارییە دانێین كە ئێستا جیهانی پێشكەوتوخوازو شارستانی پێوەی دەناڵێنێت جا ئیتر لەمەدا بڕوامان پێدەهێنن یان نا.. ئەوە شتێكی ترە. ئێمە دەمانەوێت زانیاریی تەواو بەڵگە نەویستمان دەستكەوێت سەبارەت بەوەی كە ئەم چیرۆكانەی وا بەرگوێماندەكەون‌و دەماودەم بۆمان دەگێڕنەوە بزانین ڕاستن یان هەر درۆو هەڵبەستراون. لەبارەی هەر ڕووداوێكیشەوە كە گوێبیستی دەبین ئەگەر بزانین بواری ڕاستی‌و دروستی تێیدا لاوازە ئەوا پشتگوێی دەخەین‌و ئاوڕی لێنادەینەوە. ئێمە دەمانەوێت زانیاریمان دەستكەوێت‌و لەبارەی ئەو شتانەوە شت فێربین، چونكە نامانەوێت سەلماندن بكەین لەسەر ئەو شتانەی كە پێشتر زانیومانن. هەروەها ئامانجیشمان حەقیقەت‌و ڕاستییە بە چاوپۆشین لەوەش كە بەرەنجامەكان پۆزەتیف دەبن یان نەگەتیف)) [٢].

بەم شێوەیە ئەو كۆمەڵەیە لەسەر ئەو بەرنامەیە دەرۆشت كە یەكەمین سەرۆكی كۆمەڵەكە ئاشكرایكردو بڵاویكردەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەكی زۆری لەبەڵگەنامەو دۆكیۆمێنت‌و بڕوانامەی كۆكردەوەو لەتۆمارگای خۆیدا هەموویانی پاراست. لەراستیدا لەو بانگەوازو بڵاوكردنەوەیەدا وەڵامی زۆربەی ئەو درۆیانەیان نەداوەتەوە كە لەهەندێ ناوەندەوە پێشكەشیانكراوە، لەسەر لاپەڕەكانی گۆڤارەكەیان ئەو ڕێگای فڕوفێڵ‌و ساختەكارییانە بڵاودەكرایەوەكە هەندێ لەجادووگەران پەنایان بۆ بردبوو یەكێ

نسەرکەوتنەکانی ئەم کۆمەڵەیە ئەو دەنگدانەوە گەورەیەی بوو لەهەموو گۆشەیەکی جیهانداو دامەزراندنی چەند لقێك بوو لەولاتانی تری وەك: فەرەنساو ئەمەریکاو هۆڵەنداو دانیمارکو نەرویجو پۆڵەنداو....هتد.

ئێمەش هیوادارین لقێکی لەعێراقدا دابمەزرێت. ئەو ولاتەی کە زۆری لێدەبیستین لەبارەی هێزە کاریگەرەکانەوەو تا ئێستاش جێگای سەرسوڕمانو واقوڕمانی خەڵکییە. ئێمە دەمانەوێت سنورێك دابنێین بۆ ئەم ناکۆکییە نەزۆکە لەنێوان ئەوانەی وا بەڕاستی دەزانن و ئەوانەشی کە بەدرۆودەلەسەی دەزانن و پوچەڵی دەکەنەوە. کارێکی زۆر ئاسانە گەر بێتو لیژنەیەکی زانستی بێلایەن پێکبهێنرێت بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە سەبارەت بەڕاستیو دروستی ئەو هەواڵانەی وا خەڵك لێرە دەیگوازنەوەو دەماودەمی پێدەکەن لەبارەی کەراماتی ئەولیاو سۆفییەکانەوە یان شتە سەرسوڕهێنەرەکانی دەست خوێنەرەوەکان (دەستگرەوەکان) و جادووگەریو ئەو شتانەی کە لەم بابەتانەن. لەوانەیە شتێکی کەم لەحەقیقەت بدۆزینەوە لەنێوان ئەم هەموو کۆمەڵە پڕ لەدرۆو دەلەسەچیانە، کە بایەخێکی گەورەی هەیە لەبیرکردنەوەو بۆچوونە زانستیەکانماندا.

کۆمەڵەکانی توێژینەوە دەروونییەکان لەبەریتانیاو ولاتانی تر گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە لەمرۆڤدا فریشتە دەروونییە کاریگەرەکان هەیەو گرنگترینیان سیانن کە ئەمانەن:-

١. گواستنەوەی ئەفکارەکان –بیرو بۆچوونەکان- (Telepathy).

٢. بینینی شتەکان لەپشت پەردەوە (Clairvoyance).

٣. پێشبینییەکان (Fore Know Ledge).

جێگای سەرسوڕمانە دەبینین زۆربەی خەڵك دەتوانن ئەوەمان بۆ بگێڕنەوە لەبارەی ڕووداوێکەوە کە لەسەریان ڕوویداوەو ئاماژە بەبوونی بەهرەیەك دەکەن لەمرۆڤدا کە بیری بەرامبەرەکەی دەخوێنێتەوەو دەیزانێت یان پێشبینی هەندێ لەڕووداوەکانی داهاتوو دەکەن کە ڕوودەدەن یان شتە شاراوەکان دەبینن. بەڵام لەسەر ئەوە ڕاهاتووین کە ئەمە بگەڕێنینەوە بۆ ڕێکەوت. ئەگەر یەکێکمان خەونێك ببینێتو لەپاشاندا ئەو خەونە بەراستبگەڕێت لەدوای بەسەرچوونی ماوەیەك بەسەر خەونەکەدا، ئەوا دەیگەڕێنینەوە بۆ ڕێکەوت. لەڕاستیدا ئێمە لەپشت بەستنمان بەڕێکەوت توندوتیژیو زیادەڕەویمانکردووە. چونکە ڕێکەوت کوێر نییە هەروەك لەمەوپێش خەڵکی وا گومانی دەکرد. بەڵکو بەپێی

 

ئەو یاسا جێگیرانە دەڕوات بەڕێوە کە ڕێژەی سەدی دیاریکراو نیە لەدیاریکردنی کارەکەیدا. بۆیە لەم پێناوە زانایانی ئامارکاری‌و هەلژمێر توێژینەوەیانکردووە لەیاساکانی ڕێکەوت‌و بەشێکی نادیار نەماوەتەوە کە بتوانین ئەو شتانەی بدەینە پاڵ کە دەستەوەستانین لەبارەی شیکردنەوەیانەوە بەشیکردنەوەیەکی ماقوڵ‌و شیاو.

ئەگەر هاتوو یەکێکمان خەونی بە کەسێکی نزیکییەوە بینی‌و لەخەونەکەیدا ئەو کەسە مردبوو پاشان بۆماندەرکەوت کە ئەو کەسە نزیکەی ئەو براددەرە خەونی پێوەبینیوە هەر بەراستی مردووە پاش خەونەکە، ئەو کاتە ئێمە لەبەردەم ئەم حاڵەتەدا دۆشدادەمێنین‌و واقمانوڕدەمێنێت بەرامبەر ئەم کێشەیە:- نازانین ئایا ئەم خەونە پێشبینییەکی راسەقینەیە لەبارەی ڕووداوەکەوە پێش ڕوودانی یان ڕێکەوتێکی رووتە.

(ئۆلیڤەر لۆدج) زانای سروشتناسی بەناوبانگ لەم بارەیەوە دەڵێت: گریمانی مردنی مرۆڤ لەهەر ڕۆژێك لەرۆژەکانی ژیانیدا گریمانێکی زۆر لاوازەو ڕێژەکەی نزیکەی (١ لە ١٩٠٠٠) لەسەر ئەو پێودانگەی کە تەمەنی ناوەندی مرۆڤ دابنرێت بە پەنجا ساڵ یان بە واتایەکی تر (١٩٠٠٠) رۆژ. ئەگەر کەسێك خەونی بینی بە مەرگی ئاسیاوێکیەوە (١٩٠٠٠) جارو پاشان خەونەکەی ڕاستدەرچوو بۆ یەکجار، ئەوا بە گوێرەی یاسای ئەگەرەکان ئەو حاڵەتە دادەنرێت بە ڕێکەوتی ڕووت.

ئەو پشکنینانەی کە کۆمەڵەی توێژینەوە دەروونییەکان بەڕێوەیانبرد ئەوەیان سەلماند کە خەون ڕاستەو دێتەدی بەڕێژەی (١ لە ٤٧)، یان بە شێوەیەکی تر لەهەر (٤٧) خەونێکدا کە خەوتووەکە دەیبینێت تەنها یەکێکیان ڕاستەو دێتەدی لەواقیعدا، لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە هێزی خەون لەسەر پێشبینی زۆر بەرزترە لەهێزی ڕێکەوت. ئەم هێزە زیادەیەش لەکوێوە هات؟.

(ئۆلیڤەر لۆدج) لێکدانەوەو شیکردنەوە بۆ ئەم هێزە دەکات‌و بەوەی لێکدەداتەوە کە بەرەنجامی جۆرێك لەپەیوەندی‌و پێکگەیشتنە لەنێوان عەقڵی ئەو کەسەی کە لەحاڵەتی سەرەمەرگدایەو عەقڵی ئەو کەسە خەوتووەی کە خەونی مردنی پێوە دەبینێت[٤].

پرۆفیسۆر (ڕاین) چیرۆکی خەونێکی سەرسوڕهێنەرمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە خۆی زۆر دڵنیایە لەراستی ئەو خەونەو پشت ئەستوورە بەراستی ئەو کەسەی کە بۆیگێڕاوەتەوە، بەم شێوەیە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت:-

 

خانمێك لەخەونیدا بینی كە براكەی لەكاتێكدا دەچێتە ماڵەكەی خۆی و پاشان ئەسپەكەی دەباتە ژووری تەویلەكەو دەیبەستێتەوەو پاشان لێی دادەبڕێت و دێتە دەرەوەو دەڕواتە گەنجینەی ئالفەكەو دەمانچەكەی دەردەهێنێت و خۆی پێدەكوژێت. لەوكاتەدا خوشكەكەی لەخەونەكەیدا بەروونی بینیویەتی كە براكەی كەوتووەو گیانی لەدەستداوەو دەمانچەكەشی لەدەستكەوتۆتە خوارەوە. پاشان ئەو خانمە لەخەوەكەی خەبەریدەبێتەوەو رادەپەڕێت و بەشێوەیەك سوورە لەسەرئەوەی كە مێردەكەی عەرەبانەكەی بخاتە رێ و بیبات بۆ ماڵی براكەی هەرچەندە ماڵەكەشیان دوور بوو لەماڵەكەی خۆیانەوە. پاش ئەوەی گەیشتە ئەوێ ئەو خانمە بەجارێ واقیوڕماو سەرسامبوو كەبینی لاشەی براكەی لەهەمان شوێندا كەوتووەو مردووە كە لەخەونەكەدا بینی، هەروەها دەمانچەكەشی كەوتۆتە خوارێ لەتەنیشتیداو لەهەمان شوێندایە كە لەخەونەكەیدا بینیویەتی[٥].

ئەم چیرۆكە ئەگەر راستبێت، ناگونجێت ئەمە دابنرێت بەرێكەوت. بەشەكانی ئەو كارەساتەو درێژەپێدانی كە لەخەونەكەدا ئەو خانمە بینیی و پاش ئەوەش بەرووداوی راستەقینەو لەسەر زەوی واقیع بینینیەوە زۆرو ئاڵۆزن و هەروا ئاسانئیە هەموویان كۆبكرێنەوە لەخەون و واقیعداو لەیەك كاتدا. بەهەرحاڵ شیكردنەوەی ئەم حاڵەتە بەرێكەوت زۆر قورسترە لەشیكردنەوەی بە هێزە دەروونییەكان. ئێمە نابێت توندڕەوبین لەسەرپێچیكردنی رووداوەكان بەهێندی زانینی وەهم و خەیاڵەكان و بڕواپێكردنیان.

بەراستی خێرایی بەڕاستزانین و بڕوا پێهێنان و خێرایی بەرپەرچدانەوەو سەرپێچیكردنی هەردوكیان بەڵگەن لەسەر ساویلەكەیی و خۆشباوەڕیەكی ناشایستە.

ئەم چیرۆكەو ئەوانەی تریش لەم بابەتە بوونە هاندەرێك بۆ پرۆفیسۆر (راین) لەسەر دامەزراندنی لقێك لەو زانكۆیەی كە دەرسی تێدا دەوتەوە، یان زانكۆی (دیوك) لەویلایەتی كارۆلینای باكوری ئەمریكا بۆ توێژینەوە لەم دیاردە سەرسوڕهێنەرانەو دانانیان لەسەر لەپی ئەزمونكاری و تاقیكردنەوەی زانستی. لەم كارەشدا پرۆفیسۆر (ولیەم ماكدۆناڵ) یارمەتیدەری بوو كە زانایەكی دەرونزانی بەناوبانگبوو، هەروەها لەو كاتەشدا سەرۆكی لقی دەرونزانی بوو لەو زانكۆیەدا.

 

(راین) ئەو توێژینەوەیەی –کە لەمەوپێش باسمانکرد- ناونا بەدەرونزانی پەراوێزی (Parasychology- پاراسایکۆلۆجی، هەروەها تاقیگەی زانستی رێکوپێك و لەباری بۆ دامەزراندو هەموو کەسانی پارمەتیدەرو خاوەن سەلیقەی بۆ کۆکردەوە.

رێگای (راین) جیاوازە لەرێگای کۆمەڵەی توێژینەوە دەرونیەکان لەپێکهاتەیداو زۆر گرنگی نادات بە کەسانی خاوەن بەهرە نا ئاساییە کاریگەرەکان هەروەك چۆن ئەو کۆمەڵانە گرنگیان پێدەدەن. (راین) دەیەوێت کە کەسی ئاسایی و کۆی هەمو ئەو توانا لەرادەبەدەرانەی کە هەیەتی تاقیبکاتەوەو پشکنینیان بۆ ئەنجامبدات.

کۆمەڵەکانی توێژینەوەی دەرونی دەڵێن ئەو بەهرە لەرادەبەدەرانە هەروەك بیرە نەوتییەکان و کانە کانزایەکان وان، چونکە لەهەموو کەسێکدا نین تەنها لەچەند کەسێکی کەمدا نەبێت. لەبەرنەوە پێویستە لەسەرمان توێژینەوە لەسەر ئەو کەسانە ئەنجامبدەین هەروەك چۆن کارگە بەرهەمهێنەرەکان توێژینەوە دەکەن لەبارەی ئەو شوێنانەوە کە کانگای ماددە کانزاییەکانن. بەلام (راین) دەیەوێت لەسەر قوڵاییەکانی دەروونی مرۆڤایەتی دۆزینەوەکانی بەئەنجامبگەیەنێت. ئەو هەوڵدەدات پشکنین لەسەر هەموو مرۆڤێك بکات تا هەرچۆنێکبووە بتوانێت تێکراییەکی گشتی لێوە دەستبکەوێت. ئەگەر هاتوو رێکەوت لەپەیبرندا راست دەرچوو بەرێژەیەکی دیاریکراو بەگوێرەی یاسای گریمانەکان و پاشان ئەوەمان دەستگیربێت کە خەڵکی دەتوانن لەپەیبردنەکانیاندا راستگۆبن بەتێکراییەکی بەرزتر لەو رێژەیە ئەگەرچی بەشێکی بچوکیش بێت ئەوا ئەوە دەبێتە بەڵگەیەکی بنبەست لەسەر بوونی هێزە لەرادەبەدەرەکان (هێزە کاریگەرەکان) تیایاندا.

بۆ توێژینەوە لەم هێزو توانایە (راین) رێگایەکی تایبەتی گرتەبەر، ئەوەش بریتی بوو لەبەکارهێنانی جۆرێك لەو کاغەزانەی یاری قومار پێدەکرێت هەمیشە لەقومارخانەکانداو چەند وێنەو شێوەی جیاوازو تایبەتی لەنەخشاندنەکان لەسەر کێشراوە وەك: ئەستێرەو شەپۆلی بەرزو نزم(هێڵی زیگزاکی) چوارگۆشەو خاچ و بازنە. لەهەر تاقیکردنەوەیەکدا کە ئەنجامیدەدات (٢٥)وەرەقە بەکاردەهێنێت و بۆ هەموو پێنج وەرەقەیەکیش وێنەیەکی دیاریکراو لەو پێنج وێنەیە یان لەو پێنج شێوەیە بەکاردەهێنێت.

پاشان ئـەو کەسـە دێـت کـە دەیـەوێت تاقیبکرێتـەوەو دادەنیـشێنرێت لەسـەر مێـزی تاقیکردنـەوەکانو لەبەرامبەریـشیدا کەسـی توێـژەرەوە دادەنیـشێت (ئـەو کەسـەی کـە دەیەوێت هەڵسێت بەتاقیکردنەوەکە). ئەو کاتە کەسی توێژەر لەبەرامبەر هەر پەیبردنێك وەرەقەیەك پیشانی کەسی بەرامبەری دەداتو وەڵامەکانی بەوردی لای خۆی تۆماردەکات.

ئەو تاقیکردنـەوە زۆرو زەوەندانـەی کـە (راین)و کەسـانی تـریش ئەنجامیانـدا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ زیاتر تێکڕایی هێزی پەیبردنی زیاترە لەتێکڕایی رێکەوت جا ئـیتر کەم بێت یان زۆر.

لەنێو ئەو رووداوانەی کـە کاریگـەری هـەبوو لەسـەر گرنگیپێـدانێکی گـەورە لەناوەنـدە زانستییەکاندا ئەو رووداوە بوو کە رویدا لەلقی دەرونزانی زانکۆی (کولـورادۆ) بـە جۆرێـك کـە لەوێـدا زیـاتر لـە (٣٠٠) کـەس تاقیکردنـەوەیان بەسـەردا ئەنجامـدراو ژمـارەی ئـەو تاقیکردنەوانەش کە ئەنجامدران زیاتر بوون لە(٣٠٠٠٠٠) سێسەدهەزار تاقیکردنـەوە. بۆیـە ئەم رووداوە زانستییە دەنگو سەدایەکی گەورەی دایەوە ئەوەش لەبەرئەوەی هەتا ژمارەی تاقیکردنـەوەکان زیـاتربن ئـەوا ئەنجامـەکانیان وردتـرنو زیـاتر دەبنـە جێگـای یـەقینو دڵنیایی.

بەهەرحاڵ ئەو تێکڕاییەی کە پشکنەرەکان بەدەستیانهێنا لەم تاقیکردنـەوە گەورەیـەدا بەرزترە لەتێکڕایی رێکەوت بەرێژەیەکی زۆر کەم، بە شێوەیەك کە ئەو تێکڕاییە ئەمەندە بووە ((٥,٨٣ لە ٢٥)) یان بەواتایـەکی تـر ئـەم رێژەیـەی زیـاتربووە لـەتێکڕایی رێکـەوت کـە دادەنرێت بـە ((٠,٨٣)) (٦). ئـەم زیادەیـەش هەرچـەندە لاوازە بـەڵام دادەنرێـت بـە بەڵگـە، ئـەوەش ئاماژەیـە بۆئـەوەی کەشـتێك لەسـەرووی رێکەوتەوەیـە رۆڵێکـی گـەورە دەگێڕێـت لـەژیانی مرۆڤـدا. ئـەو تێکڕاییـە لاوازەی کـە پـشکێنەرەکان بەدەسـتیانهێناوە وێنەیـەکی وردمـان نـادەنێ سـەبارەت بـەو هێـزە لەرادەبەدەرانـەی وا لەهەرکەسێـکدا هەیـە. ئـەوە تێکڕایی کۆکراوەیانە، ئەمەش نابێتە رێگر لەبەردەم ئەوەدا کە هەنـدێکیان خـاوەن هێـزو توانایـەکی وابـن کـە زیاتربێـت لـەتێڕایی رێکـەوت بـە پلەیـەکی گـەورە. لەراسـتیدا یـەکێ لەتوێـژەرەکان لـەزانکۆی (هنتـەر) لەویلایـەتی نیۆیـۆرك هەسـتا بـە ئەنجامـدانی تاقیکردنەوەکانی لەسەر کچێك کە ئـەو کـچە ناسـرابوو بـەهێزی پەیبرنەکـەی. لەئەنجامـدا

 

توانی تێکڕایی (١٨ لە ٢٥) بەدەستبێنێت لەماوەی ئەو تاقیکردنەوە زۆرانەی کە گەیشتنە (٧٨) تاقیکردنەوە.

ئەم توێژەرە ئەو کچەی دانابوو لەخانوویەکی دوور لەو خانووەی خۆی کە تاقیکردنەوەکانی تیا ئەنجامدەدا بەجۆرێك کە بەهۆی تەلەفۆنەوە کچەکە وەڵامەکانی دەگەیاندەوە بە توێژەرەکە، لەئەنجامی راستدەرچوونی پەیبردنەکانی لەهەندێ تاقیکردنەوەدا بەجۆرێك بووە کە پلەیەکی سەرسوڕهێنەری زیاد لەپێویستی بڕیوە لەئەنجامی ئەوەدا کە هەموو وەڵامدانەوەکانی راستو دروستبوون [٧]. بۆیە ئەم حاڵەتە بەهیچ شێوەیەك نابێت راڤەبکرێت بە هۆکاری رێکەوت.

توێژینەوەکانی (راین)و ئەوانیتر لەئەمریکا بوونە هۆی وروژاندنو هەڵکردنی گێژەلۆکەی رەخنە لەبەرامبەریاندا. لەوکاتەدا لەکانونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٧) دا کۆنگرەی هەڵژمێریو ئامار کۆبوونەوەیەکی ئەنجامداو ئەندامەکانی کەوتنە وتووێژی لایەنە ئامارییەکەی ئەم توێژینەوانەو لەپاش تەواوبونی کۆبوونەوەکە کۆنگرە بڕیاریداو ئەم بەیانەی خوێندوە بۆ رۆژنامەکان:-

((توێژینەوەکانی (راین) دوو لایەنی هەیە: ئەزمونگەریو هەڵژمێری. بیرکاری زانەکان ناتوانن هیچ شتێك بڵێن دەربارەی لایەنی ئەزمونگەرییەکەی. بەڵام لەرووی هەڵژمێرییەوە توێژینەوە بیرکارییە نوێیەکان ئەوەیان دەرخستووە کە شیکردنەوەی هەڵژمێریو ئامار تێیدا راستە. ئەگەر بێتو بکرێو لەتوانادابێت ئەبێ هێرش بکرێتە سەر توێژینەوەکانی (راین)، پێویستە لەلایەنێکیترەوە جگە لایەنی بیرکاری هێرشی بکرێتە سەر)).

وا دەردەکەوێت ئەم بەیانە هیچی کەمنەکردبێتەوە لەفشاری ئەو رەخنە ناڕاستەکراوەی دژی ئەو توێژینەوانەن، بەجۆرێك تا ئێستاش رووبەڕووی بەرهەڵستییەکی وا دەبێتەوە کە گاڵتەی پێناکرێت لەلایەن مامۆستایانی زانکۆوە لەهەموو ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمریکادا. زۆربەی ئەو مامۆستایانە وای بۆ دەچوون ئەو شتانە پڕوپوچنو ئەفسانەو درۆو دەلەسەن. هەندێکیشیان هەوڵیاندەدا بە نهێنی تاقیکردنەوەکانیان ئەنجامبدەن لەترسی ئەوەی کە نەبادا کارەکەیان ئاشکرا بێت لای هاوڕێکانیان ئەوانەی وا بە بابەتێکی پڕوپوچیان دەدایە قەڵەم.

 

(راین) دەگێڕێتەوە لەبارەی یەکێك لەو توێژەرەوانە لەئەمریکا لەتاقیکردنەوەکانیدا گەیشتۆتە ئەنجامێکی باش و گرنگ بەلاّم دوورەپەرێزبووە لەبلاّوکردنەوەی، بەجۆرێك کە دەڵێ: ((خێزانەکەم بژێویان دەوێت)) یان رونتر ئەوەیە: دەترسێ لەوەی توێژینەوەکانی بلاّوبکاتەوە چونکە دەزانێ ئەگەر ئەوکارە بکات ئەوا لەو زانکۆیە دەریدەکەن وا کاری تێدادەکات و ئەوکاتەش خێزان و منالّەکانی دەمێننەوە بەبێ بژێوی ژیان و زۆر زەحمەتە بژین.



بەکورتی دەربارەی هەموو ئەوانەی لەمەوپێش وتمان دەڵێین: توێژەرەوان لەم بابەتەدا دوو رێگا دەگرنەبەر:-

١. بریتییە لەرێگای پشکنینی رووداوەکان و سەلماندن لەراستی گەواهیدان و کۆکردنەوەی بەلگە نامەکان لەو بارەیەوە، ئەم رێگایەش ئەوەیە کە کۆمەڵەکانی توێژینەوە دەروونییەکان لەسەری دەڕۆشتن لەهەموو ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا.

٢. بریتییە لەرێگای پرۆفیسۆر (راین) و شوێنکەوتوانی، ئەمەش ئەو رێگایەیە کەلەسەر بنچینەی تاقیکردنەوەو ئامار دەڕوات بەڕێوە، لەهەندێ لەزانکۆکاندا بلاّوبۆتەوە.

جێگای سەرنجە دەبینین ئەم دوو رێگایە گەیشتوونەتە بەرەنجامێکی چوون یەك لەوەدا کە مرۆڤ هێزو توانای هەستاوەریە کاریگەرو لەرادەبەدەرەکانی تێدایە، یان ئەوەی کە (راین) ناوی دەبات بەهەستکردن بەبێ هەستاوەرییەکان (Extra Sensory Perception) لەپێنج هەستەکەی مرۆڤ (بینین- بیستن- چێژتن- بەرکەوتن- بۆنکردن).

دەرکەوتووە کە بیروڕای زانستی نوێ دانیناوە بەحەقیقەتی ئەم هەستاوەرییەدا. لەم دواییەدا پرۆفیسۆر (پولس) مامۆستای دەروونزانی لەزانکۆی (کمبردج) لەم بارەیەوە بە بەلگەوە بەیانێکی دەرکرد کە تیایدا گوتوویەتی:- ((ئەم دیاردەیە پێویستە دابنرێت بە حەقیقەتێکی جێگیرو سەلمێنراو وەك هەر حەقیقەتێکی دیکە وا توێژینەوەی زانستی پێگەیشتووە. کەواتە پێویست بە حاڵەتی سەلماندن ناکات لەسەر هەبوونی لەپێناوی قەناعەت پێهێنانی ئەوانەی کە باوەڕیان پێی نیە، لەبریتی ئەمە روودەکەینە بەردەوامبوون لەسەر لێکۆڵینەوە بەپێی توانا. ئێمە بەو بۆچوون و خوێندنەوانەمان کە

هەمانە لەسەر سروشتی ئەو هێزانە خوێندنەوەیەکی پڕ بەپێستەو بە تەواوی مافی خۆی دەدەمێنێ کاتێك کە ئەو ئاستەنگیانە دەبینین رادەی بەڕاست زانینیان لاوازە بە ئاستێکی دوور))[٩].

لەوانەیە زیادەڕۆییم نەکردبێت ئەگەر بڵێم کێشەکە ئەمڕۆ یەکلاکراوەتەوەو بە بنبەستگەیشتووە، ئەوەش لەئەنجامی بەدرۆخستنەوەو بڕوا پێنەکردن یان بەڕاستزانینی ئەم دیاردە نائاسایە نیە، بەڵکو لەبەر کەمی زانیاریمانە لەبارەی سروشتی ئەو هێزانەوە. توێژەرەوانی ئەمڕۆ گومانیان نیە لەبوونی ئەو هێزانە، بەڵام ماهیەت و ئەو یاسایانە نازانن کە ئەو هێزانە لەسەری دەڕۆن تاوەکو زانیاری تەواو دەستەبەربکەن لەو پێناوەدا. هەرچەندە هەندێك لەو توێژەرانە هەوڵیانداوە تا گریمانەو بیردۆزە سەبارەت بەسروشتی پێکهاتەی ئەو هێزانە دابنێن، بەڵام جیاوازی و ناکۆکیان لەنێواندا دروستبووە...پاشان تا ئێستاش نەگەیشتوونەتە بڕوایەکی وا کە بگونجێ پشتی پێ ببەستین بەپشتبەستنێکی گەورەو یەکجارەکی.

توێژەرەوان نایانەوێت ئەم دیاردەیە شیکەنەوە بەشیکردنەوەیەکی غەیبی یان رۆحی (هەروەکو لەپێشەوە باسمانکرد)، تەنها ئەوەندەیە ئەم شیکردنەوانە نایانگەیەنێتە ئەنجامێکی بابەتیانە تا بتوانن رێنمایی و سوودی لێوەربگرن لەتوێژینەوەکانی داهاتوویاندا. ئەوان دەیانەوێت شیکردنەوە لەبارەی ئەو هێزانەوە شیکردنەوەیەکی گونجاو بێت لەگەڵ ئەو بنەما زانستییەدا کە لەتوێژینەوەکانی تریاندا لەسەری دەڕۆن، لەبەرئەوە لەدیدو بۆچوونی ئەواندا ئەوە تەنها رێگا چارەیەکە دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی درێژەپێدانی توێژینەوەکەیان.

بۆ نمونە ئەگەر وتیان ئەم دیاردە نائاساییە کاریگەرە سەرچاوەکەی (رۆح)ە ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئیتر لەتوێژینەوەکانیان رادەوەستن لەم ئاستەداو توانای بەزاندنیان نابێت. چونکە ئەوانەی پێشوو لەتوێژینەوەکانیاندا شکستیاندەخوارد کاتێك کە دیاردە تەمومژاوییەکانیان لێکدەدایەوە بە راڤەکردنێکی تەمومژاوی وەك خۆی و تیایدا رادەوەستان.

(راین)و زۆربەی زانایانی تریش خۆیان دوورەپەرێزگرت لەبارەی خۆخەریککردنیانەوە بە هەرشیکردنەوەیەك بۆ ئەو دیاردەیەی کە لێکۆڵینەوەیان تێدادەکرد. ئەوان

 

دەیانگوت:- ئەم قۆناغە سەرەتاییەی ئێستا ئێمەی تێداین بریتیە لەقۆناغی دۆزینەوەی رووداوەكانو كۆكردنەوەی بەڵگەو دۆكۆمێنتەكان. ئێمە هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەوەی لەپلەیەكی وەهادابین كە شیكردنەوەكانمانی پێ بپێوینو راڤەی بكەین یان بتوانین گریمانەو بیردۆزەكان لەبارەیانەوە دارێژین.

بەپێچەوانەی ئەمانەوە چەند توێژەرەوەیەكی تر هاتن كە دەیانگوت ئەو گریمانانەی كە لەكاتی توێژینەوەدا دادەنرێت دەكرێ یارمەتیدەربن بۆ بەرەوپێشچوونو كردنەوەی دەروازەیەكی نوێ تێیدا. كۆكردنەوەی راستییەكان بەتەنها بەس نیە (لەدیدی ئەماندا). مێژووی زانست ئەوەی سەلماندووە، هەروەك دەڵێن، دانانی گریمانەو كۆكردنەوەی راستییەكان هەر دووكیان پێویستن لەتوێژینەوەدا (یان بۆ توێژینەوە لەسەركردن)، چونكە لەراستیدا هەردووكیان شانبەشانی یەك دەڕۆن لەهەر پێشكەوتنێكی زانستیدا كە مرۆڤ بەدەستی هێنابێت.

بەهەرحاڵ، زۆرن ئەو گریمانەو بیردۆزانەی كە دانراون بۆ شیكردنەوەی ئەم دیاردە نائاساییە كاریگەرە. دەمانەوێت لێرەدا تەنها دوو گریمانە لەم بوارەدا وەرگرین، بەشێوەیەك لەوبڕوایەدام هەردووكیان لەفراوانترین گریمانەكانن كە بایەخدراوە بە بڵاوبوونەوەیانو زۆرترین شوێنكەوتوانیان هەیە. ئەودوو گریمانەیەش ئەم دووانەن:- گریمانەی (تشنەر)و گریمانەی (سینڵ).

(تشنەر) لەو بڕوایەدایە ئەوەی داوایدەكەین بە عەقڵی ناوەوە (نادیار) یان (نەست) توانای بەزاندنی دوورییەكانی شوێنی هەیە، چونكە ئەو شتە خۆی شوێنی نیە.

(تشنەر) دەڵێ: ((لایەنی هەستكردن لەزیهنماندا جیادەكرێتەوە بە تاكێتییەكەی، هەموو تاكێكیش جیهانێكی زیهنی هەستپێكراوی خۆی هەیەو ئەم جیهانەش داخراوە بەسەریداو هیچ تاكێكی تر ناتوانێت لێوەی بچێتە ژوورەوە تەنها لەكاتێكدا نەبێت كە خاوەنەكەی رێگە بەو كارەبدات لەرێگەی زمانەوە یان بەهۆی هەر شێوازێكی تری كۆمەڵایەتییەوە بێت. بەڵام ئەوەی لەژێر (هەست)دایە جیادەكرێتەوە بەوەی كە ((تاكڕەونیە)) دەشێ بڵێین ئەو زیهنەیە كە هەموو جیهان بەشداری تێدادەكات، یان ئەو زیهنەیە كە لەسەرووی تاكێتییەوەیە بەمەش زانینی شتەكانی تیا دەستەبەر دەبێت كە عەقڵی تاكێتی ناتوانێت دەستەبەری كات....)) [١٠].

(تشنەر) بۆی دەرکەوت کە عەقڵی تاکێتی، یان ئەوەی کە بەشێوەی ئاسایی پێی دەڵێن عەقڵی دیار یان هەست، دەبێتە رێگر لەکاتی بە ئاگابوونو هۆشیاری خۆیدا لەبەردەم سودوەرگرتنو کرانەوەی عەقڵی ناوەوەدا ئەو عەقڵەی کە سنورەکانی شوێن دەبەزێنێتو دوورییەکان دەبڕێت. لەبەرئەوە دەبینین ئەو کەسانەی خاوەنی بەهرەو توانا کاریگەرو لەڕادەبەدەرەکانن سودوەرناگرن لەو بەهرەو توانایانەی کە هەیانە تەنها لەو کاتانەدانەبێت کە دەچنە حاڵەتی بێئاگاییو غەیبووبەو دابڕان لەعەقڵی هەستیار. عەقڵی ناوەوە (نادیار) دەتوانێت بیرو بۆچوونەکانی تر بخوێنێتەوەو پەیبەرێت بە شتە نادیارو شاراوەکان لەکاتێکدا ئەگەر بواری بۆ بڕەخسێت ئەوەش بە خامۆشبوونو بێئاگایی عەقڵی هەستیار دەستەبەردەبێت ئیتر کەم بێت یان زۆر.

ئەمە کورتەی ئەو گریمانەیەبوو کە (تشنەر) هێنایە کایەوە بۆ شیکردنەوەی هەستاوەرییە کاریگەرو لەرادەبەدەرەکان لەنەستی مرۆڤدا، لەمەشدا ژمارەیەك لەتوێژەرەوان پشتگیرییان لێکرد بەشێوەیەك لەشێوەکان [11]. بەڵام (سینڵ) رێبازێکی تری هێنایە کایەوە بۆ شیکردنەوەکانی، ئەو بڕوای بەبوونی (هەستی شەشەم) هەبوو لەمرۆڤدا کە بەهۆیەوە دەتوانرێت هەست بەو شتانەی تر بکرێت کە لەتوانای پێنج هەستەکەی مرۆڤدا نیە هەستی پێبکەن، بەم بۆنەیەوەو لەسەر ئەم بابەتە کتێبەکەی خۆی ناونا بە((هەستی شەشەم)) کە تەرخانیکردبوو بۆ توێژینەوە لەم بوارەدا.

(سینڵ) دەیبینی هەموو ماددەیەك لەگەردوندا چەندین لەرینەوەو شەپۆلی ئەسیری تایبەتی لێوە دەردەچێت [12]، کە مرۆڤ هەستیان پێ ناکات بەهۆی پێنج هەستەوەرییەکانییەوە. بۆیە ئەو لەو بڕوایەدا بوو {ئەو بەشە هەڵتۆقیوە سنەوبەرییە بچوکەی وا لەخواری مۆخی سەری مرۆڤدایەو لەرووکاری درکە پەتکەوەیە ئەوە بریتیە لەهەستی شەشەم ئەو هەستەی کە وا دەرك دەکات بەو لەرینەوانەو کاریگەر دەبێت پێیان هەندێجار} [13].

لەراستیدا زانایان سەرسامبوون لەسروشتو پێکهاتەی ئەم دەرپۆقیووەو کارو فەرمانەکەشی. بۆیە تا ئێستاش نەیانتوانیووە دۆزینەوەیەکی کاریگەری فەسلەجی دیاریکراوی بۆ بەئەنجامبگەیەنن.

(سینلّ) هەولّیدا هەموو ئەو بەلّگانە بەدەستبێنێت لەسەر ئەوەی کە ئەم دەرپۆڤیـووە سنۆبەریە شوێنو پەناگای هەستێکی بەهێزو کارایـە لەهەنـدێ ئاژەڵـدا بـەلاّم لاوازتـرە لەمرۆڤدا، بە جۆرێك کە ئەمڕۆ هیچی لێنەماوەتـە تـەنها پاشماوەیـەکی شوێنەواریی کەم نەبێت کە خاوەنی کاریگەریی کارە نائاساییەکانە لەهەندێ کەسدا.

(سینلّ) وای دەبینی کە لەبەر ئەم هۆیـە دەگرێ مێشکی مـرۆڤ دابنـرێ بـە هاوشێوەی ئامێری لاسلکی. بۆیە لـەم بـارەوە دەلّێـت: ((تـەنها جیاوازییـەك هـەبێت لـەنێوان ئـەم دوو ئـامێرەدا (لاسـلکی و عـەقڵی) ئەوەیـە کـە لاسـلکی پێکهـاتووە لـەماددەی نائەنـدامی وەك پاتریو وایەرو شتەکانی تری لەم جۆرە، بەلاّم مێشکی مرۆڤ پێکهاتووە لەماددەی زیندووی وەك خانە هەستیارەکانو تۆڕەکانی دەمارو مولولە. بـەلاّم ئـیشو کـاری هـەردووکیان یـەك شتە، ئەوەش گەیاندنی شەپۆلە ئەسیرییە نەبینراوو نەبیستراوەکانە بۆ هەستەکانی مـرۆڤ لەشێوەی شەپۆلە جیاکراوەو تێگەیشتووەکان)) [١٤].

(سینلّ) لەو بڕوایەدابوو کـە هەستی شەشـەم لەگیانلەبـەرانو ئاژەڵانـدا زۆر بـەهێزترە وەك ئەوەی هەیە لەمرۆڤدا. بە بۆچوونی ئەو ئاژەڵەکان زیاتر پشت دەبەستن بەو هەستە بە پشتبەستنێکی گەورە، کە دادەنرێت بە گرنگترین هۆکارەکان لەژیانی ئاسایی ئاژەڵانـدا. ئەمەش هەموو کەسێك دەتوانێـت دەرکـی پـێ بکـات ئەگـەر بـەوردی چاودێریو سـەرنجی گیانلەبەرو ئاژەڵان بدا.

(سـینلّ) نموونــەی زۆر دێنێــەوە ســەبارەت بەکاریگــەری ئــەم هەســتی شەشــەمە لەگیانـەوەرو رووەکـدا. بۆیـە نـاوی دەبـات بـە ((هەسـتی رووتێکـردن)) یـان ((غـەریزەی کۆبوونەوەو مۆلّ خواردن)) لەمێرووەکانو باڵندەکانو خشۆکەکاندا بەلّگەیە لەسەر ئەمـە. بەلاّم لەدیدی ئەودا مرۆڤ گەشەی داوە بـە عـەقڵی بیرکردنـەوەیو پەنایدەباتەبـەرو پشتی پێدەبەسـتێت لەژیانیـدا بەمــەش کـارو فـەرمانی هەسـتی شەشـەمی هێناوەتــەوە یــەك (گرژیکردۆتەوە) و لاوازیکردووە.

هەروەك (سینلّ) دەلّێت: هەستی شەشەم تا ئێستاش بەشاراوەیی کاردەکات لەمرۆڤدا. بەلاّم مرۆڤ گوێی پێناداو ئـاوڕی لێناداتـەوە یـان خـۆی وا پـیشاندەدات کـە پێویـستی پێـی نییە. مرۆڤ سەرقاڵی ئیشو کارەکانی ئەم ژیانەو تێڕامانی بۆ دەکاتو پلانو نەخشەی بـۆ دادەڕێـژێت. لەبەرئـەوە تریـەو لێدانـەکانی هەسـتی شەشـەم ونـدەبێت لـەنێو ئـەو هـەموو

ژاوەژاوو تێكچڕژانە عەقڵییەدا هەروەك چۆن ((دەنگی ئەو سیسركە وندەبێت لەنێو شەپۆلی ئاوازی ئەو هەموو مۆسیقاو سەدای گۆرانیو قەرەباڵغییەدا كە لەئاهەنگێكی گەورەی نێو باخچەیەكی رازاوەدابێت))[١٥] .

بەڕای (سینڵ) ئەوانەی خاوەنی بەهرە كاریگەرو نائاساییەكانن ناتوانن پەیبردنەكانیان فەراهەمبێنن گەربێتو جوڵەی بیركردنەوەیان نەوەستێنن یان بەواتایەكی تر: دەبێ عەقڵی هەستیارییان پشتگوێبخەنو بێئاگابێت.

جاروبار ڕێدەكەوێت هەندێك كەس هەن لەناو خەڵكدا توانایان هەیە بەسەر وەستاندنی مێشكی خۆیاندا بەشێوەیەكی كاتی، یان مێشكی خۆیان خاڵی دەكەنەوەو دەیكەنە((لاپەڕەیەكی سپی)) ئەگەر بێتو ئەم دەربڕینە راستبێت، ئەوا دەتوانن بەو كارەیان هەست بە شتەكانو بیرو بۆچوونەكان بكەن بە هەستكردنێكی كاریگەرو لەرادەبەدەر.

(سینڵ) وای بۆدەچێت كە هەمیشە منداڵان پەیبردنیان زیاترە لەگەورەكان[١٦]. ئەو هۆكارەش بەوە لێكدەداتەوە كە هەڵتۆقیوی سنۆبەری لەمنداڵدا گەورەتر دەردەكەوێت وەك لەگەورەدا هەروەك زانستی توێكاریش ئەم بەڵگەیە دەسەلمێنێت. هەروەها (سینڵ) وای بۆدەچێت كە (سەرەتاییەكان)و (كۆیلەكان) یان وەحشییەكان توانایان زیاترو بەهێزترە لەپەیبردندا لەچاو شارستانیو پێشكەوتووەكاندا ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە زیهنیان (عەقڵیان) پاكو بێخەوشترە لەم بارەیەوە، هەروەها لەبەر كەمتر گرنگیدانو پشتبەستنیان بەبیركردنەوەی چڕوپڕ لەژیاندا، بۆ ئەم مەبەستەش (سینڵ) بەگێڕانەوەی چەند چیرۆكێك دڵنیایی تەواو دەبەخشێت بە راستێتی بۆ چوونەكانیو سەلماندنیان لەم بارەیەوە[١٧] .

بەهەرحاڵ ئەم گریمانەیەی (سینڵ) لایەنگرو هەواداری زۆرەو دەردەكەوێت كە ژمارەیەكی زۆر لەزانایانی سروشتناسی لەگەڵیابن لەو بوارەدا، ئەوەش بەهۆكاری ئەوەی كە روونكردنەوەكانی بە ئاسانیو سادەیی داوە بەدەستەوەو دەگونجێت لەگەڵ بیردۆزە فیزیاییە نوێكاندا بە هەموو مانایەكی گونجاندنو بیروڕای پشتگیریكردنی مسۆگەر كردووە لەلایەن زانا فیزیاییەكانەوە، هەروەك لەمەوپێش باسمانكرد، رووبەڕووی ئەوەی دەكاتەوە كە (بوونەوەرو گەردوون) هەمووی دادەنێت بە پێكهاتەیەك لەشەپۆلە كارەباییەكان.

(Electromagnetic Waves)، وە لەدیدی ئەم زانایەشدا خودی ماددەش خۆی شتێکی تر نییە تەنها چەند شەپۆلێکی فوتوکراو نەبێت.

هەروەها پرۆفیسۆر (دنکان) مامۆستای سروشتناسی لەزانکۆی نیۆیۆرکی پێشوو رایگەیاند کە شەپۆلەکان بە بەردەوامی دەردەپەڕن لەهەموو ماددەیەکەوە لەبووونداو بەرکەوتە دەبن بە ماددەکانی دەوروبەریان‌و کاریان تێدەکرێت (١٨).

توێژینەوە نوێیەکان ئەوەیان دەرخستووە جۆرێکی دیاریکراو لەشەپۆلە کارەباییەکان لەمێشکی هەموو مرۆڤێکەوە دەردەپەڕن، وە ئەم شەپۆلانەش جیاوازن لەیەکتری لەکاتی خەوتن‌و لەکاتی بێداریدا هەروەها لەکاتی بیرکردنەوەو لەکاتی بێئاگاییدا، دیسان لەکاتی نەخۆشی‌و لەکاتی ساغیدا. بۆ ئەو مەبەستەش ئامێری کارەبایی تایبەت داهێنراوە بۆ تۆمارکردنی ئەم شەپۆلە دەماغیانەی مرۆڤ. دکتۆر (دایفس)دەڵێت: هەموو کەسێك شەپۆلە دەماغییەکان لەسەرییەوە دەردەپەڕێت کە ئەم شەپۆلانەش تەنها تایبەتە بە خودی ئەو کەسە خۆیەوە، یان راستتر ئەوەیە کە ئەو شەپۆلە دەماغیانە هەروەك پەنجەمۆر وایە کە هیچ لێکچوونێك نیە لەنێوان پەنجەمۆری دوو کەسدا وەك یەك وابن (١٩).

لەسەر ئەم پێودانگە زۆر ئاسانە هەستین بەشیکردنەوەی دیاردەکانی گواستنەوەی فیکرەکان‌و ئەوانی تر لەکاروبارە نائاساییەکان بەوەی کە کردەی شەپۆلە نەبینراوەکانە. هەروەها ئاسانە وێنای ئەو بۆشاییەی دەوروپشتمان بکەین کە دەورەی داوین بەوەی پڕە لەجۆرە جیاوازەکانی ئەم شەپۆلانە، ئەو شەپۆلانەی وا کارمان لێدەکەن‌و کاریگەری جیاوازیان هەیە لەسەرمان بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین.

زۆرجار روویداوە کەسێك لەئێمە دڵخۆش‌و شادمانە یان غەمبارو پەشێوە بەبێ بوونی هۆکارێکی دیارو لەبەرچاو. هەروەها هەندێجار وا روودەدات کە یەکێك لەئێمە حەزدەکات لەنێشێکدا هاوڕابێت لەگەڵ کەسێکی ترداو ئەگەر کەسێکی تر هات ئەوا بەرپەرچی دەداتەوەو قبوڵی ناکات، لەکاتێکدا ئەگەر یەکێك پرسیارمان لێبکات لەبارەی هۆکاری ئەم پێکەوە نەگونجان‌و دژایەتیە ئەوا سەرسام دەبین‌و واقمانوڕدەمێنێت‌و نازانین چی وەڵامبدەینەوە.

 

بەڵام كاتێ بە خۆمان دەزانین لەوانەیە بوبێتینە قوربانی ئەو شەپۆلانەی كە لەهەموو كاتێكدا تیایاندا نقوم بوین و پاڵپێوەنەرو هاندەرمانن بۆ كارە پێچەوانەو دژ بە یەكەكان. بەجۆرێك كە لەگەڵیاندا پەیوەندیمان بەستووەو كەچی لەپاشاندا بانگەشەی ئەوە دەكەین كە ئێمە لەعاقڵان و هۆشمەندانین!!..

هەروەها كە چووینە شوێنێكەوە زۆر پێی قەڵس و وەڕس دەبین و پاشان دەچینە شوێنێكی ترەوە زۆر دڵخۆش و ئاسوودە دەبین پێی، لەوانەیە هۆكاری ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ جوانی شوێنەكەیان ناشیرینی و ناخۆشی شوێنەكە ئەمە لەرووی ماددیەوە، بەڵام لایەنی ماددی هەندێجار بەتەنها بەس نییە بۆ شیكردنەوەی ئەم جیاوازییە دەروونییەی كە هەستی پێدەكەین لەشوێنە جیاوازو جۆربەجۆرەكاندا.

بەشێوەیەكی زانستیانە ئەوە سەلمێنراوە، هەروەك لەمەولا دێینە سەری، گەردیلە هەندێ لەو شەپۆلانە كۆدەكاتەوە كە پێیان دەگات لەدەرەوەو پاشان لەدواییدا دەریاندەهاوێژێتەوە. كەواتە دەگونجێ گەردیلەكانی هەوا یان گەردیلەكانی دیوارەكان و كەلوپەلەكان لەژورێكدا شتێك لەو شەپۆلە هەڵقوڵاوانە كۆبكەنەوە لەخۆیاندا كە لەدەماغی خاوەنەكەیانەوە هەڵقوڵاون وا لەو ژوورەدایەو پاشان دەرپەڕیونەتەوە بە روماندا لەكاتی چوونە ژوورەوەماندا بۆ ئەو شوێنەو بەمەش كاریگەریان دەبێت لەسەرمان بە شێوەیەكی چاك یان خراپ بەبێ ئەوەی هەست بە خۆمان بكەین.



هاوڕێیەكم بۆی گێڕامەوەو وتی:- جارێكیان لەدووی شتێكی تایبەت و دیاریكراو دەگەڕام و لەهەموو شوێنێك پرسیارم دەكردو لێی دەگەڕام بەڵام بەدەستم نەكەوت. تا لەناكامدا بە ئۆتۆمبێلەكەم دەگەڕام و زۆر حەپەساوبووم و نەمدەزانی چی بكەم و چۆن ئەو شتە پەیداكەم تەنانەت مەترسی ئەوەشم نابوویە لاوە كە توشی روداوێك ببم بەهۆی ئۆتۆمبێلەكەمەوەو كاتێكم زانی روومكردۆتە شەقامێكی لاتەریكی لقە شەقام وهیچ مەبەستێكیشم نەبوو كەبچمە ئەو لقە شەقامەوە، تەنانەت خۆشم سەرم سوڕدەما لەوەی چۆن بەبێ هۆیەكی دیاریكراو هاتوومەتە ئێرەوە، بەڵام پاش چركەیەك لەگەڕانم لەم

شوێنەدا ئەو كەسەم دۆزییەوەو بەروومدا هەڵتەقا كە من لەدووی ئەو شتە دەگەڕێم‌و تەنها لای ئەویش دەستدەكەوێت...

لەوانەیە هاوشێوەی ئەم بەسەرهات‌و روداوە بەسەر هەر یەكێكماندا هاتبێت، ئێمەش حەزمانكردووە ئەمە شیكەینەوە بە هۆكاری رێكەوت‌و ئەم شیكردنەوەیەش پەسەندەو تەمومژی لەسەر نیە. بەڵام دەتوانین دووبارە بەوەش لێكی بدەینەوە كە بریتییە لەوەڵامدانەوەی شەپۆلە دەروونییەكان لەنێوان ئەو كەسەو ئەو شتەدا كە دەیەوێت‌و بۆی دەگەڕێت.

(سینڵ) دەڵێت: ((.....كەسێك نییە لەنێمە شتێكی نەخوێندبێتەوە لەسەری رووداوی سوارو ئەسپەكەی، ئەم سوارەو ئەسپەكەی رووەدەكەنە هەرێمێكی وێرانەو خاپوورو بەرفراوان بەبێ ویستی خۆی. پاشان سوارەكەو ئەسپەكەی هەردوكیان تینوێتی زۆریان بۆ دەهێنێت‌و پەرێشان دەبن‌و ئارامیان لێهەڵدەگیرێت لەتاو بێ ئاوی‌و تینوێتی بەڵام بچوكترین بەڵگەیان بەدینەكرد كە لەو شوێنەدا ئاو هەبێت. تا وایلێدێت سوارەكە جڵەوی ئەسپەكەی بەردەدات‌و ئەسپەكەش بۆ خۆی ملی رێگا دەگرێتەبەر چۆنی بوێت. پاشان لەوانەیە لەو هەرێمەدا سەرچاوەیەكی ئاو هەبووبێت بۆیە ئەسپەكە ئاراستەی خۆی رووەدەكاتە ئەو شوێنەی ئاوەكەی لێیە هەرچەند بەدووری دوانزە میل لێیانەوە دوورە، بەڵام ئەسپەكە دەڕوا بەرەو رووی تاپێی بگات. هۆكاری ئەمەش ئەو وێنە زیهنییەی ئاوەكەیە كە دەتوانێت پێی بگات ئەویش بەهۆی بوونی شەپۆلەكانە لەمێشكی ئەسپەكەدا كە درێژیەكەی بەقەدەر درێژی ئەو شەپۆلانەیە كە لەئاوەكەوە هەڵقوڵاون، لەبەرئەوە ئەسپەكە پەیوەستداربووە بەرەو ئاراستەی ئەو سەرچاوەیەی كە ئەو شەپۆلانەی لێوە هەڵقوڵاوە...)) [٢٠].

ئێمە نازانین تا چەند ئەم قسەیەی (سینڵ) نزیكە لەراستییەوە، ئەگەر بێتو راستبێت ئەوا گرنگییەكی گەورەی دەبێت لەژیانی كردەییماندا، من خەیاڵم بۆئەوە دەڕوات كە زۆربەی ئەو رێكەوتە خۆش‌و بەختەوەرییانەی كە تەنها چەند كەسێكی كەم لەنێو خەڵكیدا تێیدا دەگەن بە بەخت‌و ئاواتی خۆیان، من هۆكارەكەی دەگەڕێنمەوە بۆ بوونی ئەو هێزو توانایەی كە هەیانە لەسەر ئاراستەكردنی زیهنیان بەرەورووی ئەو شتانەی كە ویستوویانە.

دەگێڕنەوە (رۆمڵ) کە سەرکردەیەکی ئەڵمانی بوو ناوبانگی دەرکرد لەجەنگی جیهانی دووەمدا، بڕوای هەبوو بە هەستی شەشەمو بەکاری دەهێنا لەئیدارەی جەنگەکانیدا. لەکاتێکدا سەرکردە ئینگلیزەکان لێوربوونەوەو لێکۆڵینەوەیان دەکرد بۆ هەر هەنگاوێك لەهەنگاوەکانیان‌و حسابێکی وردەکارانەیاندەکرد بۆ هەموو شتێك، بەڵام (رۆمڵ) لێدانێکی وەها گورچکبڕی تێسرەواندن کە لەهیچ لیستێکی حسابدا حسابی بۆنەکرابێت‌و بەهیچ جۆرێکیش لەوردەکاری‌و لێکۆڵینەوەکانیاندا نەچووبن بەلایدا.

دیسان هاوشێوەی ئەمەش دەگێڕنەوە لەبارەی (هانیباڵ) سەرۆکی قرتاجییەکان، ئەو سەرکردەیەی کە رۆمانەکانی تێکوپێکشکاند لەخاکەکەی خۆیاندا، بەهۆی ئەو هێزو توانا لەڕادەبەدەرەی کە هەیبوو لەسەر خوێندنەوەی بۆچوونی بەرامبەرەکەی‌و زانینی پلان‌و نەخشەکانی، بەجۆرێك کە لەبێژنگی دەداو چاك‌و خراپی لەیەك جیادەکردەوەو پاشان بیزانیایە بەرامبەرەکەی نیەتی خراپە ئەوا تەفروتونای دەکردو لەناوی دەبرد [٢١].

(سینڵ) دەیگێڕێتەوە کە گوایە کچێکی ناسیوە خاوەنی هێزو توانایەکی گەورەبووە لەسەر وەرگرتنی شەپۆلە دەروونییەکان‌و ناردنەوەیان‌و کاریگەریان لەسەر بەرامبەر. بۆیە لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەو چیرۆکە بگێڕینەوەو بەوردی سەرنجی لێبدەین چونکە شایانی ئەوەیە گوێبیستیبین، (سینڵ) دەڵێ:-

((رۆژێکیان چووم بۆ ماڵی هاوڕێیەکم کە خۆشم باوەڕم نەدەکرد بچم، بۆ نیوەڕۆ گەیشتمە ماڵیان‌و کاتێکم زانی ژنی هاوڕێکەم نان‌و چێشتی بۆ ئامادەکردووم، بەم کارە زۆر سەرسامبووم چونکە ئەو رۆژەی کە من چووم بۆ ئەوێ کۆتایی پشووی هەفتەنەبوو کە ئەوە شتێکی عادەتییە لەناو برادەرانداو لەو رۆژەدا سەردانی یەکتر دەکەن‌و یەکتری بەسەر دەکەنەوە، پاشان لەباخچەکەدا لەگەڵ کچەکەیدا بەیەك گەیشتین‌و پێی وتم: ((کەواتە ئەم بەیانییە نامە بێتەلەکەی منت پێ گەیشتوو، چونکە بەڕاستی زۆرمان حەزدەکرد سەردانمان بکەیت‌و ئەم دوای نیوەڕۆیە بگەیتە لامان)). لەڕاستیدا هەروەك ئەو وتی من لەبەیانییەوە هەستام بەئەنجامدانی گەشتەکەم واتە هەر لەبەیانی ئەو رۆژەدا (پێویستە ئەوەش بڵێم ماوەی نێوان ئەوان و شوێنەکەی من بەشەمەندەفەر دەگاتە سێ میل‌و بە پیادەش دەگاتە نزیکەی شەش میل)، خۆشم نەمنەزانی چۆن کەوتوومەتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە سەردانی ماڵی برادەرو هاوڕێیان دەکەم‌و ئاوا ملی رێمگرتووەو

سواری گای لاربووم تا ئەم گەشتە ئەنجامبدەم، بڕوا بکەن بێتو گەر یەکێك پرسیاری لێمبکردایە سەبارەت بەهۆکاری ئەم سەردانە کتوپڕیەم، ئەوا خۆشم سەرسامدەبووم‌و واقموڕدەما چونکە هیچ وەڵامێکم پێ نەبوو تا وەڵامی ئەو هۆکارەی پێ بدەمەوە تەنها ئەوەندە نەبێت کەوتوومەتە حاڵەتەێکی وەهاوە کە هەستمکردووە بە ئارەزووی ئەوەی ئەم گەشتەمبکەم‌و سەردانیانبکەم، ئەم ڕووداوەش تەنها نموونەیەك بوو لەڕووداوە زۆرو زەوەندەکانی تر کە وەك ئەم ڕوویانداوە))[٢٢].

ئەم چیرۆکە بوارێکی گەورەمان بۆ دەڕەخسێنێت بۆ تێڕامان. ئارەزوو لەدەروونی کەسێکدا وا لەکەسێکی تردەکات بێت بەدەم داواکارییەوە با لەشوێنێکی دووریش بێت. ئەم حاڵەتەش بە زەحمەت پێمان قبوڵدەکرێت‌و بەڕاستی نازانین، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەمە واقیعەو دەگونجێت‌و ڕوودەدات.

مرۆڤ هەندێ جار دوودڵ و ڕاڕایەو سەرسامدەبێت‌و نازانێت ڕووبکاتە کوێ لەکاتێکدا وادەبێت کە کاریگەربووە بەو شەپۆلە دەرچووانە لەلایەن کەسێکەوە کە دەیەوێت ئەم بڕوات بۆ لای‌و بەدیداری یەك بگەن، بۆیە لەئاکامدا بەپێی ئەو ئاڕاستەکردنەی بۆیکراوە ئەم ملی ڕێدەگرێ‌و دەڕوات بۆ لای ئەو کەسە کە نێرەری شەپۆلە دەروونیەکانە.

لێرەدا کاریگەرییەك دەردەکەوێت کەخەڵکی ناویان لێناوە (بەخت). ئەو کەسەی کە لەدەروونی خۆیدا ئامێرێکی بەهێز شکدەبات بۆ ناردنی شەپۆلەکان‌و وەرگرتنەوەیان، کە بەهۆیەوە دەتوانێت کاربکاتە سەر خەڵکی‌و ئاڕاستەیان بکات بەو ئاڕاستەکردنەی کە خۆی ئارەزووی لێیە زیاتر لەو کەسەی کە نائومێدەو ئامێرەکەی بێ دەسەڵات‌و لاوازەو تواناکانی شلۆقەو دڵی پڕ بووە لەڕەشبینی‌و نائومێدی.

دەشێ وێناکردنی ئەوەمان کردبێت کە بێنەواو داماوەکان حەز دەکەن یەکێ بڕوات بەلایانەوەو سەردانیان بکەن بەڵام بەپێچەوانەوە خەڵك لێیان دوور دەکەونەوە، یان ئەگەر داوای شتێك بکەن ئەوا بەناڕەحەت دەستیاندەکەوێت‌و کەس ناچێت بەهانایانەوە. یان ئەگەر شتێکیان بوێت‌و خوازیاری ئەو شتەبن ئەوا خەیاڵ‌و ئەندێشەیان بەپێچەوانەوە دێت بە دەنگیانەوەو دژایەتیاندەکات لەو شتەدا ئەمەش لەبەر ئەو هۆکارەیە کە بۆ چەندجارئەوان بەختی خۆیان ڕاکێشاوە لەژیاندا هەر شکست‌و نوشستی بەشیانبووەو تیایدا بە ئاکام نەگەیشتوون جا بۆیە هەر لەبەرئەوەیە کە ئەو حاڵەتە لایان وێنەیەکی

چەسپاوو جێگیریی دروستکردووە لەزیهن و مێشکیاندا، لەبەرئەوەیە دەیانبینین چەندە هەوڵدەدەن و رەنج و تەقەلای خۆیان دەخەنەکار لەو پێناوەدا کەچی بەپێچەوانەوە هیچ شتێك نادوورنەوە لەبەرهەمی ئەو رەنج و ماندووبوونەیان تەنها هیلاکی و سەرئێشە نەبێت کە بۆیان دەبێتە خەڵات.

کەواتە لەم رووەوە خەڵکی دەکرێن بەدوو گروپەوە: گروپێکیان ژیان لەگەڵیاندایەو بە ئارەزووی دڵی ئەوانەو خەڵکی دەچن بەدەمیانەوەو لەهەموو شوێنێکدا هاریکاریاندەکەن و ئەوانیش بۆ خۆیان بەئاسوودەیی دەژین بە بێ ئەوەی ئاوڕ لەهیچ ئاستەنگێکی ژیان بدەنەوە، گروپەکەی تریش هەمیشە لەهەوڵ و تەقەلادان و خۆیان هیلاك دەکەن و بەدووی ژیاندا رادەکەن بەڵام بەپێچەوانەوە تابێت ژیانیان قورستر و نالەبارتر دەبێت و هێندەی ئەو کۆشش و خۆماندووکردنەیان پێنابرێت کە لەپێناوی ژیاندا بەفیڕۆیدەدەن.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە خەڵکی لەنهێنییەکانی (بەخت) تێبگەن و شاراوەکانی ئاشکرابێت لایان هەروەك چۆن لەرابردوودا شاراوەبوو لەنەوەکانی پێش ئێمە، بۆیە پێویستە ئێستا ئاوڕبدەینەوە لەناوەڕۆکی ئەو شتانەی دەروونی مرۆڤایەتی تێیدا سەرقاڵەو خەریکی پەیبردنە بە هەموو هونەرەکانی هێزو تواناکانی مرۆڤ کە چەندێك ئاگای لەو هێزانە نەبێت و وردکردنەوەیان بۆ نەکات هێندەش توندو تۆڵ و کارامە دەبێت لەنیش و کارەکانیدا، هەروەها چەندە پشتگوێ بخرێن و گرنگیان پێ نەدرێت هێندەش ئەو هێزانە دێن بەرەوپیرمان و کارئاسانیمان بۆدەکەن.



هەروەك وتمان ژمارەیەکی زۆر لەتوێژەران بە لای ئەوەدا دەچن کە راڤەو لێکدانەوەکانیان بۆ هەستکردن بەکارە نائاساییی و لەرادەبەدەرەکان بەوە لێکبدەنەوە کە بیدەنە پاڵ بوونی شەپۆلەکان یان لەرینەوە شاراوەکان کە مرۆڤ پێیان کاریگەردەبێت بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات. بەهەر حاڵ وەڵامی ئەم راڤەکردنانە درایەوە بەچەند رەخنەلێگرتن و بەرپەرچدانەوەیەك. لەوانەیە لەگرنگترینی ئەو رەخنانەش ئەم دوانەیان بێت کە باسیاندەکەین:-

١. توێــژەرەکان ئــەوەیان دۆزیوەتــەوە کــە هەســتکردنە نائاســاییەکان ناکەوێتــە ژێــر کاریگـەری (مـاوە) یـان دووریـیـەوە. چـونکە کەسـی بەهـرەمەنـد بـەو کـارە دەتوانێـت بـیرو بۆچـوونی بەرامبەرەکـەی و کەسـانی تـریش بخوێنێتـەوە کـاتێ نزیـك بێـت لێیـەوە یـان دوورکەوێتـەوە لێـی ئـەو بەهـەمان شێوە هـەر کاریگـەری خـۆی هەیـە لەسـەر ئـەو کەسـە. لەهەنـدێ لەتاقیکردنـەوەکانی (رایـن)ەوە ئـەوەمان بۆدەرکـەوت کـە مـرۆڤ دەتوانێـت پـەی بەشـتە نادیارەکـان بـەرێت لـەدوورەوە بەشـێوەیەکی ئاشـکرا تـر وەك لـەوەی لەنزیکـەوە پەیان پێدەبات و دەیانزانێت. ئەم راستیەش گریمانـەی شـەپۆلەکان رەتدەکاتـەوە، چونکە شەپۆلە کارەباییەکان تـا دوورکەونـەوە لاوازدەبـن (واتـە هەرچـەندە ماوەکـە درێـژتر بێـت ئەمان لاواز دەبن) و هێزەکەیان هاورێژە دەبێت بەرێژەیـەکی پێچەوانە لەگـەڵ چواریەکی ماوەکەدا هەروەك زانراوە.

٢. دووبـارە توێژینـەوە زانـستییەکان ئـەوەیان دەرخـست: (هێـز) هەسـتە نائاسـاییەکان جاروبار توانای پێشبینیکردنی هەندێ لـەرووداوەکانی ئاینـدەی هەیـە(٢٣). ئـەم راسـتیەش دووبارە گریمانـەی شـەپۆلەکان رەتدەکاتـەوە، بەشـێوەیەك مـرۆڤ نـەتوانێت وێنـای شـەپۆلە دەرچووەکان بکـات لـەبارەی رووداوێکـەوە کـە هێـشتا روویـنـەداوە یـان شـتێك کـە هێـشتا دروستنەبووەو نازانین سبەینێ چی لێ بەسەردێت.

بەراستی ئەم دوو پێشنیارو پەرچدانەوەیە زۆر بـەهێزن، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هـیچ کامیـــان بێبەشـــنین لـــەلاوازی بەشـــێوەیەك لەشـــێوەکان، لەوانەیـــە بـــشکۆنجێت بەرپەرچبدرێنەوە.

ئەمڕۆ ئێمە لەبارەی سروشتی هێزە نائاساییەکانەوە زۆر شت نازانین بەجۆرێك هێشتا لەسەرەتای رێگەداین و نازانین توێژینەوەکان چیمان بۆدەدۆزنەوە لەرۆژانی داهـاتوودا لـەو شتانەی کە شاراوەو نهێنین لەم پێنـاوەدا. زۆر رێـی تێدەچێت کـە شـەپۆلەکانی هەستە نائاســاییەکان زۆر کــورت بێــت بــەجۆرێك کورتتربێــت لــە(تیــشکی ســینی) و (تیــشکی گـــەردوونی). ئەمـــەو بـــۆزانین شـــەپۆلەکارەباییەکان جیـــاوازن و جیادەکرێنـــەوە بەتایبەتمەندێتی و رێگای لەسـەر رۆیـشتنی بەجۆرێکە کـە شـوێنکەوتەی ئەوەنیـە لەسـەر کورتی و درێژی بڕوات.

لەئێزگە جۆربەجۆرەکانـەوە ئـەوە فێربـووین کـە مومارەسـەی گـوێگرتن بـەدەسـتبێنین لەم ساڵانەی دواییدا کە چۆن شـەپۆلە کورتـەکان جاروبـار زۆر روونو ئاشکران لـەدووریو نـزیکیانـدا پێکـەوە هـەروەك یـەکن، ئەمـەش لەبەرئەوەیـە لەکاتێکـدا کـە ئـەو شـەپۆلانە دەردەپەڕن لەوێستگەی ئێزگەکەوە ئەوا بەرزدەبنەوە بۆ ئاسمانو لەوێدا بەرکەوتـە دەبـن بە چینە دیاریکراوەکانو پاشان دەگەڕێنەوە بۆ زەوی لەسەر دووریەکی بەرفراوانتر. بـەبێ ئەوەی ئەو دووریە کاریگەرییەکی گەورەی دروستکردبێت لەسـەریان. ئێمـە لەچاوەڕوانی ئەوەداین کە زانست لەداهاتوودا حەقیقەتی زیاترمان بۆ بدۆزێتەوە تا بەهۆیەوە ئـەم تـەم و مژانـەمان بـۆ روون ببێتـەوە کـە ئێـستا دەبنـە هـۆی رەتکردنـەوەی سروشـتی شـەپۆلە کارەباییەکان، چ ئەوانەی ناسراونو دەیانزانین چ ئەوانـەی نادیـارو نـەزانراوو نەناسـراون. دەبـێ ئـەوەش بـزانین لەوانەیـە ئـەوەکانی دوای خۆمـان پێکـەنینیانبێت بـەم شـێوە دۆشدامانەی ئێستا ئێمەی تێداین، ئەوەش بەهۆی پلەی بەرزی پێشکەوتنیانەوە لەزانستو زانیاریدا.

توێژینـەوەکانی (ئەنیـشتاین) بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو شـەپۆلانەی لەبۆشاییدا دێنو دەچنو تێدەپەڕن ئەو بۆشاییە نیە کە ئێمە وێنای دەکەین (واتە فەزایەکی ترە جیا لەم فەزایەی ئێمە پێی ئاشناین).

چونکە ئێمە لەسەرئەوە راهاتووین کە وێنـای بۆشـایی وا بکـەین کـە تـەنها سێ دووری هەیە. لەکاتێکدا (ئەنیـشتاین) دەڵێ: بۆشـایی(فـەزا) چـوار دووری هەیـە:- درێـژیو پـانیو بـەرزیو کـات. ئـەم وتەیـەش ئـەوەمان بـۆ دەردەخـات کـە (کـات) دابنـێین بـە دوورییـەك لەبۆشاییداو هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ دوورییەکانی تردا بە جیاوازی جەوهەری.

ئەمـەش مانـای ئەوەیـە کەپێـشبینیکردن لـەبارەی رووداوەکـانی ئاینـدە لەجەوهـەردا جیـاوازی نیـە لەگـەڵ هەسـتکردن بـەو شـتانەی لـەم کاتـەی ئێـستاماندا هـەن. دەروونـی مرۆڤایـەتی کـە بتوانێـت بەربەسـتەکانی دوورییـەکانی شـوێن (ماوەشـوێنییەکان) ببڕێـت هـەروەها دەشـتوانێت بەربەسـتەکانی دوورییـەکانی کـات (ماوەکاتییـەکان) ببڕێـت. ئـەو دەتوانێت شتێکی شاراوە ببینێت تێیدا لەیەکێك لەو سێ دوورییەی تر لەبۆشایدا.

ئاسـاییە ئێمـە نـاتوانین ئـەو حاڵەتـە پێـشبینی بکـەین، چـونکە ئێمـە لەسـەر ئـەوە راهـاتووین کـە وێنـای (کـات) بکـەین جیـا لـەوێنای (شـوێن). بـەڵام توێژینـەوە بیرکارییـە

 

نوێیەکان لەمەدا هیچ ئاستەنگێك نابینێت، کات لەدیدی ئەودا درێژبوونەوەیە لەبۆشایدا وەك درێژبوونـەوەی (درێـژیو پـانیو بـەرزی) تێیـدا. بـۆ نموونـە دووری نێـوان (رابـردوو داهاتوو) لەپێکهاتەی سروشتی دروستبوونیدا جیاوازی نیە لەهەر دوورییـەکی دیـاریکراوی تر لەسەر رووی ئەم زەمینـە. کەواتـە جیـاوازی نیـە لـەنێوان ئـەوەی کـە مـرۆڤ دەیبینێـت لەبارەی رووداوەکانی سبەینێ یان دەیبینێت لەبارەی رووداوەکانی ترەوە، ئەوانەی وا ئێستا روودەدەن لەناوچەیەك لەناوچەکانی ئەم وڵاتەدا. لەسەر ئەم پێودانگە یان بـەم ئیعتیبـارە کەواتە کات ناجوڵێتو ناڕوات، بەڵکو ئەو لەجێگەی خۆی وەستاوە. لەراسـتیدا ئێمـەین کـە دەڕۆین، بەشێوەیەك دەگوێزینەوە لەخاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر لەسەر درێژبوونـەوەی هێڵی کاتیی درێژکراوە.

جاروبـار وێنـای ئـەوەمانکردووە کـە لەشـەمەندەفەرێکی خێرادابـووینو دانیـشتووینو لەپەنجەرەکەوە سـەیری دەرەوەمـانکردووە وامـانزانیووە دەوروبـەر دەجوڵێتـەوەو دەڕواتو ئێمەش وەستاوین. لەو روانگەیەوە مرۆڤ وا هەستدەکاتو خەیاڵی بۆئەوە دەچێت کە کات دەجوڵێت بەڵام لەراستیدا کات جێگیرو وەستاوە. داهاتوو نایـەت بـەرەوپیرمان بـەڵکو ئێمـە بەرەوپیری دەچین، ئەو ئامادەیە ((لەوێدا)) لـەخاڵێك لەخاڵەکانی کاتـدا، مـرۆڤ دەتوانێـت بـەرەو لای بـڕواتو ئاگاداریبێـت ئەگـەر هـاتوو بەهرەمەنـدبێت بـە بـەهرەی هەسـتە نائاساییەکان.

خوێنـــەری بـــەڕێز وای دابنـــێ کـــە تـــۆ لەبەلەمێکـــدا ســـواربوویتو بـــەڕووبارێکی خواروخێچدا دەڕۆیتو لەوکاتەدا دەتوانیت سەیری رۆخی رووبارەکە بکەیتو خاڵ لەدوای خـاڵ سـەرنجی لێبگریـت لـەکاتی تێپـەڕینت بەشـێوەیەکی هێـواش کـە دەدەیـت بەلایـداو بـەرەورووویان دەڕۆیـت، ئـەمـەو لەکاتێکـدا کەسـێکی تـر بـە سـواری فڕۆکەیەکـەوە بەسـەر سەرتەوەیە لەئاسمانداو بەخێراییەکی زۆر تیژ تێدەپەڕێتو دەتوانێت هـەموو ئـەو شـتانە ببینێت کـە تـۆ ئێـستا دەیانبینیـتو ئەوانەشـی کـە لەکاتـزمێرەکانی دواتـردا دێـن هـەر دەیانبینێـت. بەشـێوەیەکی تـر: ئـەو توانـای هەیـە بەسـەر بینینـی نایـندەدا لەچـاو تـۆدا. هەروەها هەتا زیاتر بەرزبێتەوە توانای بینینی خاڵە دوورەکانی رابردوو داهاتووشی زیـاتر دەبێت...

پرۆفیسۆر (جینز) لەم بارەیەوە دەڵێ: ((کات لەسەرەتاوە تا کۆتاییە هەمیشەییەکەی درێژبۆتەوە لەبەردەمماندا لەیەك شێوەدا، بەڵام ئێمە پێی ناگەین تەنها لەیەك چرکەیدا نەبێت، هەروەك چۆن تایەی پاسکیلێك تەنها لەیەك خاڵدا بەستراوە بە زەوییەوە. کەواتە رووداوەکان هەروەك (ڤایل) دەڵێت روونادەن، ئەوەی کە روودەدات ئێمەین پیایدا تێدەپەڕین بە تێپەڕین.... لەم حاڵەتەشدا هەستو هۆشیاریمان وەك هۆشیاری مێشێکی لێدێت کە دەنیشێت بەسەر رووی وێنەیەکەوەو بەسەریا دەڕوات هەروەك پنتەکان بسڕێتەوە، بەڵام وێنەکە هەمووی هەیەو لەشوێنی خۆیدایە بەبێ جوڵە، بەڵام مێشەکە کاریگەری لەسەر دروستنابێت تەنها لەچرکەساتێکی کاتدا نەبێت کە پەیوەستە بە وێنەکەوە لەخاڵێکداو ئەوەش ئەو چرکە ساتەیە کە راستەوخۆ پەیوەندی پێوە دەکات لەسەر وێنەکە، بێتو گەر ئەو مێشە بیرکاتەوە ئەوا کاتێ دەزانێت کە تەنها بەشێکی کەمی لەپاش بەجێماوە لەوێنەکە بەڵام خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت بەوەی کە وادەزانێت هەموو بەشەکانی وێنەکەی دروستکردووە بەو جۆرەی کە لەبەردەمیادانراوە)) [٢٤].

لەپێناوی ئاسانکاریدا بۆ تێگەیشتنمان با وێنای جۆرێك لەو دروستکراوانە بکەین کە پێکهاتوون تەنها لەدوو دووری. واتە تەنها (درێژی)و (پانی)یان هەیەو بەرزییان نیە وەك (تارماییەکان). شتێکی ئاشکرایە ئەم دروستکراوانە دووری سێهەم تێناگەنو نازانن، بێتو گەر شتێکیان پیا تێپەڕێت خاوەنی سێ دووری بێت ئەو شتە ئەوا ئەو کاتە تەنها وەك روویەکی خاوەن دوو دووری دەیبیننو دووری سێهەم دەکەوێتە دەرەوەی ماوەی هەستو هۆشیاری ئەوەوە، بەشێوەیك کە ناتوانێت تێی بگاتو دەرکی پێ بکات تەنها لەکاتێکدا نەبێت کە پیایدا تێپەڕێت خاڵ لەدوای خاڵ.

لەراستیدا ئێمە هاوشێوەی ئەم دروستکراوانەین بەنسبەت دووری چوارەمەوە کە پێی دەڵێین (کات)، هەروەها ئێمە هیچ شتێك تێناگەین لەحەقیقەتەکانی کەونو تەنها چەند برگەیەکی دیاریکراونەبێت. ئەم حەقیقەتانەش پێکهاتوون لەچوار دووری لەکاتێکدا هەستو هۆشیاریمان بە سێ دووریانەوە پەیوەند دەبێت. بەڵام دووری چوارەم بەسەرماندا تێدەپەڕێت بە تێپەڕبوون هەروەك چۆن زەوی تێدەپەڕێت لەژێر تایەی پاسکیلێکدا لەدیدی پاسکیل سوارەکەوە.

★ ★ ★

دەردەکەوێت کە شەپۆلە کارەباییەکان بە هەموو جۆرە جیاوازەکانییەوە لەجوڵەو هاتوچۆدان لەبۆشاییدا ئەو بۆشاییەی کە خاوەنی چوار دوورییە. ئەو شەپۆلانە تەنها بەدووری شوێنەوە پەیوەستنین، دووبارە بە جوڵەکەیان پەیوەستن بەدووری کاتیشەوە. بەهەرحاڵ ئەم گریمانەیە لاوازە، بەڵام لێرەدا بەهۆی نزیکیانەوە لەپاڵپشتیکردنی چەند پاڵپشتییەك کە بۆیاندەکرێت خراپ نیە بەهەند وەربگیرێت، گرنگترین ئەو پاڵپشتییانەش ئەمانەن:-

١. لەتوێژینەوە فیزیکییە نوێیەکانەوە دەرکەوتووە کە تیشکی رووناکی جارێك دەردەکەوێت لەسەر شێوەی شەپۆلەکانو جارێکی تریش لەسەر شێوەی دەرپەڕینە یەك لەدوای یەکەکان وەك دەستڕێژی گوللە دەردەکەوێت[٣٥]. بەجۆرێك کە ئەمە بوویە جێگەی سەرسوڕمانی زانایان (ئەم ئیزدیواجیەتە سەرسوڕهێنەرەی کە لەتیشکی رووناکیدا هەیە). لەوانەیە لەکاتێکدا ئێمە ئەو تیشکی رووناکییە دەبینین لەسەر شێوەی دەستڕێژی گوللەیەو یەك لەدوای یەك، ئەوا ئێمە تەنها لوتکەی شەپۆلەکانمان بینیوەو بەس، بەڵام پاشماوەی شەپۆلە نادیارو شاراوەکان چوونەتە دووری چوارەمەوە. بەدەربڕێنێکی تر: هەر شەپۆلێك لەشەپۆلەکانی تیشك کە دەجوڵێتەوە لەبۆشاییدا خاوەنی چوار دوورییە، بەڵام ئێمە لەکاتی تاقیکردنەوەدا نایانبینین تەنها یەك خاڵیان نەبێت ئەویش لوتکەیە، بەڵام خاڵەکانی تر بەشاراوەیی تێدەپەڕن بە چرکەساتەکانی کاتدا – جا رابردووبن یان داهاتوو-

٢.هەروەها توێژەرەوەکان ئەوەیان دۆزیوەتەوە کە (ئەلکترۆن) لەناو گەردیلەدا بازدەداتو هەڵدەبەزێتەوە لەمەدارێکەوە بۆ مەدارێکی تر وە مولزەمنابن بە مەدارێکی جێگیرەوە. لەکاتێکدا تیشك بازدەدات لەمەدارێکەوە بۆ مەدارێکی تر بەو دووری یان (ماوە)یەدا تێناپەڕێت کە دەکەوێتە نێوان ئەو دوو مەدارەوە، بەوەی لەمەدارێکدا دەشارێتەوەو پاشان لەمەدارێکی تردا سەرهەڵدەداتو دەردەکەوێتەوە، ئەی ئەبێ بۆ کوێ بڕوات لەکاتی بازدانەکەیداو ئێمە نایبینین[٣٦]؟ من وای بۆ دەچم دووبارە دەڕوات بەدووری چوارەمدا. لەوانەیە لەکاتی بازدانەکەشدا گەشتێك بکات بە کاتێکی دووردا

لەرابردوو یان داهاتوو. ئێمە چوزانین‌و ئاگامان لێنیە لەوانەیە چوبێتە نێو هەزاران ساڵی رابـردووەوە یـان داهـاتووەوە لەیـەك چـرکەداو پاشـان گەڕابێتـەوە بـۆ ئـەم ساتەوەختەی ئێستا..... هەروەکو ئەوەی هیچیش روویـنەدابێت لێی.

٣. هەروەها توێژەرەکان ئەوەیان دەرخستووە کە (ئەلکترۆن) لەناو گەردیلەدا لـەڕێڕەوی شـەپۆلدانیدا رێڕەوێکـی سـەیر دەگرێتەبـەر نـە هۆکـاری هەیـەو نـە هـیچ یاسـایەکیش دەیگرێتەوەو پێی رێکدەخرێت. چونکە لەسەر مەدارێك ناڕوات کە بتـوانرێ دیاریبکرێـت، ئەمـەش وەك نموونـەی ئـەو حوشـترە ترسـاوە وایـە کـە لـە تاریکیـدا هـەموو شـتێك دەدا بەسەریەکداو بەشێوەیەکی کوێرانە رەفتاردەکات. لەسـەر ئـەم بۆچوونە (هـایزنبرگ) هـات بە خۆی‌و یاسایەکی نوێوە لەزانستی فیزیکدا کە ناودەبرێت بە یاسای (دیاری نەکردن) یان نادیاری [٣٧]. کە تیایدا هاتووەو دەڵێت: سروشت لەسەرەتای بنچینەییەوە مـل کەچـی یاسا نابێت واتە: (لەسەرەتای دروستبوونییەوە مل بـۆ یاسـا کـەچ ناکـات)، ئـەوەش ئەوەیـە کـە دەڕوات بـەڕێوە بەڕێوەڕۆیـشتنێکی ئارەزووکـاری هـەروەك ئـەوەی خـاوەنی ڕێڕۆیـشتنێکی خودیی یان ئیرادەیەکی ئازادبێت [٣٨]. لەبەرئەوە بە بۆچوونی (هایزنبرگ) هـیچ یاسـایەکی سروشـتی نـابینین لەبوونـەوەرو گەردوونـدا تـەنها یاسـاکانی (گریمانـە)و (هاوکێـشەکان) نەبێت. بەدەربڕینێکی تر: ئەم یاسایانەی کە دەیانبینین بریتییـە لەهاوکێشەی جوڵە کـە بەهۆیەوە بەلایین بەلایین لەو (ئەلکترۆنات)انەی کە لەگەردووندان دەکەونـە جوڵـە، بـەڵام (ئـەلکترۆن)ی تـاك دەجوڵێتـەوە بـە جوڵانەوەیـەکی کوێرانـەو هـیچ رێکخـستن‌و یاسـاو رێسایەکی تێدا نیە.

ئەگەر ئاوڕێك بدەینەوە لەم بابەتە دەبینین کە ژمارەیـەك لـەزاناکان هـەن رافـەی ئـەم جوڵـە کوێرانەیـە لـەڕێڕەوی (ئـەلکترۆن)دا دەگەڕێننـەوە بـۆ بـەرەنجامی کەمتـەرخـەمیمان لەچاودێریکردنی جوڵەکەی بەچاودێریکردنێکی راست‌و دروست. چونکە ئێمە لەدیدی ئەو زانایانەوە تەنها چاودێری سێبەری (ئەلکترۆن)مانکردووەو نەمانتوانیووە چاودێری خـودی (ئەلکترۆن) بکەین، کە ئـەو خـۆی دەجوڵێتـەوە لەبۆشاییداو خـاوەنی چـوار دووریيـە، یـان روونـتر بڵێین جوڵانەوەکەی دووری کات دەبڕێت‌و شمولی دەکات.

بەڵام ئێمە جوڵەکەی نابینین تەنها لەماوەی سێ دوورییەکەمانەوە نەبێت، بەمەش دەتوانین تەنها لەگۆشە نیگای خەیاڵەوە یان لەسێبەرەکەیەوە هەندێ لەشتەکان ببینین نەك بەو شێوەیەی کە توانیبێتمان خودی ئەو شتەمان بەتەواوی بینیبێت.

برۆفیسۆر (جینز) لەم بارەیەوە دەڵێت:-

((.... ئەوەی کە سەرنجمان بۆ لای خۆی رادەکێشێت لەبارەی مل کەچنەکردنی سروشتەوە بۆ دیاریکردن ئەوەیە کە دەگونجێت لەهەوڵدانی ئێمەدا ئەمە خرابێتە گەڕ کە لەچوارچێوەگرتنی بۆشاییە کەم دووریەکانەوە ئەو شتانە دەبینین کە رووداوەکانیان خاوەنی دوورییە زۆرەکانن. بۆ نموونە وێناکردنی جۆرێك لەکرمە کوێرەکان ناتوانن دەرکپێکردنە هەستاوەرییەکانیان رووی زەوی بە خاوەنی زیاتر لەدوو دووری هەست پێبکەن، ئەوان هەمیشە ئەم زەویە وادەبینن کە تەڕکرابێت بە ناو لەنێوا ن ماوەیەك و ماوەیەکی تردا. ئێمەش لەوانەین کە دەتوانین دەرك بە سێ دوورییەکان بکەین و ئەم تەڕبوونەش بەهۆی باران بارینەوە لێکبدەینەوە کە بارانیش لەهەورەکانەوە دەبارێت و هەندێجار دەتوانین حەواڵی ئەوە بەدەستبێنین لەبارەی هەندێ لەبەشەکانی زەویەوە کە بەو بارانە تەڕکراون و هەندێ لەبەشەکانی تری زەوی بە وشکی ماونەتەوە. بەڵام ئەو کرمە کوێرانەی وا هەستناکەن بەدووری سێیەم ئەوا بێگومان ناتوانن پشکنین بکەن لەسەر ئەو هۆکارانەی وا هەندێ لەبەشەکانی زەوی تەڕدەکەن و هەندێکی تری ئەو بەشانەش کە بە وشکی دەمێنێتەوە. زانایانی بواری کرمزانی هەموویان دەتوانن لەوبارەیەوە شتێك بخەملێنن بەهۆی هاوکاری خشتەی گریمانەکانەوە کە خۆیان بۆیان داناوە...)).

دووبارە (جینز) دەڵێ:-

((....هەروەك چۆن ئەو سێبەرەی دەکەوێتە سەر دیوار پێکهاتووە لەتارماییەکی خاوەن دوو دووری بۆ حەقیقەتی سێ دووری..... لەسەر ئەم پێودانگە ئەو رووداوانەی کە لەشوێن و کاتدا روودەدەن زیاتر رێزبەندییەکی جوڵاوو بزۆکە لەهاوشێوەکانی سێبەری سیحری کە دێن و دەچن)) [٢٩].

لەمەوە دەردەکەوێت ئەو بێ سەروبەرەیی و پشێوییەی لەرێڕەوی (ئەلکترۆن)دایە، بریتییە لەو پشێوی و هاتوچوون و سەرجەنجاڵیەی کە لەعەقڵماندایە. لەوانەیە

هۆكارەكانی بڕیاردان لەڕێڕەوی (ئەلكترۆن)دا لەدووری چوارەمدا هەبێت بەشێوەیەك كە ئێمە ناتوانین بیانبینین. ئەمەش ئەوەمان بۆ دێنێتە دی كە بڕۆین بەرەوپیری ئەو گوتەیەی كە دەڵێ: ئەو هۆكارانەی وا (كەون) دەجولێنن هەمووی شاراوەتەوە لەكاتی رابردوو یان داهاتوودا، كەواتە (ئەلكترۆن) دەجولێتەوە بەهۆی پاڵنەرێكەوە یان بەهۆی هاندەرێكەوە كە دەیجولێنێتەوە لەكاتێكی تردا جگە لەو كاتەی كە ئێمەی تێدادەژین.

ئەم گریمانەیەش لاوازە هەروەك وتمان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ئاستەنگییەك بەدی ناكەین لەقبولكردنیدا لەسەر ئەو بۆچوونەی كە (ئەنیشتاین) دەیڵێت لەبارەی تێگەیشتنێكی تازە ترەوە بۆ كاتو شوێن. ئەو تێگەیشتنە (چەمكە) تازەیەش كە ئەو دەیڵێت لەراستیدا چەمكێكی مەترسیدارو تۆقێنەرە.

هەروەك چۆن چەمكێكە كە ناشارێتەوە لەگرنگترینی ئەو پاڵپشتیانەی وا دەكرێت لەسەرهەڵدانو بەگژداچوونەوەی بەردەوام لەسروشتی دروستبوونی فیزیكی نوێدا [٣٠].

لەسەر ئەم بنەمایە پێشبینیكردن لەرووداوەكانی داهاتوو كارێكی مەحاڵ نیە. ئەوەشی كە بەمەحاڵی دادەنێت لەهەندێ لەرووەكانەوە لەهاوشێوەی كرمە كوێرەكان دەچێت كە سەرپێچی دەكەن لەبوونی دووری چوارەمو توانایان ناشكێت بەسەر وێناكردنیدا.

ئەو شەپۆلە شاراوانەی كە یارمەتیدەرمانن لەسەر هەستكردنە نا ئاساییەكان كارێكی قورس نیە پێیان بگەین لەداهاتوداو ئەو شتانە بدۆزینەوە كە تێیاندا روودەدات. چونكە ئەو دەجولێتەوە لەبوونەوەرو گەردووندا و هیچ رابردوو داهاتوویەكی نیە. هەموو ئەو شتانەشی كە روویانداوە یان روودەدات ئەوە خۆی هەیە ((لەوێدا)) لەلایەنێك لەلایەنەكانی ئەم بوونەوەرە سەرسوڕهێنەرەدا.



لێرەدا رووبەڕووی پرسیارێك دەبینەوە كە دەڵێت: ئەو پەیوەندییە چییە لەنێوان ئەم شەپۆلە شاراوانەو بابەتی عەقڵی ناوەوە كە ئێمەی تێداین؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویست بەوە دەكات كە بە بیری خوێنەری بێنینەوە ئەوەی كە لەمەوپێش وتمان لەبارەی ماهیەتو گرنگی عەقڵی ناوەوە هەروەك چۆن تێیگەیشتووین. ئێمە عەقڵی ناوەوە وا دانانێین كە بریتیبێت لەئامێرێكی دەروونی

دیاریکراو کە تایبەتمەندیو ئەرکی تایبەتی خۆی پێسپێردرابێت. لەراستیدا مانای رەهای ((عەقڵ)) کە دەربڕاوە لەسەری ئەوە لەڕووی ئاسانکاریو گونجاوییەوەیە. چونکە ئەوە بەپێی ئەو تێگەیشتنەمان کە گرتوومانەتە بەرو لەسەری دەڕۆین لەم کتێبەدا، ئەو عەقڵە نیەو هیچ شتێکیش لەهاوشێوەی ئەو عەقڵە نیە کە مەبەستمانە لەقسەو گفتوگۆی عادەتیماندا. یان راشکاوانەتر بیڵێین: زاراوەیەکی گشتییەو مەبەستمان لێی هەموو چالاکییە دەروونییەکانە کە کاردەکەنە سەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ بەبێ ئەوەی کە مرۆڤ هەستیان پێبکات [٣١].

ئەمەش بەو مانایە دێت کە ئێمە مەبەستمان لەهەموو ئەو ئارەزووە سەرکوتکراوانەو هەستە نائاساییەکانە پێکەوە. هەردوو جۆرەکەی ئەم هاندەرانە لەقوڵاییەکانی دەروونەوە هەڵدەقوڵێنو دەردەپەڕن بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێبکات.

بەم پێودانگە ئێمە ئەم زاراوەیە بەکاردەهێنین تا شمولی مانای ئەو تێگەیشتنە بکات کە هەردووك لە (قوتابخانەی دەروونشیکاری)و (ئەو مانایەی کە ((تشنەر)) دەری بڕیوە) پێکەوە مەبەستیانە لێی.

لەمەوە بۆمان دەدەرکەوێت کە عەقڵی ناوەوە جیاکردنەوەیەکی زیهنیە تێیدا دوو جۆر هاندەر (پاڵنەر) کۆبۆتەوە:- ئەوەش مۆڵگەی گرێ دەروونییەکانو ئارەزووە سەرکوتکراوەکانە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە سەرچاوەی دەرپەڕاندنی هەستە نائاساییەکانە. کە بەمەش دەبێتە سەرچاوەی خێرو شەڕ پێکەوە.

بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە کە دەبینین کاریگەرییە ئاینییەکان بە تەواوی دەڕۆن بەرەوپیری ئەم جۆرە بیرورایە. (نەراقی) کە لەساڵی ١٢٠٩ای کۆچیدا مردووە دەڵێ:-

((دەزانم کە (بەخت) لەهاوشێوەی (دڵ) خۆی پیشاندەدات لەبیربۆچوونەکاندا، گەر هاتوو خراپ بوو یان بانگهێشتی کرد بۆ شەڕو خراپە ئەوا ناودەبرێت بە (وەسوەسە)، گەر هاتوو سەرکەوتوو براوەش بوو بانگهێشتی چاکەی کرد ئەوا ناودەبرێت بە (بەهرە). بۆ روونکردنەوەی ئەمەش دەڵێین وەك (دڵ)وایە بەنسبەت داخوازیانەی کە هەیەتی لە(بەختەکان)، یان وەك نیشانەیەك کە دەنرێتەوەو لەهەموو لایەکەوە دەدرێتە بەر تیر یان وەك حەوزێکە چەند جۆگەلەیەك ئاوی جیاواز لەیەکی برژێتە سەر، یان وەك گومەزێك چەند دەروازەیەکیهەبێتو چەند کەسایەتییەکی جیاواز لێیانەوە بچنە ژوورێ،

یـان وەك ئاوێنەیـەکی جێگیرکـراو کـە چـەند وێنەیـەکی جیـاواز لەیـەك تێیـدا خۆیـان دەبیننـەوە، هـەروەك چـۆن ئـەم کاروبارانـە بەرپەرچـدانەوە نـانوێنن لـەبارەی ئـەو هەڵـە هەڵکەوتوانـەوە، ئابـەو جـۆرەش (دڵ) بەرپەرچـدانەوەو رەتکردنـەوە نانوێنێـت لـەبارەی بەروبوومی بەختەکانەوە....

پاشان لەوانەیە بەخت حاڵەتێکی رووداوبێت کە هەردەبێ هۆکارێکی هـەبێت، لەوانەیـە هۆکارەکەشی شەیتان بێت کە ئەویش وەسوەسەیە، لەوانەشە فریشتەیەك بێت کە ئـەویش ئیلهامو بەهرەیـە، لەوکاتەدا کە دڵ ئامادە بێت بۆ وەرگرتن‌و قبوڵکردنی (وەسوەسە) پێـی دەڵێن ئەوە خەڵەتێنراوو بەجێماوە، لـەو کاتەشـدا کـە ئامادەیـە بـۆ قبـوڵکردنی (ئیلـهامو بەهرە) پێـی دەڵـێن پـڕ لـەمیهرو سـەرکەوتووە، بـۆ ئەمـەش پێغەمبـەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت) ئاماژەی پێکردووە لەفەرمووەدەیەکیداو فەرمویەتی:- (دوو شت پێکـەوە لەدڵدا کۆدەبنەوە، یەکێکیان لەلایەن فریشتەوەیە: هێنـانی خێـرو چاکەو پەسـەندکردنی حـەق‌و راسـتییە، ئەویتریـشیان لەلایـەن شـەیتانەوەیە: هێنـانی شـەڕو خراپـەکاری‌و بەدرۆخستنەوەی راستییە).

هەروەها لەفەرموودەیەکی تریدا دەفەرموێت:- (دڵـی ئیمانـدار لـەنێوان دوو پەنجەدایـە لەپەنجەکانی بەخشندەیی) )) [٣٢].

ئەم جیاوازییەی نێوان (وەسوەسە)و (بـەهرە) کـە شـێخی ((نـەڕاقی)) بـۆی گێڕاینـەوە، بەراستی جێگای سەرسوڕمانە. هەروەها لەوانەشە کەڵك‌و سودێکی زانستیشی تێدابێت.

هـەروەك پێـشتر باسمـانکرد هانـدەرە نەسـتییەکان چاکترین رێنماییکـەرن بـۆ مـرۆڤ لەچارەسـەکردنی کاوبارەکانیـدا. لەمەشـدا مەبەسـتمان لـەو هاندەرانەیـە کـە هەڵدەقوڵێن لەلایەن هێزە کاریگەرەکانەوە لەعەقڵی ناوەوە نەك لەلایەنی سەرکوتکراوەکانەوە. ئەمـەش ئـەوە بەدیـدەهێنێت کـە: پێویـستە لەسـەرمان بەتونـدی ئاگامـان لـەخۆمانبێت لـەکاتی گوێگرتنمانـدا بـۆ هانـدەرە نەسـتییەکان لەخۆمانـدا، کـە دەشـێ هەنـدێجار لەبـەرگێکی خواسـتنی گرێـی دەروونـی‌و وەسوەسـەی ئـارەزووە سـەرکوتکراوەکاندا خۆیـان بنـوێنن. لەوانەشـە لەهەنـدێ رووەوە مـرۆڤ بـەرن بـەرەو شکست یـان هیچ‌وپوچـی‌و کـەرێتی‌و بـێ ئابڕوویی.

لەکاتێکدا مستەر (ولیەم مارستۆن) ئامۆژگاری خوێنەران دەکات کە گوێڕایەڵبن بۆ بەختە کوتوپڕییەکانیان[٣٣]، لەوانەیە هەر بەو جۆرە ئامۆژگارییە خوێنەرانی وڵاتە خۆرئاواییەکان بدوێنرێن. چونکە شارستانێتی خۆرئاوا یارمەتی تاك دەدەن بەجۆرێك لەپەرەپێدانی کەسایەتی دوور لەگرێی دەروونی. ئارەزووە تاکە کەسیو کۆمەڵایەتییەکان لەوێ نابینرێن بە سەرکوتکراویو خەفەخانکراوی وەك ئەوەی کە لەلای ئێمەی خۆر هەڵاتی هەیە. لەوێ کاتێك تاك چاو هەڵدێنێت بە ژیاندا ئەوا دڵنیاو ئاسوودەیە بە هەندێ لەدڵناییەکان لەلایەنەکانی سێکسی یان بژێوی ژیان یان ئیعتیبارییەکان، لەبەرئەوە (نەست)ی ئەو کەسە لەوێ پاڵفتەو پاکژەو توانای داهێنانی زیاتری هەیە وەك لە(نەست)ی تاکی خۆرهەڵاتی.

شارستانێتی ئێمەی رۆژهەڵاتی پڕە لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی سەرکوتکردنی ئارەزووەکانو گەشەکردنو پەرەپێدانی گرێی دەروونی لەتاکدا. ئەم هۆکارانەش لەسەر توندترین شێوە (هەروەك شتێکی ئاشکرایە لامان) بلاوەبێتەوە لەنێو هەژارانو کەمنەندامانو نەخۆشەکانماندا. ئەم کۆمەڵگا نەفرەت لێکراوەمان دروستکەری هۆکارەکانی هەژاریو کەمئەندامیو ناتەواویمانە لەلایەکەوەو پاشان رسواکردنو بەسوك سەیرکردنی ئەو توشبووانەیە بەو نەخۆشیو ناتەواویانە لەلایەکی ترەوە. بەمەش گرێیەکی دەروونی وایان لادروستدەبێت کە رزگاربوونیان نیە لێی.

لەوانەیە یەکێکمان چاوی بکەوێت بە ئافرەتێك لەدوورەوە ئەوا ئەم لێرەوە ئارامی لێهەڵدەگیرێتو بە هەر چوار پەل بۆی دەکەوێتە سەماو ئامادەیە خۆی لەپێناویا بتوێنێتەوەو لەوانەشە لەماوەیەکی زۆر کەمو چرکە ئاسادا خۆی وەرگەڕێنێتە سەر (دون جوان). بەڵام هەر ئەم کەسە ئەگەر هاتوو کۆمەڵێ پیاوی بینیو لەگەڵیاندا کۆبوویەوە ئەوا ئەو کاتە دەبینی چۆن خۆی وەردەگێڕێتە سەر پاڵەوانێکی قارەمانو کارامە وەك بڵێی هەر تۆزیشی لێنەنیشتووە. بەڵام دیسانەوە هەر ئەم کەسە ئەگەر هاتوو دەوڵەمەندێك یان خانەدانو خاوەن مەرتەبێکی بینی ئەو کاتە دەیبینی چۆن بۆی دەکەوێتە سەر ئەژنۆو کڕنووشی بۆ دەباتو ماستاوو مەراییو ئەنواعی مامەحەمەیی بۆدەکات.

دەبینین لەهەموو ئەو حاڵەتانەدا ئەو كەسە پەلكێشدەكرێت بەدوای ئارەزووەكانیداو بوارێكی سروشتی وای بۆ نەرەخساوە لەواقیعی ژیان بڕوانێت بەشێوە راستەقینەكەی خۆی بۆیە هەر خەریكی پێچو دەورەو لەگ لەگێتییە لەژیانداو دەیەوێت بە فیشاڵو رووپامایی‌و ماستاو ساردكردنەوە پێویستیەكانی ژیانی دابینبكات ئیتر لەهەر رێگایەكەوەبێت گرنگنیە.

كەواتە ئێمە ناتوانین ئامۆژگاری تاك بكەین لەم وڵاتەدا تا گوێبگرێت لەهاندەرەكانی عەقڵی ناوەوە، ئەگەر بێتو زۆر لێزان‌و وریانەبین‌و كارامە نەبین لەشێوازی ئەو ئامۆژگاری كردنانەدا. بۆیە پێویستە ئەو كەسەش كە ئامۆژگاری دەكرێت زۆر وریا و وردبین بێت بە هەموو مانایەكی وریایی لەبەخت‌و شانس‌و ئارەزووە سەركوتكراوەكانی خۆی كە زۆرو زەوەندن بۆئەوەی نەبێت بە ژێریانەوەو وەكو تەزبیح هەمیشە بەدەستیەوە یاریان پێبكات.

كاتێك تاك لەكۆمەڵی ئێمەدا بەشداری كۆڕو كۆبوونەوەیەك دەكات وەك كۆڕی پیاو ماقوڵان‌و خاوەن دەسەڵات، یان وەك كۆڕی پلەوپایەدارەكان یان وەك كۆڕی مامۆستایان یان وەك كۆڕی كارگەیەك یان وەك كۆڕی بانگهێشت‌و ئاهەنگگێڕانێك یان وەك هەر كۆڕێكی تر لەم شێوازانە. ئەوا دەبینی چۆن لەو كاتانەدا ئەو كەسە خۆی دەبینێتەوە بەحەپەساوی‌و دۆشداماوی‌و هەر دەستێكی كەوتۆتە لایەك نازانێت قسەو گفتوگۆ بكات یان بێدەنگبێت‌و وتەی لەدەم نەیەتەدەرەوە. چونكە هەندێجار قسەكردن وەك زیو بەنرخەو هەندێجاریش لەخەڵوز رەشترو ئێسكگرانترە...

ئەو كاتە ئەو كەسە هەستدەكات بەخۆی كە چەند هاندەرێكی جۆراوجۆر هەن جارێك هانیدەدەن بەوەی كە قسەبكات‌و لەو كۆڕانەدا بەشداری ئاخاوتنەكان بێت‌و جارێكی تریش هانیدەدەن‌و وایلێدەكەن كە بێدەنگبێت‌و قڕوقەپ لێی دانیشێت بە بێدەنگی، بۆیە ئەو كەسە نازانێت كام لەم دوو پاڵنەرەی ناخی (وەسوەسە)یەو كامیان (ئیلهام‌و بەهرە)یە.

مـن لێرەدا ناتوانم بنەمایەكی گشتی بدەم بەخوێنەر تا لەسەری بڕوات لەوەها هەڵوێستێكی ناخۆش‌و دژواردا وەك ئەوەی لەمەوپێش باسمانكرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەپارێزەوە دەڵێم:- ئەو كەسەی كە هاندەرە جۆراوجۆرەكانی ناخی خۆی دەپشكنێت‌و

پاشان ئەوەی لێدەپاڵێوێت كە بانگەشەی دڵسۆزیو چاكەی پێدەكرێتو بۆ خەڵك سود بەخشە، ئەوا ئەو كەسە سەركەوتن بەدەستدەهێنێت بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ.

ئەگەر هاتوو لەكۆڕو دانیشتندا ویستت قسەبكەیتو ئەو پاڵنەرەی كە پاڵت پێوەدەنێت بریتیبێت لەو بەدەستهێنانەی كە لەسەر تەقدیری ئامادەبووان یان نزیكبوونەوەت لەخاوەن دەسەڵاتو كەسە شایستەكان یان هەر شتێكی تری لەم بابەتانەوە بەدەستت هێنابێت، ئەوا ئەو كاتە بێگومان تۆ كەسێكی دۆڕاوو شكستخواردوو دەبیت جائیتر زووبێت یان درەنگ.

پەیبردنە نەستییەكان هەڵناقوڵێن تەنها لەدەروونە پاكژو دڵنیاكانەوەنەبێت. پێویستە لەسەرت چاوەڕێی چاكەی لێنەكەیت ئەگەر هاتوو تۆ ویستت ئارەزوویەك لەئارەزووە سەركوتكراوەكانت بەهۆی ئەوەوە تێربكەیت...

من لەوانەیە ئاسۆی تروسكایی لەو كەسەدا بەدیبكەم كە كاتێ قسەدەكاتو لەژێرەوە بەشێوەیەكی شاراوە چاودەبڕێتە گوێگرەكانی تا رادەی كاریگەری خۆی لەسەریان بزانێت. ئەوا لەو كاتانەدا بیرۆكەیەكی وای بۆ دێت كە جێگای بەدەستهێنانی سەرسامی گوێگرەكانی بێت بۆیە لەبەرئەوە بەشێوەیەكی وا دەیبینیت كاتێك قسەیان بۆ دەكات وەك ئەوەی كە هەر تەنها كەسێكیش گوێی لێڕانەگرتبێتو زەردەخەنەیەكیشی بە شاراوەیی نەخستبێتە سەر لێوی كەسێكەوە تا بەتەواوی وابلێدێت لەداناییو زیرەكییەكەی خۆیدا رۆدەچێتو شێوە نازێك دەداتە قسەكانیو ئیتر لەو كاتەدا خۆی وا دەداتە قەڵەم كە یەكێكە لەئالأهەلگرانی كەسە زیرەكەكان!.

جارێكیان جێگرێكم بینی لە(مەجلیسی نواب)دا وتاری دەخوێندەوەو ساتناساتێك لەدەلاقەیەكەوە چاوی دەبڕییە رۆژنامەنوسەكان، وەك ئەوەی پێیان بڵێت:- ((بڕوانن كە چۆن من پارێزگاری بێ سنوردەكەم لەپێناوی نەتەوەدا)). ئەو چوزانێت كە ئەو داكۆكیكردنەی ئەو دەیكات لەمافی نەتەوە وەك ئەو بەندە خواپەرستە رۆچووەی لێهاتووە لەخواپەرستیدا ئاگای لەخۆی نەماوەو واقیوڕماوە لەخۆی. بۆیە گوێنادات بەوەی كەخەڵك چی پێدەڵێنو ئەو بۆ خۆی سەرقاڵی ئەو پەیامەی خۆیەتی بیگەیەنێتو بتوێتەوە تیایدا.

★ ★ ★

رۆژێکیـــان وا رووەدات کـــە یـــەکێك لەدەوڵەمەنـــدە بەناوبانگـــەکانی بـــەریتانیا بڵاویکردۆتـەوە کـە:- بـڕە پارەیـەکی نەقـدی کـە تـەنها وەرەقەیـەکی نەقدیـەو نـرخەکـەی (هەزار جونـەیهی ئیسـتەر لینـی)یـە خستوویەتیە زەرفێکەوەو پەیمانیـداوە هـەر کەسـێك بتوانێت هەڵی بێنێت کە ئەو بڕە پارەیە چەندە ئەوا دەیداتێ بـۆ خـۆی. ئـەو زەرفـەی کـە پارەکەی تێدابوو بۆ ماوەیەکی زۆر لای خاوەنەکەی مایەوەو کـەس نـەیتوانی هـەڵیبێنێتو سەرکەوتن بەدەستبێنێت. بۆیـە لەبەرئـەم هۆیـە نوسـەران لەبـەریتانیا ئەمـەیان کـرد بـە (بەڵگەی بنبەسـت) بـۆ بەدرۆخستنەوەی هەسـتە ناناسـاییەکان، ئـەوەی وا هەنـدێ کـەس بانگەشەی بۆ دەکەن.

لەسەر ئەم رووداوەش (سینلێ) هات پێشنیارێکی بۆ دەربڕیو ووتی:-

هیوای هەڵهێنانو بردنەوەی ئەو بڕە پارەیـەی کـە نـرخەکـەی هـەزار جونەیهـە دەبێتـە هـۆی هـەڵقوڵینی زۆر بیرکردنـــەوەو پێـداگیریو تێرامـــان لەمرۆڤـدا بـــۆ پێگەیـشتنیو بەدەستهێنانی. ئـەو بیرکردنـەوە تونـدەش بـواری مـرۆڤ نـادەن تـا بتوانێـت زیهنـی خـۆی ئاراستەی بڕە پارەکە بکاتو بزانێت نرخی ئەو وەرەقەیـە چـەندەو ژمارەکـەی بدۆزێتـەوە هەرچەندە ئەو کەسە بەهرەدارو لێهاتووش بێت لەو بوارەدا[٣٤].

ئەمەش بەم مانایە دێت: مرۆڤ مادام داوای شتێك بکاتو بیەوێت بەدەستی بێنێتو لـەو پێنـاوەدا بیرکردنـەوەو توانـای خـۆی بـۆ بخاتـە گـەڕ، ئـیتر ناتوانێـت عـەقڵی نـاوەوە (نادیـار)ی بـەکاربێنێت بـە بـەکارهێنانێکی تـەواو شـێلگیرانە. بۆیـە لەوانەیـە ئـەو قسەیە راستبێت کـە دەڵێـت: ئـیرادەو ئیلهام (خواسـتو بـەهرە) پێکـەوە کۆنابنـەوە. هەرچـەندە ئـیرادەت تونـدو بـەهێزبێت ئـەوا ئیلـهامت لاوازدەبێـت. تـۆ سـەرکەوتن بەدەسـتناهێنیت لەبەرهەمهێنانی عەقڵی ناوەوەت تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ئەو ئیشەی وا سەرقاڵی تێیدا مەبەستو ئامانجێکی کاتیت نـەبێت لەدوایـەوەو داواکـاری ناوبـانگ پەیـداکردن یـان مـاڵو دارایی یان تواناو دەسەڵات نەبیت بەهۆیەوە.

ئـەو بەهرەمەنـدە گەورانـەی توانیـان بـە کارەکانیـان رێـڕەوی مێـژوو بگـۆڕن بەراسـتی داواکـاری بەرژەوەنـدی زیـاتری خۆیـان نـەبوون لەبەرژەوەنـدی خـەڵك واتـە: بەیـەك چـاو سەیری بەرژەوەندی خۆیـانو خەڵکیانـدەکردو نـەیان دەویـست بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان لەو پێناوەدا زۆرترو باڵاتربێت. لەوانەشە زۆربەیان هەر بەتەواوی نقومبووبێتنە نێو ئـەو

پەیامە كۆمەڵایەتیەی وا ویستوویانە بیگەیەنن بە خەڵك بە جۆرێك كە تەنانەت خودی خۆیان و ئەوانەشی كە بەخزمایەتیو رەچەڵەك پێیان دەگەن بیرچۆتەوە.



(تشنەر) لەو بڕوایەدایە كە (دەست خوێنەرەوەكان)و فالگرەوەكان ئەوانەی كە دەڕواننە تۆپە كریستاڵییەكان ئەوە لەبەر مەرامی خۆیانە كە بەو كارمیان داوای پاكژی فیكری دەكەن (٣٥)، بەشێوەیەك لەو جێبەجێكردنەدا بەهرە نائاساییەكانیان دەكرێتەوە. لەبەرئەوە (سینلێ) پشتگیری ئەم رایە دەكات بەپشتگیرییەكی گەورە. هەروەها ئەو لەو بڕوایەدایە ئەوانەی ئاوی ژێر زەوی دەدۆزنەوە بەهۆی (گۆچانی دۆزەرەوە)وە یان قاوە دەگرنەوەو دەست دەخوێننەوەو شتەكانی تریش ئەوا مەبەست لەو كارانەیان وەستانی جوڵەی بیركردنەوەی ئاسایی خۆیانەو ئامادەكردنی زیهنیانە بۆ گەیشتن بە لەرینەوە دۆزەرەوەكان.

(سینلێ) مەرجێك دادەنێت، بۆئەوەی پەیبردن هەستێ بە چالاكییە نائاساییەكانی خۆی لەمرۆڤدا، ئەوەش ئەوەیە: پێویستە جوڵەی مێشك بوەستێنرێت بەشێوەیەكی كاتی. بەجۆرێك لەهاوشێوەی ((لاپەڕەیەكی سپی)) دابێت واتە: (پاڵفتەبێت لەهەموو خەیاڵاتێك)، لەو كاتەدا (مێشك) بە بۆچوونی (سینلێ) دەبێتە هاوشێوەی ئەو رادیۆیە كە دوگمەكەی دەكەیتەوەو میلەكەی بەوردی دەگەڕێنیت بەدوای ئێزگەكانداو تەنها لەو ئێزگەیەشەوە شەپۆلەكان وەردەگرێتو لەوانی تردا وەریناگرێت.

لەكاتێكدا (سینلێ) لەگەڵ كچە بەهرەمەندەكەدا تاقیكردنەوەكانی ئەنجامدەدا، ئەوا لەو كاتەدا لەیەكێك لەگیرفانەكانیدا یان لەنێو جانتاكەیدا چەند شتێكی جۆراوجۆری شاردبوویەوەو پاشان پرسیاری دەكرد لەكچەكە لەبارەی ئەو شتانەوە. كچەكەش لەسەرەتای تاقیكردنەوەكەدا پێی دەوت: ((تۆزێ لەسەرم راوەستەو ئارامبگرە پێویستم بەخاڵیكردنەوەی فیكریی هەیە لەمێشكمدا)). پاشان بۆی نەدەوەستاو یەكسەر ئامادە ئەبوو: ((ئێستا من ئامادەم)). دوای ئەوە ئیتر ئەو هەواڵانەی پێدەگەیشت لەبارەی شتە شاراوەكانەوە بۆی دەهاتنو بەوردی وەڵامی دەدانەوە لەكوێدان بەجۆرێك كە مایەی سەرسوڕمانە[٣٦].

 

دەردەکەوێت کە عەقڵی دیارو عەقڵی نادیار، هەروەك لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان پێدا، پێچەوانەی یەکترن لەسروشتیاندا، یان بە دەربڕینێکی تر ئەو دووانە:- دوولایەنی دژ بەیەکن، ئەگەر هاتوو چالاکی یەکێکیان توندو بەهێزبێت ئەوا ئەویتریان لاوازو شاراوە دەبێت. لەوانەیە هەر ئەمەش بێ ئەو هۆکارەی کە وا لەکارە نائاساییەکانی عەقڵی ناوەوە دەکات بەروونترین شێوە دەرکەون لەکاتی خەواندنی موگناتیسیدا (هیپنۆتیزم)دا. کەسی خەوێنراو خەوتووە بە خەوتنی موگناتیسی کە دەشێ بەو کارە عەقڵی دیاری (هەستیار)ی سەرخۆشکرابێت (بێئاگا کرابێت)و بەوەش ئاگای لەهیچ نیە تەنها ئەوەندەبێت کە خەولێخەرەکەی فەرماندەکات بەسەریدا، ئەو لەوکاتەدا (مۆخی مێشکی) بووەتە ((لاپەڕەیەکی سپی))، بەپێی دەربڕینی (سینڵ)، هەربۆیە ئامادەیە بۆ پێشوازی کردن لەشەپۆلە دیاریکراوەکانی دەرەوە.

لەم حاڵەتەدا دەتوانین ئیحای خەولێخەرەکە دابنێین بە میلی رادیۆکە، لەوەدا کە ئەو دەتوانێت بەرەو هەر لایەکی بوێت ئاڕاستەی ئەو ئێزگەیەی بکات. من خودی خۆم شتە سەرسوڕهێنەرەکانی خەواندنی موگناتیسیم بینیووە کە واقمورماوەو حەپەساوم لێیان. بەجۆرێك جارێکیان کەسێکی خەوتوو توانی ناوی من بزانێت تەنانەت ناوی باوکم‌و پیشەکەم‌و ئەو شتەشی کە داوای دەکەم بەبێ ئەوەی پێشتر منی ناسیبێت.

لەساڵی ١٩٤٩ دا لەئاهەنگێکی گەورەدا ئامادەبووم کە سازدرابوو بۆ خەوێنەرێکی موگناتیسی بەناوبانگ لەئەمریکا. ئەو خەولێخەرە دەیتوانی ئەو شتە شاراوەیە بدۆزێتەوە کە لەگیرفانی کەسێکدا بوو لەئامادەبووان. هەروەها دەیتوانی بیری کەسانی تر بخوێنێتەوەو رێنموویی ئەو کەسە بکات کە دەگەڕێت بەدوای ئەو شتەدا کە لێی ونبووە یان ئەو شتانەی کە شاراوەیە لای‌و نایزانێت. بەم کارانەشی هەموو ئامادەبووان سەرسامدەبوون لەو شتانەی کە دەیانبینی.

من نامەوێت پەنجە بۆ ئەو گومانە درێژبکەم لەوەی کە ئەو خەولێخەرە موگناتیسییە فێڵی لێکردووین‌و هەڵیخەڵەتاندووین بەرێگایەك لەرێگاکان. چونکە ئەوانەی ئامادەبوون لەوێ بە هەزاران کەس دەبوون، چاویانتێبڕیبوو، هەر کەسێکیش لەوانە بۆ خۆی گومانێکی لادروستبوبوو لەوەی کە دەیبینی، بۆیە ئەو کەسە لەهەوڵی ئەوەدا بوو کە ئەو هۆکارە ماددیە هەستپێکراوە بدۆزێتەوە کە بەهۆیەوە ئەو خەولێخەرە دەتوانێت بکاتە

فریودان‌و هەڵخەڵەتاندنی ئەم. بەهەرحاڵ ئەوەی من بینیم بە چاوی خۆم بەسە بۆ بڕواهێنان بەوەی کە ئەو خەولێخەرە خاوەنی توانایەکی لەرادەبەدەرو کاریگەرە، من نامەوێت خوێنەر بڕوام پێبکات لەوەی کە دەیڵێم لەم بارەیەوە. چونکە ئەو بۆ خۆی دەتوانێت بڕوات بۆلای یەکێك لەو خەوێنەرە موگناتیسیانە، چونکە سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ لەهەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەتەوە، با لەگەڵیا هەستێ بە تاقیکردنەوە لەمبارەیەوە- ئەگەر دەیەوێت راستی بۆ دەرکەوێت‌و بڕوای پێبکات-.

هەندێ کەس لەمبارەیەوە نارەزایی‌و رەخنە دەردەبڕن‌و دەڵێن: ((ئەگەر خەواندنی موگناتیسی (هەروەك دەڵێن) دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئەو توانا کاریگەرو لەرادەبەدەرە، ئەی بۆچی ئەوانە خۆیان کە ئەو کارە دەکەن ناتوانن بەکاری بێنن لەدۆزینەوەی تاوانە شاراوەو تەمومژاوییەکاندا یان لەگەڕان بەدوای ئەو گەنجینە شاراوانەدا کە لەژێر زەویدان یان لەهاوشێوەی ئەمانە؟)).

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆر ئاسانە: ئەگەر هاتوو بەجۆرێك وێنامانکرد وەك ئەوەی کەمێشکی مرۆڤ بچوێنن بە ئامێری رادیۆیەکە، بۆیە رادیۆکە پێویستی بەوەیە کە تۆکمەو ساغ‌و سەلیم بێت‌و هیچ نوقسانییەکی تیا نەبێت بۆئەوەی هەستێ بەکارەکەی خۆی بەرێکوپێکی‌و بێ خەوشی ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە ئەوەیە کە ئەو ئێزگەیەی وەریدەگرێت لەوێستگەی پەخشەکەوە زۆر بەهێزو سافدەبێت.

لەسەردەمێکی پێش ئێستاماندا پێش ئەوەی تەلەفزیۆن بێتە عێراقەوە یەکێ لەمناڵەکانم داوای لێکردم‌و پێی وتم کە تەلەفزیۆنێکی بۆ بکڕم بە جۆرێك ئەو وا گومانیدەبرد کە دەتوانێ هەموو دنیا لەو تەلەفزیۆنەوە ببینێت، بەڵام ئەوەی نەدەزانی ئەم ئامێرە سودی لێوەرناگیرێت لەکاتێکدا کە هێشتا وێستگەی پەخشی تەلەفزیۆن نیەو دانەنراوە لەوڵاتەکەماندا. ئەو برادەرانەش ئەوەی داوایدەکەن لەخەواندنی موگناتیسی تا خاوەنەکانیان ئەنجامی بدەن، لەعەقڵیەت‌و بیروبۆچوونیاندا هیچ جیاوازییەکیان نیە لەگەڵ ئەم کوڕەی منداو بەهەمان شێوە بیردەکەنەوە، ئەوان دەیانەوێت ئەو کەسەی کە ئەو کاری خەواندنە ئەنجامدەدات هەرچی وا لەژێر زەویدا لەزێڕ و زیو بۆیان بدۆزێتەوە ئەنجا باوەڕی پێدەکەن. بەڵام چوزانن، ئاگایان لەوە نیە کە هێزو توانای خەواندن

سنوردارەو پابەندە بەچەندەها مەرج و داخوازییەوە- وەك هەریەكە لەهێزو تواناكانی تر كە لەم مرۆڤە سەرسوڕهێنەرەدا هەیە-!!

خەوانـدنی موگناتیـسی هـەروەك خـەوی ئاسـاییە، هـیچ جیاوازییـەكی لەگـەڵ خـەوی ئاساییدا نیە لەجەوهەردا تەنها لەیەك شتدا نـەبێت: ئـەویش ئەوەیـە كە ئـەو خەواندنـە روودەدات بەهۆی كاریگەری كەسێكەوە لەسەر كەسێكی تر واتـە لەسـەر كەسـی خـەوێنراو. ئەمەش ئەو خەواندن و خەوەیە. ئـەم جیاوازییـەش دەبێتـە هـۆی بـەدیهێنانی بـەرەنجامی گەورەی پراكتیكی.

كەسی خەوتوو دەخەوێت بە خەوتنێكی ئاسایی و سروشتی و دەشێت لەو كاتەدا مێشكی بجوێنێت بە شێوەی* رادیۆكە بەڵام دوگمـەی نـەبێت بـۆ كردنـەوە، بۆیـە لـەو كاتـەدا كـەس ناتوانێت ئاڕاستەی كات یان فەرمانی بەسەردا بكات و ئیجای بداتێ. عـەقڵی نـاوەوە لـەكاتی خەوتنی ئاساییدا كراوەیە بە هەموو بەختێكی لەپڕ هاتوو، زۆرجار دەگونجێت لـەو كاتـەدا سەرقاڵبێت بە گرنگیدان بە پشوودانێكی ئارەزووە سەركوتكراوەكانی خاوەنەكەیەوە.

بەڵام لەخەواندنی موگناتیسیدا كەسی خەولێخەر ئیجـا دەداتـە كەسـی خـەوتوو چۆنی بوێت، كەسی خەوتووش گوێڕایەڵیەتی بـە گوێڕایەڵێتییـەكی كوێرانـە، چـونكە ئـەو ئاگـای لەدەوروبەرەكەی نییە لەوكاتەدا تەنها لەوە نەبێت كە خەوێنەرەكـەی فـەرمانی پێـدەدات. بەمەش كلیلی مێشكی لەدەست خەوێنەرەكەیدایە.

ئەو ئامارانەی كۆمەڵەی توێژینەوە دەروونییەكان پێـی هەسـتاون لەبـەریتانیا، بەڵگـەن لەسـەر سـەلماندنەكان، بـەجۆرێك كـە (١٧٠٠٠)حەڤـدە هـەزار وەڵامـی ئـەو كەسـانەیان پێگەیشتووە كە لەو بابەتەوە پرسیاریان ئاڕاستە كـراوە، لەسـەر رێـژەی ئـەو كەسـانەی كـە خەونەكانیان بەڕاست دەرچووە دادەنرێت بە تێكڕایی ((١ بۆ ٤٧))[٣٧] هـەروەك لەمـەوپێش ئاماژەمان بەمە داوە.

لەمەوە روونـدەبێتـەوە ئاستی ئەو تێكەڵبوونەی كە روودەدات لەخەونەكانی خـەوتوودا كە بە شێوەیەكی ئاسایی و سروشتی خەوتبێت. پەیبردنەكانی لەخەودا بەزۆری تێكـەڵبووە بـە خـەیاڵ و شـەهوەتبازی و ترسـەكانی. كـە لەوانەیـە لـەو كاتـەدا عـەقڵی نـاوەوەی سەرقاڵبووبێت بە پێگەیشتنی خۆشەویستەكەی ئەو خۆشەویستەی كـە لێـی قەدەغـەكراوە پێشتر یان خەریكە بە خواردنی ئەو خواردنەوە كە لەكاتی بە ئاگاییدا لێـی قەدەغـەكراوە

یـان خـەریكی تۆڵەكردنەوەیـە لەدوژمنەكـەی كـە پێـشتر لـەكاتی بـە ئاگاییـدا ئـازارو ئەشكەنجەی ئەمی داوەو ئەمیش نەیتوانیوە بەرپەرچی بداتەوە. بۆیە ئـەو كەسـە لـەكاتی خـەودا پەنادەباتەبـەر خـەوبینین بـۆ دامركاندنـەوەی كـەف و كوڵـەكانی لـەو شـتانەدا وا لەكاتی بە ئاگاییدا لێی قەدەغەكراوون و ناتوانێت ئەنجامیانبدات - هەموو كاروبارەكانیش هەر بۆ خوا دەگەڕێتەوە.

لەسەر ئەم پێودانگە زۆر هەڵەیە پشت ببەستین بە خەونەكانمان لەئیش و كارەكانماندا هـەروەك چـۆن هەنـدێجار خـەڵكی بەگـشتی پـشتی پێدەبەسـتن و پراكتیـزەی دەكـەن لەخۆیاندا. پشت بەستنمان بە خەونەكان لەهەندێ رووەوە لەهاوشێوەی ئەو پشت بەستنە دەچێت كە هەندێ لەخەڵكی پێڕەوی دەكەن لەبردنەوەی (ئەسپ سواری). چونكە رێـژەی بەهەڵەداچوون تێیدا زۆر زیاترە لەرێژەی بەراست دەرچوون. هەمیـشە لـەم كـارەدا كـەس خێری لێ نابینێت تەنها گێل و گاوارو نەزان و نیمچە شێتەكان نەبێت.

ئەمەش بەو مانایە نایەت كە ئیتر بـەهیچ شـێوەیەك خەونـەكان سوودیان نیـە. بـەڵكو هەندێجارو لەهەندێ كاروباردا رێنمایی مرۆڤ دەكەن كە دەبنە مایەی رەزامەندی و دەكرێ لەواقیعـدا بێنـەدی بەشـێوەیەكی پراكتیكـی. هـەروەها زۆرجـار سـودی هەیـە لەنەهێـشتنی هەنـدێ تـەنگ و چـەڵەمەدا كـە پێـشتر خاوەنەكـەی گـیری خـواردووە بـە دەسـتییەوەو نەیتوانیوە چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام لەكاتی خەوتن و خەوبینیندا رزگای بووە لێی.

دەڵێن گوایە (ئیبن سینا) گـەورە فەیلەسوفی بـەناوبانـگ، هـەركاتێ تـەنگ و چـەڵەمەو كێشەیەكی قورسی بهاتایەتەرێ ئەوا هەڵدەسا دەستنوێژێكی دەگرت و نوێژێكی بـۆ دەكـردو پاشان لێی دەخەوت و لەخەونیدا كێشەكەی بۆ چارەسەردەكراو لێی رزگار دەبوو. هـەروەها هاوشـێوەی ئـەم چـیرۆكەش دەگێڕنـەوە لـەبارەی (دیكـارت)ەوە، هـەروەك دەڵـێن ئـەویش زۆربـەی دۆزینـەوەو رێبەدێییـە گـەورەكانی لەرێگـەی خەونـەوە بـەدیهێناوە، بـە تایبـەتی لەخەونەكانی بەرەبەیانیدا.

هـەروەها هـەمان شـت دەگێڕنـەوە لـەدۆزەرەوەی (ئەنـسۆلین) ئـەو كەسـەی كـە ئـەو دەرمانەی دۆزیەوە ئەویش هەر لەكاتی خەودابووەو بـەهۆی خەوبینینـەوە بـووە. رووداوی دۆزینەوەكەشـی بـەمجۆرە بـووە: ئـەو لـەبارەی نەخۆشـی شـەكرەوە زۆری خوێندبوویـەوەو هەموو سەرچاوەیەكی بۆدابوو بەیەكداو بۆ رۆژی دوایی موحازەرەیـەكی ئامـادەكردبوو كـە

پێشكەشی كات، پاشان هیلاكی زۆری بۆهێناو لێی خەوت، لەسەعات دووی دوای نیوە شەودا لەپڕ خەبەری بوویەوەو هەستا چراكەی داگیرساندو لەدەفتەری بیرەوەرییەكانیدا سێ عیبارەتی نووسی. ئەو عیبارەتە سادەو ساكارانەش بوون كە لەدواییدا بوون بە كلیلی دۆزینەوەی ئەو چارەسەرە مەترسیدارە بۆ نەخۆشی شەكرە[٣٨].

مستەر (ولیەم جبس) سكرتێری پێشووی دارایی ویلایەتە یەكگرتووەكان، ڕێگایەكی تایبەتی بەكاردەهێنا بۆ سوود وەرگرتن لەخەونەكانی. ئەو كاتێ كە دەچووە شوێنی خەوتنەكەی لەدەوروبەری نیوە شەودابوو پاش ئەوەی كە ئیتر بیركردنەوەكانی تەواو توانا عەقڵییەكەیان هیلاك و ماندوو دەكرد. بەشێوەیەك ڕاهاتبوو كە هەموو شەوێك كاغەزو قەڵەمێكی دەهێنایە تەنیشت جێگاكەی و پاشان لێی دەخەوت بۆئەوەی هەر كە خەونی بینی خێرا هەستێ و بیاننوسێتەوە، چونكە زۆربەی كێشەو تەنگ و چەڵەمەكان لەخەندا چارەسەری بۆ دەدۆزینەوەو پاشان بنەبڕی دەكردن. هەندێجار لەخەو هەڵدەساو لەمێشكیدا فیكرەیەكی تازەو كتوپڕ سەریهەڵدەدا، بۆیە خێرا پەلاماری قەڵەمەكەی دەداو دەینوسییەوە پێش ئەوەی لەبیری بچێتەوە. بە زۆری مستەر (جبس) سوودی لەم ڕێگایە وەرگرتووە بۆ گەیشتن بە چارەسەركردنی كێشەكانی و ئەو شتانەی كە لێی عاسی بوونەتەوە لەكاتی بێداریدا [٣٩].

زۆربەی توێژەرەوەكان هەوڵیانداوە ڕێگایەكی دەروونی دیاریكراو دابنێن تا مرۆڤ بتوانێت بە هۆیەوە بەروبوومی خەونەكانی بەكاربێنێت بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی و نەهێشتنیان. ئەوەی كە دەردەكەوێت لەم بوارەدا كردبێتیان لەگەورەترینی ئەو ڕێگایانەی كە دایانناوە بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەیە كە دەخولێتەوە بە دەوری تركیزخستنە سەر عەقڵی ناوەوەدا پێش خەوتن لەسەر فیكرەیەكی دیاریكراوو چاندنی دڵنیاییە تێیدا بۆئەوەی بە بینینێكی برندەو كونكەرەوە بەرەوڕووی بڕۆیت و ئاڕاستەبڕبیت.

دەگێڕنەوە (ئیبن خەلدون)دوعایەكی دیاریكراوی هەبووەو بەكاری هێناوە پێش خەوتن كە پێی دەوترێت ((حالومیە)) هەروەك دەڵێن، لەخەودا سودی لێوەرگرتووەو ئەو كاروبارانەی كە خەونی پێوە بینیون پێیان كەیف خۆشبووە. ئەم ((حالومیە))ش بەگوێرەی ئەوەی ئیبن خەلدون دەیگێڕێتەوە ئەمەیە: ئەو لەكاتیخەوتن و ئەوەدا كە ئیتر پشووبدات و بحەوێتەوە لەجێگەی خەوتنەكەیدا ئەم وشە عەجەمیانەی دەخوێندەوە و

پاشان لێی دەخەوت ((تماغس بعدان یسود وغداس نوفنا غادس)) ناوی ئەو پێویستییەی دەبرد کە داوای دەکردو پاشان لەخەونیدا وەڵامەکەی دەدۆزیەوە لەبارەی ئەو شتەوە کە پرسیاری کردبوو[٤٠].

بەراستی جێگەی سەرسوڕمانە کە (ئیبن خەلدون) کاریگەری ئەم ((حالومیە)) شیدەکاتەوە لەکەسی خەوتوودا بەشیکردنەوەیەکی دەروونی کە نزیکە لەشیکردنەوەی نوێوە. ئەو دەڵێ: ((..... بێتو گەر ئەم حالومیاتانە ئامادەباشیان بۆ بکرێت لەدەروونندا بۆ روودانی خەون، ئەگەر ئەو ئامادەباشیانە بەهێزو پتەوبێت ئەوا نزیکترە لەبەدیهێنانی ئەوەی کە خۆی بۆ ئامادەکردووە.... ئەو توانایەی لەسەر ئامادەباشییە جیاوازە لەو توانایەی لەسەر شتەکانە)) [٤١].

لەوانە ئەو مانایەی (ئیبن خەلدون) مەبەستییەتی بەو وشە عەجەمیە هەلەقو مەلەقانە ئەو سودو کەڵکەیان نەبێت لەخودی خۆیاندا، ئەو وشانە وەکو تەشقەڵەکردنی منالان وایە نەك قسەی گەورەو عاقڵەکان. بەڵام کاریگەرییەکەی لەپشکنینی دەروونیدا دەردەکەوێت. بەشێوەیەك بڕواهێنان پێی ئیحایەك دەدات بەدەروون بۆ چوونە نێو خەیاڵی سەرکەوتن لەو شتەی کە خۆی دەیەوێت. بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی بەدیهێنانی پاکژکردنەوەو دامالینی عەقڵی ناوەوە لەچڵك و چەپەڵی و رێگاتەیکردن لەپێناو دۆزینەوەیەکی داهێنەرانەدا.



بەم بۆنەیەوە گەر سەرنجبدەین لەو وشە عەجەمیانەی کە بەزۆری بەکاردەهێنرێن لە(تەلەسم و نوشتەو دۆعا)کاندا لەرۆژهەڵاتدا. دەرکەوتووە کە بەهێزترین کاریگەری هەیە لەسەر دەروون زیاتر لەوشە مانادارەکان. ئەو تەمومژەی لەسەر وشەکانە دەبێتە هۆی دروستکردنی شتێك لەداهێنان و پیرۆزیی لەسەریان. چونکە ئەگەر مانای وشەکان تێگەیشتیت ئەوا ئیتر جوانی و داهێنانەکەی لەدەستدەدات و کاریگەرییە دەروونییەکەی بە تاڵ دەبێتەوە. لەم جۆرە کاروبارانەدا کێشەکە ئەوەیە سوودناگەیەنێت ئەگەر هاتوو خەڵك نهێنییەکەی زانی و کەوتە فەلسەفەلێدان بەرامبەری.

عـەقڵی نـاوەوە بریتییـە لەعـەقڵی بـیرو بـاوەڕی چەسپاو، لەکاتێکدا عـەقڵی هەستیار (دیـار) بریتیـە لەعـەقڵی بیرکردنـەوەو گومـانو فەلـسەفەلێدان. ئەگـەر دەتـەوێت عـەقڵی نـاوەوەت بـەکاربێنیت بـە بـەکارهێنانێکی راسـتو دروسـت، لەخـەودا یـان لەشـتی تـردا، پێویـستە لەسـەرت دوورکەویتـەوە لەهـەر شـتێك کـە پێویـستی بەبیرکردنـەوەو بەڵگەهێنانەوەو فەلسەفەلێدانبێت.

بیرمەندان لەسەردەمی نوێدا نـاڕۆن بـەلای بـەکارهێنانی رێگـای (ئـیبن خەلـدون)دا بـۆ بەرهەمهێنانی عەقڵی ناوەوەیان لەبەرئەوەی ئەمان ئێستا تێگەیشتوون لەنهێنی ئـەو وشـە عەجەمیانەی کە بـەکاری دەهێنـان، هـەروەها دەرکیـان بـەوەکردووە کـە ئـەو وشـانە تـەنها (فۆنـەتیکن)و هـیچ مانایـەکیان نییـە و مەبەسـت لەبـەکارهێنانیان گرنگیپێـدان و ئیحـاو چاندنی بیرو باوەڕو دڵنیاییە. بۆیە خـەڵکی لەکۆنـدا بڕوایـان هـەبووە بـەو جـۆرە وشـانەو وایان لێکداوەتەوە کە کلیلی هـەموو شـتە داخراوەکانـە، لەبەرئـەوە ئـەوان لـەو سـەردەمەدا سودیان لێوەرگرتووە.

رێگای نوێ بۆ بەرهەمهێنانی عـەقڵی نـاوەوە بریتیـە لـەرێگای ئیحاو دووبارەکردنـەوە. مـرۆڤ دەتوانێـت بـەو مانایانـە ئیحـا بداتـە خـۆیو دووبـارە کردنـەوەی لەسـەربکات پـێش خـەوتن، یـان لەهـەر کـاتێکی تـردا، ئەوەنـدەی لەتوانایدایـە لـەپێناوی چارەسـەکردنو نەهێشتنی تەنگو چەڵەمەکانی یان بۆ شفای نەخۆشییەکان یان بەدەستهێنانی سەرکەوتن یان هەر شتێکی تر.

مرۆڤـی نـوێ نیعمـەتی ئیمـانو بیروبـاوەڕی چەسپاوی لەدەسـتداوە، ئـەو ئێـستا بـیر دەکاتەوەو فەلـسەفە لێـدەدات زیـاتر وەك لـەوەی بڕوابێنێـتو شـتەکان بەراسـت بزانێـت. لەبەرئەوە ئەو هێـزە زۆر گـەورەو کاریگـەرەیان لەدەستدەرچووە- هێـزی عـەقڵی نـاوەوەو پەیبردنە لەرادە بەدەرەکان- ئینکاری لـەوە ناکرێـت کـە مـرۆڤ دەتوانێـت عـەقڵی نـاوەوەی بەرهـەمبێنێت بـە هـۆی ئیحـاو دووبارەکردنـەوەوە بـەڵام ئـەم بەرهەمهێنانـە لاوازە بەنیسبەت ئـەو بەرهەمهێنانـەی کـە باوبـاپیرانی لەسـەردەمی کۆنـدا بەدەسـتیان هێنـاوە لەکاریگەرییەکانی ئیمانەوە.

جارێکیـان کەسـێك دەچێت بـۆ لای پزیـشكو سکاڵای خـۆی لادەکـات لەتووشـبوونی بـە چـەند نەخۆشـییەکی دەروونییـەوەو پرسـیاری چارەسـەرکردنی لێـدەکات، پزیـشکەکەش

ئەوەی بیستبوو لەبارەی ئیحای دەروونییەوە هێزێکی کاریگەری تیایە بۆ چاککردنەوەی نەخۆشییەکان، بۆیە گوێی دەگرت لەنەخۆشەکەو لەهەر سکاڵایەکدا کە ئەو دەریدەبڕیو باسی دەکرد بۆی، ئەمیش جوان گوێی بۆ شلدەکرد و لەوەڵامی هەر سکاڵایەکیدا دەیوت بە نەخۆشەکە: ((ئیحا بدە بەدەروونی خۆت ئەوا تۆ چاکدەبیتەوە..... ئیحا بدە بە دەروونی خۆت ئەوا تۆ چاکدەبیتەوە......)).

نەخۆشەکە هاتە دەرەوە لای دکتۆرو پارەی پشکنینەکە (فحص)ەکەی نەدایەو پێی وت:- ((ئیحا بدە بەدەروونی خۆت کە پارەی پشکنینەکەت لێوەرگرتووم..... ئەی دکتۆری خۆشەویست)).

ئەو دکتۆرە گەوجە گومانی وابووە کە ((ئیحا ))ئامادەیەو دەگونجێ عەقڵی ناوەوە بەرهەمبێنێت بەهۆی قەناعەت پێکردنی لۆژیکیو بیرکردنەوەی هەستیاریو بە ئاگاییەوە.

چارەسەرکەرە دەروونییەکان نابێ نهێنی ئەو ڕێگەیە بۆ ئەو نەخۆشە پیشانبدەن کە دەیانەوێت بەو ڕێگەیە چارەسەری بکەن، وەنابێ بە نەخۆشەکە بڵێ ((ئیحا بدە بەخۆت)) بەڵکو دەبێ لەجیاتی ئەمە پێی بڵێت: ((وابڵێ. ئەوە بەکاربێنە....)).

سەلمێنراوە کە ((ئیحا )) توانایەکی زۆر سەرسوڕهێنەری هەیە لەسەر چاککردنەوەی نەخۆشییەکان هەموویان بە دەروونیو جەستەییشەوە. هەروەها سەلمێنراوە کە هەموو نەخۆشییەکان لەهەمان کاتدا دەروونیشو جەستەییشن پێکەوە [٤٢]. داودەرمانی ماددی شفابەخشنییە ئەگەر بڕوایەك لەنەخۆشەکەدا نەبێت بەوەی کە ئەو دەرمانەی دەیخوات یان بەکاری دێنێت چاکی دەکاتەوەو شفای بۆ دێنێت. لەوانەیە ((ئیحا )) سوودبەخشبێت بەبێ دەرمان. بەڵام دەرمان بەبێ ((ئیحا )) هیچ سوودێك ناگەیەنێت.

خانمێك تووشی واهیمە ببوو بەوەی کە ((ئێسکە ماسی)) لەقوڕگیا وەستاوەو ڕۆژێ هەر دەبێ بیکوژێ. هەموو دکتۆرەکان کۆکبوون لەسەر ئەوەی کە بەهیچ شێوەیەك ئێسکە ماسی نیە لەقوڕگیا بەڵام ئەو هەر بڕوای پێ نەدەکردن. پاشان ئیتر چاری نەماو گومانی ئەبوو لەوەی کە ئیتر دەمرێت ئەگەر بێتوو دکتۆرێکی تر لەجۆری تازە فریای نەکەوێت. ئەو دکتۆرە تازەیەش هاتو بە عاقڵانە ئێسکە ماسییەکی بچکۆلەی هێناو شاردییەوە بێ ئەوەی ئەوبزانێتو لەکاتی سەیرکردنی ناودەمیدا ئێسکە ماسیەکەی خستە قوڕگییەوەو

پاشان دەریهێنایەوەو بەڕوو خۆشییەوە هاواریکرد: ((بڕوانە... بۆ دواجار چۆن ئێسکە ماسییەکەم دەرهێنا لەنێو قوڕگتا!!)) خانمەکە شفای بۆ هاتو بەکاریگەری ئەم کردەوەیە بە یەکجاری چاك بوویەوە.

عەقڵی ناوەوە سەلماندنی لۆژیکی ناناسێتو سودی لێ وەرناگرێت. لەعەقڵی ناوەوەدا هیچ شتێك سوودی نیە تەنها دووبارەکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە نەبێت کە گومانو مشتومڕی تیانییە. بەمەش سەرکەوتنەکان زۆردەبن لەو ئیشوکارانەدا کە پێویستیان بە دڵنیاییەو پێویستیان نییە بە بیرکردنەوەو تەگبیرکردن.



لەژیانی شارنشینیو مەدەنیەتی نوێ سودمان وەرگرتووەو براوەین لەلایەکەوە. لەلایەکی تریشەوە دۆڕاوینو شکستمان خواردووە. هەرچەندێك شێوازەکانی ژیانی ماددی بەرەوپێشکەوتن بڕوات بە پێشکەوتنێکی گەورەو لەبەرچاو، بەڵام لەولاوە ئەوەندە دواکەوتووین لەشێوازەکانی دەروونو ڕێگای بەرهەمهێنانی هێزە کاریگەرو لەرادەبەدەرەکانی.

ئەمڕۆ ئێمە گەورەترین جۆرەکانی چارەسەری ماددی بەکاردەهێنین لەگەڵ سەیرترین داهێنانو دۆزینەوەدا، بەڵام ئەو بیرو باوەڕو عەقیدەیەمان ونکردووە کە کێو دێنێتە لەرزە. هەرچەندە عەقڵی هەستیارمان گەشە بکات ئەوەندەش عەقڵی نادیارمان (ناوەوە)مان گرژدەبێتو دەچێتەوەیەك. کاریگەرییەکانی ماددە بەکارماندێنێت بۆ خۆیو کاریگەرییەکانی نەستیش پشتگوێمان دەخات، یان بە واتایەکی تر: (کاریگەرێتییەکانی ماددەمان هەڵبژاردووەو کاریگەرێتییەکانی نەستمان پشتگوێخستووە). جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتە لەبەشی داهاتوودا.

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

١. بڕوانە: سلامة موسى، العقل الباطن.

٢. (بێ باوەڕ)و (باوەڕدار) ناگونجێن بۆ توێژنەوەی زانستی هەروەها بۆ بڕیاردانیش. دادوەری بێباوەڕ رقی لەکەسانی موتەدەینە لەرۆڵەکانی گەلەکەیو دڵڕەقە بەرامبەریانو هەوڵدەدات لەو بڕوایە دووریانخاتەوە کە بەنرخترین شتە لای ئەوان. ئەمەو لەکاتێکدا کە دادوەری ئیمانداریش دەبینین، لەلایەکی ترەوە، ئەویش دڵڕەقە بەرامبەر ئەوانەی کە لەسەر ئاینەکەی ئەو نینو رقیەتی لێیانو لەوانەشە لەریزی رسواو هەرچیو پەرچییەکاندا بیانـژمێرێت کە مافی ژیانیان نەبێت بە هیچ شێوەیەك. لەسەر ئەمە نموونەی زۆرمان بینیوە لەمێژووی گەلاندا کە لەژمارە نایەن بە هەموو جۆرە جیاوازەکانی رەنگو پەیڕەوکردنیانەوە.

٣. بڕوانە: Tvrrell, op cit, p.٤٨.

٤. بڕوانە: يعقوب صروف، رسائل الأرواح، ص١٠٩- ١١٠.

٥. بڕوانە: Rhine, New Frontiers of the Mind, p.١٤ .

٦. یاسای گریمانەکان پێویستە تێکڕایی راست لەپەیبردنی دانراو لەسەر رێکەوت بکاتە (٥لە٢٥) یان پێنج یەك، لەبەرئەوە ژمارەی وەرەقەکانی تاقیکردنەوکە بریتییە لە(٢٥ وەرەقە)و تەنها پێنج وێنەش لەسەریان کێشراوە و بەس.

٧.بڕوانە: Rhine, op, cit, p. ٢٠٦-٢٠٧.

٨. بڕوانە: Rhine, op, cit, p.٢١١.

٩. بڕوانە: Rhine, The Reach of the Mind.

١٠. بڕوانە: Tischner, Telepathy and Clair Voyance.

١١. بڕوانە: ئەم سەرچاوانەی خوارەوەو ئەوانی تریش:-

١. Sulliran, Limitations of Science. P.١٤٦-١٤٧.

 

٢. Ehrenwald, Telepathy.....chx ١١١.

٣. يعقوب صروف، أسرار الارواح، ص١٢.

٤. أبو الخير، ظوهر الطرح الروحي، ص٩٤.

١٢. دەردەکەوێت کە (سینڵ) یەکێ بووە لەوانەی باوەڕی هەبووە بە بوونی (ئەسیری). زۆربەی زانایانی ئەمڕۆ (هەروەك لەمەوپێش باسمانکرد) ئینکاری بوونی ئەسیر دەکەن. لەبەرئەوە ئەیدەنە پاڵ (ئەنیشتاین) و ئەو قسەیە پەسەند دەکەن کە دەڵێ پێویستمان بە سەپاندنی بوونی نیە. ئەوەش کە (سینڵ) ناوی لێنابوو بە (شەپۆلەکانی ئەسیری) ئێستا ناوەکەی گۆڕاوەو پێی دەوترێت: ((شەپۆلە کارۆموگناتیسیەکان)) (( Electromagnetic Waves)). بەڵام ئێمە لێرەدا حەزدەکەین ناوی بەرین بە (شەپۆلەکارەبایەکان) لەپێناوی کورتکردنەوەو ئاسانکاریدا. لەواقیعدا ئەو شەپۆلانە شمولی هەموو جۆرە تیشکە بینراوەکانو نەبینراوەکان دەکات هەروەها شمولی (شەپۆلە لاسلکییەکان) و زۆر شەپۆلی تریش ئەوانەی کە هێشتا نە دۆزراونەتەوە تاکو ئێستاش، هیوامان زۆرە کە بدۆزرێنەوە لەئایندەیەکی نزیك یان دووردا.

١٣.بڕوانە: سینل، الحاسة السادسة، (ترجمة محمد بدران واحمد محمد عبدالخالق بط).

١٤. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو – ص١١.

١٥. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو – ص٣٤.

١٦. ئێمە لێرەدا زاراوەی (پەیبردن) لەشوێنی (هەستی شەشەم) بەکاردێنین لەپێناوی کورتکردنەوەو ئاسانکاریدا، هەروەها ئەم زاراوەیە چەمکێکی فراوانترو بەربلاوتری هەیە لەچەمکی یان تێگەیشتنی (هەستی شەشەم)، چونکە زاراوەی ((پەیبردن)) (هەروەك راین ناوی لێناوە) دەچەسپێت بەسەر ئەو هەستکردنەدا بەبێ بوونی هەست.

١٧. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ص٦١-٦٢.

١٨. بڕوانە: Duncan, The New Know Ledge.

١٩. بڕوانە: فؤاد صروف، آفاق العلم الحديث، ص٢٣٢.

٢٠. بڕوانە: سینل، الحاسه السادسه، ص٢٢-٢٣.

٢١. بڕوانە: Jeans, Hundred Creat Lives, p.٥٣١.

٢٢. بڕوانە: سینل، الحاسە السادسە، ص١١٢.

٢٣. بڕوانە: Tyrrell, op. cit, ch٨.

٢٤. بڕوانە: Jeans, Mysterious Universe, p.١٤١-١٤٢.

٢٥. بڕوانە: Titus, Living Issues in Philosophy, p.٤٢.

٢٦. بڕوانە: Joad, Guide to Modern Thought, p.٨٧.

٢٧. بڕوانە: Titus, op. cit. p٤.

٢٨. بڕوانە: Joad, op. cit. p.٩٨.

٢٩. بڕوانە: Geans, op. cit. p.٤٩-١٤٨.

٣٠. پرۆفیسۆر (ئەلیکسندەر) دەڵێت: ((لێم بپرسیت سەبارەت بە گرنگترینی ئەو فیکرەیەی لەماوەی ئەم بیستو پێنج ساڵەی دواییدا سەری هەڵداوە چییە؟ لەوەڵامدا پێت دەڵێم: دۆزینەوەی کاتە)) بڕوانە:

Outline of Modern Belief, vol.٢, p٨٣٢.

٣١. کەواتە راسترە بە ((نەست)) ناوی بەرین. لەراستیدا ئێمە زاراوەی ((عەقڵی ناوەوە)) بەکارناهێنین لەم کتێبەدا، بەڵام تەنها لەبەرئەوەیە ئێستا لەزمانی عەرەبیدا لەسەر ئەم شێوەیە بەکاردەهێنرێت بەزۆری، لەبەرئەوە ئێمەش ناچارین ئەو زاراوەیە بەکاربێنین.

٣٢-بڕوانە: محمد مهدی النراقي ، جامع السعادات،ص:٥٢-٥٣

٣٣-بڕوانە ئەو وتارە بڵاو کراوەیەی کەلە (مختار المختار)دا هەیە بەناوی (هل انت حی) ص: ٧ – هەروەك چۆن لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان پێداوە .

٣٤-بڕوانە : سینل ، (الحاسة السادسة) ص:٥٢-٥٣ .

٣٥-بڕوانە : مجلةعلم النفس المصريه ، المجلد الاول ، الجزء الثالث ، ص:٣٣٣

٣٦-بڕوانە: : سینل ، (الحاسة السادسة) ص:٣٩-٤١.

٣٧-بەڕاستی تووشی سەر سوڕمان بووم بەهەمو مانایەکی سەر سوڕمان کاتێك ئەوەم خوێندەوە کە لەبارەی پێغەمبەر (محمد د.خ) وە گێڕاویەتیەوە و فەرمویەتی : خەونە ڕاستەکان بەشێکن لە "٤٦ چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی ". بۆیە لەوانە یە خوێنەریش لەگەڵ مندا سەری سوڕ بمێنێت کاتێك دەبینێت ئەو لێك نزیکییە سەرسوڕ

هێنـەرەی کـە لـەنێوان ئـەو دوو ڕێژەیـەدا هەیـە وا (کۆمەڵـەی توێژینـەوە دەروونیـەکان) بەدەستیان هێناوە و ئەو ڕێژە یەشی کە (محمد.د.خ) باسی کردووە !!...

٣٨-بڕوانە: هل انت حي ، ص: ٢٧–٢٨.

٣٩-بڕوانە: وليم سرجيوس ، القوى الخفية، ص:٧٩

٤٠- بڕوانە: ابن خلدون ، المقدمة ، ص: ١٠٥.

٤١- بڕوانە: ابن خلدون ، المقدمة ، ص: ١٠٥.

٤٢- بڕوانـە : وتارەکـەی :د. مـستەفا زێـوەر ،الطـب النفـسي الجـسمي،لـەگۆڤاری (علـم النفس المصرية ، المجلد الاول، الجزء الاول ، لاپەڕە: ١٣ و لاپەڕەکانی دواتریش).

بەشی پێنجەم

# مادده و دەروون

هەر لە دێرزەمانەوە (دیکارت) لە سەدەی هەڤدەیەمەوە کاریگەر بوو بە کێشەی فەلسەفەی گەورە کە ئەویش کێشەی "بیر و جەستە" بوو، یان بە دەربڕینێکیتر: کێشەی کارلێکردن لە نێوان توانای دەروونی و توانای ماددی.

گومانی تیا نیە کە (بیر) کار دەکاتە سەر جەستە (بەددن)، وە جەستەش کار دەکاتە سەر بیر(فکر). مرۆڤ فێڵ ناکات کاتێك شەرم دەکات لە شتێك و هەر دوو ڕومەتەکانی سوور دەبێتەوە، بەهۆی ڕووداوێکەوە بێهیوا نابێت تائەو ڕادەی کە بۆی نەخۆش کەوێت و بێهێزیی و لاوازی ڕووی تێبکات. ئەگەر کەسێك بخەوێنرێت بە خەواندنی موگناتیسی (هیپنۆتیزم) و پاشان وە ئاگای بێنیت لە کاتی خەواندنەکە دا ئەو کاتە وا هەست دەکات کە پشکۆیەکی سوورەوەبووت ناوەتە مشتیەوە و شوێنەواری سووتاویەکی لێ دەردەکەوێت و بلووقەکان دەردەکەون لە سەر پێستی دەستی و وادەزانێت کە ئاگرێکی ڕاستەقینەی لەمست نراوە.

هەروەها ماددەش کار دەکاتە سەر فیکر وەك چۆن فیکر کار دەکاتە سەر مادده، مرۆڤ کاتێك مەی یان خواردنەوە کحولیەکان دەخواتەوە هەست بەوە دەکات کە فیکری گۆڕانی بە سەر داهاتووە بە پێی جۆری ئەو مادده سەرخۆشکەرەی کە خواردویەتیەوە.

وە لەسەر ئەم دیاردەیە زۆربەی ڕووداوەکان دەپێوین گەر سەرنج بدەینە دەروونی خۆمان و کەسانیتریش لە ژیانی ڕۆژانەماندا.

(جود) کە سەرۆکی بەشی فەلسەفە و دەروونزانیە لە زانکۆی لەندەن، لەم بارەیەوە دەڵێت: "جەستە پارچەیەکە لە مادده، وە تایبەتمەندیەکانی ماددەی تێدایە لە کێش و بارستایی و شێوە و قەوارە و ئەوانیترداد، مل کەچ دەبێ بۆ یاسا فیزیاییەکان. بەڵام فیکر جیا لەمە وێنای دەکەین، ئێمە لە بارەی فیکرەوە دەڵێین مادده نیە: ئەمەش بەو مانایە نایەت کە ئیتر لەبەر ئەوەی کێش و بارستایی و قەوارەی نیە و شوێنێك داگیر ناکات مل کەچ نابێت بۆ یاسا فیزیاییەکان. ئەگەر هاتوو فیکر و مادده جیاواز بن لە یەك بەو جیاوازیەی کە هیچ شێوەیەکی هاوبەش لە نێوانیاندا نەبێت، کەواتە ئەی بۆچی یەکێکیان کار دەکاتە سەر ئەویتریان و بە پێچەوانەشەوە ئەویان کار دەکاتە سەر ئەمیتریان؟ وە دیسان چۆن ئەو کارلێکردنانە ڕوو دەدات لە نێوانیاندا ڕاستەوخۆ؟ لەوانەیە بەردێك ماف مێروویەکی هەبێت، ئەمەش لە بەر ئەوەی کە ئەو مێرووە هەروەك بەردێك بارستایی و ماددەیە؟

بەڵام چۆن دەگونجێت کە بەردێك کار بکاتە سەر حەز یان ئارەزوو؟ درێژی باڵێك دەتوانرێ بپێورێت، بەڵام چۆن دەتوانرێت ئەو ئیلهامە بپێورێت کە بتهۆڤن بە هۆیەوە توانی سەمفۆنیای پێنجەم بەرهەم بهێنێت؟

"زیادەڕەوی نیە گەر بڵێین ئەمە کێشەی بنەڕەتیە لەو کێشانەی کە پێویستە لە سەر هەموو قوتابخانەکانی دەرونناسی کە هەوڵی نەهێشتنی بدەن، ئەمە و بۆ زانین کە هیچ قوتابخانەیەکی دەروونی نیە بتوانێت حەلی کات و نەیهێڵێت بە حەلکردنێکی سەرکەوتووانە"(١)

ئەم کێشەیەی کە پرۆفیسۆر (جود) لە بارەیەوە دەدوێت زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت لە بوارەکانی: خەواندنی موگناتیسی و تەصەووف و ئیحا و بیر و باوەڕ و ئەوانەی کە وەك ئەم شتانە وان.

لەو شتە سەیرانەی کە بینیومە لەم تایبەتمەندێتیەدا ئەو ڕووداوەیە کە پێش دە ساڵ لەمەوبەر ڕوویدا و تا ئێستاش بیری لێدەکەمەوە سەرم سوڕ دەمێنێ و بەلامەوە سەیرە. ڕووداوەکەش ئەمەیە زانکۆی بەیروتی ئەمریکی ئاهەنگێکی گەورەی ساز دا و تیایدا خەو لێخەرێکی موگناتیسی ناودار ئامادە بوو. لە هەموو کارەکانی کە ئەم خەولێخەرە پێی هەڵدەسا ئەوە بوو کە چەند تۆپێکی مەعدەنی ساردی هەڵدەدا بۆ ئامادەبووانی ناو

هۆڵەکەو پاشان ئیحای خۆی دەخستە سەر هەر یەکەیان و بە دەنگێکی بەرز هاواری لێدەکرد: "کورە نەکەی گەرمە .. کورە نەکەی گەرمە". کاتێ تۆپەکانیان دەگرتەوە گەرم بوو لە دەستیاندا بە فیعلی بۆیە زۆربەیان فرێیاندا بۆ سەر زەوی لە تاو گەرمیەکەی و فوویان دەکرد لە دەستی خۆیان بە هۆی ئەو ئازارە زۆرەوەی کە بە دەستیان دەگەیشت، تەنها یەکێکیان مایەوە و دانی گرت بە خۆیا و تۆپەی هێشتەوە لە دەستیا. ئەمەش هەر لە بەر ئەوەی کە خۆی بە ئازا پیشان بدات بەرامبەر بەو کچانەی کە لەوێ ئامادە بوون، درێژەی پێدا و لەم دەست بۆو دەست تۆپەکەی دەگوێزایەوە بۆ ئەوەی ئازارەکەی کەم بێتەوە، وە ئیتر بۆ دواجار تۆپەکەی فرێ دا و لە سەر رووی لەپی دەستی نیشانەکانی سووتانی پێوە دیار بوو.

بەڵام لە ڕاستیدا تۆپەکە گەرم نەبوو، بەڵکو ئەوەی کە پێستی دەستیانی گەرم دەکرد و لە ئەنجامی ئەو ئیحایەوە بوو کە تێیان دەگیرا... وە ئەمەش سەرسوڕمانی ناوێ چونکە مرۆڤ زۆر بیر بکاتەوە لە نەخۆشی ئەوا نەخۆش دەکەوێت، وە بە خەیاڵی خۆی ئازار بخاتە هەر شوێنێکی لاشەیەوە ئەوا یەکسەر هەست بە ئازار دەکات لەو شوێنەدا.

لە زسانی ساڵێك لە ساڵەکان لە باخچەی (هایدبارك) کە لەلەندەنە وا دەردەکەوێت کە هەژارێکی رووت و قووتی هیندی هیچ هەست ناکات بە سەرما و سۆڵ و کرێوەی ئەو زستانە سەختە، بە چەند کارێکی سەرسوڕهێنەر هەڵدەستێت، لەوانە قووت دان و خواردنی پارچەشووشەی شکاو و بزماری ووردی نوك تیژ و شتیتریش جگە لەمانە. هەروەها زۆر بە دڵخۆشیەوە ترشی نتریکی دەخواردەوە، بەپێ‌ی پەتی دەڕۆیشت بەسەر ئاگر دا. بۆ ماوەی چەند سەعاتێك دەیانکرد بە ژێر خۆڵەوە پاشان دەریان دەهێنایەوە هەر زیندوو بوو وەك ئەوەی کە هیچ ڕووی نەدابێت و نەبای دیبێ و نە بۆران.

لە بەریتانیای پێش چەند ساڵێك لەمەوپێش کۆمەڵەی توێژەرەوانی دەروونناسی توێژینەوەیەکی لە شێوەی ئەم حاڵەتەیان ئەنجامدا، ئەویش ئەوە بوو کە هەژارێکی هیندی ئەڕۆیشت بەسەر ڕاخەرێکدا کەهەمووی پشکۆی ئاگر بوو بە پلەی گەرمی زیاتر لە هەزار (بەپێوەری فەهرەنایت) و بۆ جاری دووهەمیش هەمان ڕۆشتنی بەسەریا دووبارە دەکردەوە بۆ دڵنیایی زیاتر. وە ئەم تاقیکردنەوەیە تۆمار کراوە لە تۆمارەکانی ئەو کۆمەڵەیە دا لە بریتانیا.[٢]

 

وە لە عێراقیشدا هەندێ لە متەصەوفەكان هەڵدەسن بە چەند كارێكی لە یەك چووی وەك ئەو حاڵەتانەی كە هەژارە هیندیەكان پێی هەڵدەسن. لەو جۆرە كارانەی كە متەصەوفەكان یان "دەروێشەكان" دەیكەن وەك: لەخۆیان ئەدەن بە ئامێر و شتی مەترسیدار، خەنجەر و شمشێر و چەقۆ و شتی لەو بابەتانە ئەچەقێنن بە ووركی خۆیاندا و یان ئاگر ئەخۆن ...

جارێكیان خۆم و كۆمەڵێك لە قوتابیانی كۆلێجی ئاداب و كۆلێجی زانست سەفەرێكمان كرد بۆ تكریت، هەر بە ڕاستی و واقیعی لەوێ ئەم كاریگەریانەمان بینی بە چاوی خۆمان و بوو بە مایەی حەپەسانمان. وە هەوڵم ئەدا كە ئەم كاریگەریانە خۆم بە ڕاستی بیانبینم بە چاوی خۆم چونكە هەمیشە شتم دەبیست لە بارەیانەوە، وە بینیم كە دوورە لە فڕ و فێڵ و جادووگەرییەوە، بە لاشمەوە گرنگ نیە كە خوێنەر بڕوام پێدەكات یان نا لەسەر ڕاستی ئەم شتانە، من خۆم باوەڕم پێیەتی بە ڕاستیی ئەو شتانەی كە دیومن و ئەوەش بەسە بۆ قەناعەت پێكردنم.

ئەم هەموو كاریگەریانە دەچنە بابەتی كارلێكردنی فیكر لە جەستە و ئەوەش لە ڕاستیدا بەرهەم هاتووە لە زاڵبوونی بیر و باوەڕێكی دیاریكراو بەسەر جەستەی مرۆڤدا.

كابرای هەژاری هیندی كاتێك دەڕوات بە سەر ئاگر دا لەو بڕوایە دایە كە ئاگر ئازاری پێ ناگەیەنێت. ئەم بیر و باوەڕە لە بیر و مێشكیدا چەسپیوە بە چەسپاندنێكی تەواو و بەچەشنێك بووەتە نیمچە دابڕاوێكی ئاوابوو لە دەوروبەرەكەی خۆی و تەنها و تەنها گومانێكی زۆر كەمی هەیە لەوەی كە ئەو جۆرە كارانە بیبات بەرەو تیا چوونێكی یەكجاری.

ڕووپامایی نیە ئەگەر بڵێین ئەم بیر و باوەڕە چەسپیوە كە خاڵیە لە هەموو گومانێك هەروا ئاسان نیە بتوانرێت لە لایەن هەر كەسێكەوە كە بیەوێ بە دەستی بێنێت چونكە ئەوە بیر و باوەڕێكی قوڵە و ڕەگی زۆر بە هێزی داكووتیوە لە ڕۆچوونەكانی نەستدا(بێئاگایی). تەنها بەوەش مرۆڤ دەستی ناكەوێت كە خۆزگەی بۆ بخوازێت و خۆی پێوە هەڵكێشێت و یان بەمەبەست و هیوا بێت كە بیكات.

لە ڕاستیدا بیر و باوەڕ بە دەست مرۆڤ نیە، وە ناتوانێت بە دەستی بێنێت یان وازی لێ بێنێت وەك ئەوەی كە خۆی ئەیەوێت، بەڵكو قەناعەتێكی نەستیە(ناهەستیە) كە لە

ئەنجامی ئەو باوەڕە بە هێز و توانایییە دوور و درێژە و نقوم بوون و ڕۆچوونەی كە هەرگیز گومان ناتوانێت زەفەری پێ بەرێت، ئەو بیر و باوەڕەی كە لە عەقڵی (دیار) دایە خێرا ناڕوات بۆ عەقڵی نادیار(شاراوە) بگرە دەبێتە هۆی زیان گەیاندنیش لەم ڕووەوە ئەگەر وابێت،وە لەوانەشە هۆكارێك بێت بەپێچەوانەی ئەو ئەنجامەی كە مەبەست هەیە لە بەدەست هێنانی. خاوەنی ئەم بیر و باوەڕە ڕووالەتیە ناتوانێت پێی لە سەر هەست بەتری و پەنا بۆ بردنی بكات. ئەو بە دەروونی خۆی دەڵێ: بڕۆ پێشەوە و مەترسە بەلام عەقڵی شاراوەی لە قوڵایی دەروونیدا بە ئەسپایی چپە دەكات بە چپەكرنێكی ترسناك و نزیك بوونەوە لە ئەجەل (تیاچوون).

یەكێ لە ئەحمەق و بێئابڕووەكان متەصەوفێك دەبینێت كە شمشێر دەكات بەسكی خۆیدا و ئەمیش دەیەوێت لاسایی بكاتەوە و سەرنجی ئامادەبووان بۆ لای خۆی رابكێشێ، وە لە نێوان ئامادەبووان دا هەندێكیان رەگەزی مێ بوون ـ بە داخەوە. ئەو هێشتا نەیدەتوانی كە شمشێرەكە بگرێت بە دەستەوە مەترسی مردنی لێ بەدی دەكرا، لەو كاتەدا پێویست بوو لەسەری كە پاشەكشێ بكات لە قرچ و هوڕی دەنگی شمشێر بەلام ئەمەی نەكرد دەترسا لەوەی تووشی لۆمە و سەرزەنشت بێت...

بۆیە ڕووداوەكەش كۆتایی هات و ئەوی تیا مرد بێ ئەوەی كەس داخی بۆ بخوات.

زانایان وای شیدەكەنەوە كە كاریگەریەكانی متەصەوف و هیندیەكان جۆرێك بێت لە خەواندنی خۆیی (Autonhypnotism). چونكە متەصەوف خۆی دەخەوێنێت پێش ئەوەی هەڵسێ بەو كاریگەریانە. بەلام هیندیەكان جیاوازن لەو ڕێگایەی كە بەكاری دەهێنن بۆ خەواندنی خۆیان بە "خەواندن".

هیندیەكان خۆیان ڕادەهێنن بە وەرزشە دەروونیە ئالۆز و دوور و درێژەكان هەتا ئەو كاتەی بۆ دواجار دەگەنە قۆناغی توانایی تەواو لە سەر ئەوەی كە هەستن بە كاریگەریەكان. وە لە كاتی گەیشتنیان بەو قۆناغە كۆتاییە وایان لێدێت كە ئیتر وادەزانن لەم دنیایەدا چوونەتە دەرەوە و لە دنیایەكی تری تایبەت بە خۆیاندا دەژین. كاریگەریەكانیش ئەو كاتە لایان دەبێتە كارە ئاساییەكان و دەتوانن لە هەر شوێن و كاتێك دا كەبیانەوێت پێی هەستن و ئەنجامی بدەن.

 

بەڵام متەصەوفەکانی عێراق پەنا دەبەن بۆ ووتنی چەند سرووت و گۆرانی و سۆزێکی ئایینی ئەمە سەرباری ئەوەی کە لەگەڵیدا دەف لێدەدەن و جۆرە سەما و سوڕانەوەیەك دەکەن بە دەوری خۆیاندا، وە لەو کاتەدا کە دەگەنە حاڵەتی دابڕان و بێئاگایی لە دەوروبەر کە زۆر جار بەم حاڵەتە دەووترێت "مەدەد"، بەڵام نەك "مەدەد" لە واقیع بەڵکو تەنها خەواندنێکی خۆییە و هیچیتر.

خەواندنی موگناتیسی (هیپنۆتیزم) وەك لە پێشەوە باسمان کرد، دەبێتە هۆی وەلانانی توانای عەقڵی دیار و هاتنە مەیدانی عەقڵی نادیار(شاراوە) بە تەنها. وە لەمەشدا جیاوازی نیە لەوەی کە خەواندنەکە خۆیی بێت یان (ناخۆیی) واتە لە لایەن کەسێکیترەوە خەوێنرابێت.

کاریگەریەکانی متەصەوف دووبارە کاریگەریەکانی نەستیە (ناهەستیە). هەرچەندێك ئاگایی و زرنگی متەصەوف کەم بێتەوە لە کاتی جێبەجێکردنی کاریگەریەکاندا ئەوا ئەوەندەش مەترسی لەسەر کەم دەبێتەوە. ئەم راستییەمان زۆر بە جوانی بۆ روون بوویەوە کە لە کاتی ئامادەبوونمان لە ئاهەنگی سۆفیەکاندا کە لە تکریت کرا.

کاتێك کە متەصەوف دەیەوێت لە خۆی بدات لە بەر هۆیەکە لە هۆیەکان، لە حاڵەتی دەروونیدا ڕێی پێ نادرێت کە لە خۆی بدات، کە لەم حاڵەتەشدا پێی دەوترێت نەچۆتە ناو "مەدەد"ەوە بە چوونێکی تەواوەتی. بۆیە کاتێك ئەو متەصەوفە خەنجەرەکە دەکات بە سکی خۆیدا تا ئاستی نقووم بوون ئەوا خوێنێکی زۆری لێدێت[٣] و پاشان دەردەکەوێت کە ئەمە فێڵی لێکراوە (خەڵەتێنراوە)، بۆیە مقۆ مقۆ و چپە چپ بڵاو دەبێتەوە لە نێوان ئامادەبواندا و دەڵێن مرد، لە ئاکامی ئەمەشدا هەندێکیان دەم و چاوی خۆیان دەڕنن و لە خۆیان دەدەن.

هەر چەندە لە کۆتاییدا نەمردووە، بەڵام نزیك بۆتەوە لە مردن، ئەوەش لە بەر ئەوەی کە نەچووەتە ناو "مەدەد"ەوە بە چوونێکی تەواوەتی و وایلێکردوە کە هێشتا هەندێ بە ئاگا بێت. وە لەوانەیە شتێك (کەمێك) گومان دزەی کردبێت بۆ دەروونی لەو کاتەدا و بوو بێتە هۆی ئازاردانی.[٤]

کەسانی متەصەوف لەو بڕوایە دان کە ئەم کاریگەریانەی پێی هەڵدەسن لە ڕاستی و دروستی بیر و باوەڕەکەیانەوەیە، وە لە واقیعدا لە هێزی بیر و باوەڕەکەیانەوە هاتووە ـ

نەك لە ڕاستیەکەیدا. هێزی بیر و باوەڕ و قووڵ بوونەوە تێیدا و خێرایی ڕۆچوونیدا لە کاتی نەستدا ئەوەیە کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی کاریگەریەکان. بەڵام ڕاستی بیر وباوەڕ دەوری نیە لەم حاڵەتەدا.

هەر مرۆڤێك بە هێز بێت لە بیر و باوەڕەکەیدا دەتوانێت بگات بە هەمان ئامانج کە ئەوان پێی دەگەن ـ با لەمەشدا شوێنکەوتووانی ڕەفاعی بن یان سەر بە ئاغاخان و عەباسەفەندی بن.

نەست (ناهەست) جیاوازی لە نێوان هەق و ناهەق یان ڕاست و هەڵە دا ناکات ئەمە لە ئیشەکانی عەقڵی دیارە کە دەیان ناسێتەوە. عەقڵی شاراوەش (نادیار) وەك لەمەوپێش ووتمان، عەقڵی دڵنیایی و بیر و باوەڕە، لە کاتێکدا عەقڵی دیار عەقڵی گومان و لێکۆڵینەوە و فەلسەفەلێدانە.

وە کاریگەریەکانی نەستیش دووبارە بەڵگەی ڕاستێتی بیر و باوەڕ نین بە قەدەر ئەوەی بەڵگەن لە سەر کاریگەری هێزەکەی لە دەروون.

محمد "پێغەمبەر" دەفەرموێت: "ئەوەی باوەڕی بە بەردێك هێنابێت بەسیەتی" وە ڕاستی فەرمووە بە هەموو مانایەکی ڕاستی لەم فەرموودەیە دا. جێگای سەرسوڕمانە بە لامەوە کە متەصەوفەکان هەستیان کردووە بەم ڕاستییە. ئەوان هەموو ئایینەکانیان خۆش دەوێت و جیاوازی ناکەن لە نێوانیاندا، بەڵکو وای دادەنێن کە چەند ڕێگایەکی جیاوازن بۆ گەیشتن بە یەك ئامانج.

چونکە ئایینەکان داوا لە مرۆڤ دەکەن کە بیر و باوەڕی بەهێز بێت و لەو بڕوایەشدابێت کە دەتوانێ وابێت. شێخ محیدینی عەرەبی متەصەوفێکی بەناوبانگ بوو. ئاواتی دەخواست کە نوێژ بکات بۆ خوای خۆی لەهەموو پەرستگایەکدا، جیاوازی نەدەکرد لە نێوان مزگەوت و کەنیسە یان لە نێوان ئاتەشگا و پەرستگای وەسەنیەکاندا. بۆیە لەم بارەیەوە دەڵێت: "دڵت خاوێن کەرەوە و نوێژەکەت بکە لە هەر شوێنێکدا کە دەتەوێت".

زۆربەی زانایانی ئەمڕۆ مەیلیان بۆ شێوەی ئەم ڕا و بۆچوونە دەچێت. هەر چەندە هەندێکیان لەمەدا ڕیزپەڕن و دەڵێن گەورەیی خواوەند خۆی کامەیە ئەگەر بیر و باوەڕ نەبێت. چونکە بە بۆچوونی ئەمانە خواوەندی تۆ ئەوەیە کەبیر و باوەڕت پێیەتی، وە

هەرچەند بیر و باوەڕت پێی بە هێز بێت ئەوەندەش بەتوانایە لە سەر سوود پێگەیاندنت و دوور خستنەوەی زیان لێت.

(ئۆلیڤەر لۆدج)ی زانای سرووشت ناسی ناسراو وای دەبینێت کە نوێژ و پاڕانەوە و خواپەرەستی سوودێکی گەورەی تیایە. ئەم زانایە بەدرۆی دەخاتەوە بیر و بۆچوونی ئەوانەی کە ملە جەڕێ دەکەن و وایدەبینن کە پاڕانەوە وورتەوورتێکی خاڵی و بەتاڵە و توانای نیە بە سەر ئاڵ و گۆڕییەکانی ئەو شتانەی لە بوونەوەر دا ڕوو دەدەن لە یاسا سرووشتیەکاندا، بۆیە پێیان دەڵێت: "ئەوانە لە دەروونی خۆیاندا بەو جۆرە وێنای دەکەن کە گوایە: بەشێکی دابڕاو هەیە لە کەون و دەرەوەیدا کە ئیش دەکات لە شتە دیارەکانی و هەوڵی گۆڕینی دیاردەکانی کەون دەدات لە نزا و پاڕانەوە بۆ یاسایەك لە هێزی بەڕێوەبردن"...

گەر بێت و بمانەوێت لە دەروونی خۆمان تێبگەین ئەو کاتە دەزانین کە ئێمە بەشێکی پوختین لەو یاسایە بە گشتی، وە ئارەزوو و داواکاریەکانمان خەڵاتێکە لەو ویست و توانا زاڵە ڕێپیشاندەرەی کە ڕێگری ناکات لە((ئاتەشگا: شوێنی خواپەرەستی ئاینی زەردەشتیانە. کەلێرەدا د.علی وردی بە (بیت نار ـ ماڵی ئاگر) ناوی دەبات. (وەرگێڕی کوردی) ))جوڵانەوەکانی مێشکماندا بۆ ئەوەی کاریگەریەکی چوست و کارای هەبێت گەر هات و دۆزیمانەوە ئاسۆگەی ڕاستیەکانی ئەو یاسایانەی وا لە بوونەوەر (کەون) دایە و ئەوەشی کە باڵادەست و لە سەرووی ئەو بوونەوەرەوەیە.

(لۆدج) لە سەر ئەمە نموونەی پەندێکمان بۆ دێنێتەوە: دەوڵەتێکی دادپەروەر کە چەواشەکاریەکانی تاکەکانی تێدا بەشێکە لە یاسا و بەڕێوەبردن ئەگەر ئەو دەوڵەتە ڕێگای ڕاستی گرتبێتە بەر بۆ دەربڕینی بێخەوش و گونجان لە نێوان خۆی و هەروەها لە نێوان بنەماکانی یاساکەدا.(٥)

گەر سەرنج بدەین پیاوانی ئایین لە ناوماندا ڕەزامەندی دەرنابڕن لە سەر ئەم بیر و بۆچوونە، ئەوان وای بۆ دەچن کە خوا پادشایەکە و دانیشتووە لە سەر عەرش و فریشتەکانیش بە چوار دەوریدان و ئەو فەرمانی کردن و نەکردنیان دەدا بەسەردا. ئەوانە ئەم وێناکردنەیان لە ژیانی سیاسی خۆیاندا چەسپاندووە. کاتێك کە بۆ خوا دەڕوانن وەکو بۆ فەرمانڕەوایەکی سیاسی بڕوانن وایە، بۆیە هەمیشە هەوڵ ئەدەن کە بەشان و باڵیا

هەڵدەن و خۆیانی لێ نزیك بکەنەوە و دیاری پێشکەش بکەن. لە بەر ئەم هۆیانە دەیانبینین کە زۆر گرنگی دەدەن بە دروشم و سرووتە ئایینیەکان وەك لەوەی کە گرنگی بدەن بە خاوێن کردنەوەی دڵ و ساغ و سەلامەتی کار و کردەوە و نیەت پاکیان.

★ ★ ★

لەبەشی پێشوو دا باسمان کرد کە دەروونی مرۆڤایەتی کاری تێدەکرێت لە لایەن مادده دەرەکیەکانی دەوروبەریەوە بە کارتێکردنێکی نەستیانە(ناهەستیەوە). وە لەم بەشەشدا ئەوەمان زانی کە چۆن دەروون کار دەکاتە سەر ماددەی جەستەکەی خۆی و کاریگەری هەیە لە سەری دووبارە. پاش ئەمە ئەوەی ماوەتەوە بیزانین ئەوەیە: ئایا دەروون لە توانایدایە کار بکاتە سەر ماددەی دەرەکی وەك چۆن ئەو کاری تێدەکات؟

هەر لە دێرزەمانەوە ئەم پرسیارە بیر و مێشکی رووناکبیرانی خەریك کردووە. زۆرمان گوێ لێ دەبێت لەو هەواڵە سەیر و سەمەرانە کە لە بارەی توانا و هێزی هەندێ لە پێغەمبەران و پیاوچاکان و جادووگەرانەوە بۆمان دەگێرنەوە سەبارەت بە جوڵاندنی مادده لە دوورەوە یان کارتێکردنی جا ئیتر کەم بێت یا زۆر.

رووناکبیران مانەوە بە سەرسامی لە بەردەم ئەم هەواڵە یەك لە دوای یەکانە دا و نەیاندەتوانی نە بەدرۆ و نەبە ڕاست پەسەندیان بکەن. زۆربەی زانایان بەلای ئەوە دا نەچوون کە بە درۆ و دەلەسەیان دابنێن و تا ئەم دواییانەش گاڵتەیان پێدەهات.

رۆژهەڵات زۆر شت لە بارەی جادووگەریەوە دەزانن، بەڵام لە رۆژئاوا تەنها کەمێك نەبێت لە بارەیەوە هیچ نازانن. لەم دواییانەدا لە رۆژئاوا کەسانی جادووباز دەرکەوتوون و زۆر کاریگەریان هەیە لەسەر خەڵك بە کارە سەرسوڕهێنەرەکانیان. وە بەناوبانگترین کەسانیش ئەم سیانەن: (هۆم)ی سکۆتلەندی و (پلادینۆ)ی ئیتاڵی و (هۆدینی) ئەمەریکی. وە گرنگی هاتنی ئەمانەش لەوەدایە کە بەئیشە سەرسوڕهێنەرەکانیان کاریگەریەکی وایان هەیە کۆ دەبنەوە و مێزگردی ڕاگۆڕینەوە و لێکۆڵینەوەیان لە گەڵدا ساز دەدەن.

(پلادینۆ) کچێکی ئیتاڵی سادە و دڵپاکە و هەندێ جار دەچێتە حاڵەتی بێئاگایی وەهاوە کە بەو کارە سەرسوڕهێنەرانە هەڵدەستێت عەقڵ لە توانایدا نیە بەڕاستیان دابنێت و بڕوای پێ بکات. ئەو کچە وادەکات لە هەندێ کەل و پەل کە بکەونە جوڵە لە

 

خۆیانەوە، هەروەها هەندێ ئامێری مۆسیقا دەخاتە ژەنین بە بێئەوەی دەستی کەسیان بەر کەوتبێت، وا دەکات لە دەسرێ یەکێك لە ئامادەبووان کە لە باخەڵیا بێتە دەرەوە و بەرز بێتەوە بۆ لای لووتی وەك ئەوەی بیەوێ یارمەتی ئەو کەسە بدات کە لووتی بەو دەسرە خاوێن کاتەوە... ئەمانە و جگە لە چەندەها شتیتریش لە شتە سەرسوڕهێنەرەکان.

لێژنەیەك پێکهات لە مامۆستایانی زانکۆی (تورین) و پشکنینیان بۆ ئەنجامدا پشکنینێکی زۆر وورد و پاشان ڕاپۆرتێکیان لە بارەیەوە پێشکەش کرد کە هەموویان کۆك بوون لە سەر ڕاستی ئەو شتانەی دیویانە لەو کچە و بە نیشە کاریگەرەکانیان لە قەڵەمدا.[٦]

هەروەها نهێنیزان (ئۆلیفەر لۆدج) سەردانی کرد و ئەمەی لە بارەیەوە نووسی: "ئێستا من بیر دەکەمەوە لە بڵاوکردنەوەی ئەوشتانەی کە دیومە لە ئیشەکانی پلادینۆ دا چونکە ئەم ئیشانە پاشان روون دەبنەوە و دێنە دی لە سەر شێوازی جیاواز، من خۆم لەو باوەڕە دام کە لە هەندێ خەڵکدا شتی وا دەردەکەوێت لە دیاردە سروشتیە کاریگەرەکانی سەرووی ئاساییەوە بێت و من توانام ناشکێ بە سەر شیکردنەوەیاندا یان هێزێکی وایان هەیە کە تائێستاش زانست نەیتوانیوە پەی پێ بەرێت..."[٧]

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە لەم حاڵەتە دا ئەوەیە کە (پلادینۆ) پاش ئەوەی کە سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا لە ئەوروپا، رۆشت بۆ بەریتانیا و لەوێ مامۆستایانی زانکۆی (کەمبۆرگ) پشکنینیان بۆ کرد چەسپی بەسەریا ئەو شتانەی کە کردوویەتی داپۆشراوون بە فرۆفێڵ لەوەدا کە ئەو دەستی بەکار هێناوە بۆ جوڵاندنی (بزووتنی) ئەو کەل و پەل و ئامێرانە.[٨]

لە ساڵی ١٩٠٨ی زایینیدا کۆمەڵەی توێژەرەوانی دەروونی بەریتانی لێژنەیەکی سێ قوڵیان پێك هێنا کە پێکهاتبوو لە شارەزایانی ناسراو لە بواری دەرخستنی چاوبەست و هەڵخەڵەتاندنەکان و جادووگەری و لێژنەکەیان ڕەوانە کرد بۆ (ناپۆلی) لە ئیتالیا بۆ پشکنینی (پلادینۆ).[٩] لە پاش پشکنینی (پلادینۆ) ئەو شارەزایانە بڕیاریاندا: کە (پلادینۆ) لە کاتی بێئاگاییکردنەکەی دا (لە کاتی دابڕانیدا) هەر دوو دەستی بە تەواوی دەکاتەوە بە مەبەست بێت یان بێمەبەست، ئەمەو لە گەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەوە بزانین کە مەبەستێکی گەورەی هەیە لە نیشەکانیدا کە بێگومان کاریگەریە لە ڕادەبەدەرەکانە،

مستەر (فیلدنج) ڕاپۆرتێکی لە بارەوە نووسیوە کە تیایدا دەڵێ: "من زۆر سوپاسی (پلادینۆ) دەکەم چونکە دوو شتی فێر کردم یەکەمیان ئەوەیە: هەموو ئیشێك فڕ و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن نیە، دووەمیان: هەموو فڕ و فێڵ و تەڵەکەیەکیش بە مەبەست ناکرێت".[10]

بەڵام (هۆم)ی سکۆتلەندی جیهانی شارستانی بە خۆیەوە سەرسام کردووە بە هۆی کارە سیحریە سەرسوڕهێنەرەکانیەوە بەوەی کە شتەکان بەرز دەکاتەوە بە بێ ئەوەی کە دەست بەریان بکەوێت، وە فڕینی ئەو شتانە لە پەنجەرەیەکەوە بۆ یەکێکیتر لە کۆشك و تەلارە بەرزەکاندا، هەروەها دەم و چاوی نقووم دەکات لە ناو پشکۆی ئاگر دا، وە هەندێ ئامێری مۆسیقا بە ئاوازی دیاریکراو لێ دەدات هەر لە لایەن ئامێرەکان خۆیانەوە...

زانکۆی (هارفۆرد) وەفدێکی چوار کەسی لە پرۆفسیۆری زانکۆ نارد بۆ تاقیکردنەوەی چالاکیە سەرسوڕهێنەرەکانی. پاش تەواو بوونی پشکنینەکانیان بۆی، هەموویان بەڵگەنامەیەکیان بۆ ئیمزا کرد و شایەتی ئەوەیان بۆ دا لە نێوان ئەو ڕووداوانەی کە بینیویانە ئەوەیە: یەکێکیان دادەنیشت لە سەر مێزێکی نان خواردن کە زۆر بە توونەدی دەلەرێتەوە تابۆ دواجار هەر لەسەر ئەم بارە دەمێنێتەوە بە بەردەوامی لە سەر دوو قاچی مێزەکە و لەسەر ئەم حاڵەتە بەردەوام دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی دوان لە مامۆستاکانی برادەری یەکدەگرن و ئەوانیش دێن بۆ لای هاوڕێکەیان و لە گەڵ ئەمدا دادەنیشن لەسەری. مامۆستاکان بڕیار دەدەن: ساحیرەکە چەند جارێك داوای لێکردوون کە هەر دوو دەست و هەر دوو قاچی بە توونەدی ببەستنەوە و هەوڵ و تواناکانیان دەخەنە کار بۆ ئەوەی بتوانن پشکنینی زۆر وورد بکەن لەسەری، تا دوا جار بۆیان دەسەلمێنرێت کە ئەو ساحیرە ئەمانی بۆ خۆی داگیر نەکردووە و هەروەها فڕ و فێڵ و چاوبەستیشی لێ نەکردوون.[11]

(ولیەم کرۆکس) چالاکیەکانی ئەم ساحیرەی بینیوە، دەیخاتە ژێر پشکنینی ووردەوە لە تاقیگە فیزیاییەکەیدا. (کرۆکس) ڕاپۆرتێك دەنووسێت بۆ گۆڤاری زانستی ( Quarterly Journal of Science) کە تیایدا دەڵێت: "هەر چیم بینیوە لێی کە کردوویەتی لە ڕووناکیدا و ناتوانم دوایخەم لە شایەتی دانمدا بۆی کە ئەو دیاردانەی بینیومن تەواو پێچەوانەی بنەماکانی زانستی بڕیار لێدراوە، وەك یاسای ڕاکێشان، لە کاریگەریە هەمیشە

ڕەهاکەیدا. من خۆم لە سەرمدا ناکۆکییەك دروست بووە لە نێوان ئەوەی کە عەقڵم بڕیار بدات کە ئەم دیاردانە زۆر ئەستەمە ڕوودانیان لە ڕووانگەیەکی زانستیەوە، لەنێوان ئەوەی کە هەستم پێکردووە ئەو شتانەی بینیومە بە چاوی خۆم و دەستم لێداوە هەروا درۆیەکی بەتاڵ نیە".

کەچی لەبەریتانیا خەڵکی گاڵتەیان دەکرد بە (هۆم) و لە گەڵ ئەمەشدا چالاکیەکانیان وا لێك دەدایەوە کە لە لایەن جادووی چاوەوە دەکرێت کە ئەمڕۆ ناو دەبرێت بە خولیا و خەواندنی موگناتیسی. جێگای سەرسوڕمانە ئەوانەی ئەمڕۆ لە ئەوەی نوێ وا سەرقاڵی سیحر و جادوون دەڵێن: توانامان هەیە لە سەر ڕاڤەکردنی کاریگەریەکانی (هۆم)، وای دەبیننەوە کە لە دەستەبەرکردنی هێز و توانایەکی گونجاوەوە دێت.[١٢]

بەڵام (هۆدینی) ئەمریکی هەڵدەستێت بە چالاکیە سەرسوڕهێنەرەکانی لەسەر تەختەی شانۆکان. پرۆفیسۆر (فیلیپ حەتتی) دانەری کتێبی (تاريخ العرب المعروف) گەواهی بۆ دەدا و لەبارەیەوە ڕاپۆرتێك دەنووسێت بۆ گۆڤاری (المقتطف) پوختەکەی ئەمەیە: هۆدینی بە دەست و قاچی بەستراوەوە دەخرێتە ناو کیسەیەکی توند و تۆڵ و دەمی دەبەسترێت و پاشان دەیخەنە ناو سندوقێکی قایم و قوڵ و دای دەخەن بە دوو قفڵ و پاشان سندوقەکەش بە پەتێکی زۆر قایم و نەبڕ دەپێچن و شەکەتی ئەدەن لە هەر چوار لاوە. پاش چرکەیەك (هۆدینی) لە دوای پەردەوە دێتە دەرەوە بە هەر دوو دەست و قاچی کراوەوە!

هەروەها نهێنی (ئارسەر کۆنن دویل) گەواهی دەدات و لەوبارەیەوە نووسیویەتی: "ئەوە سەیر و سەمەرەیە، موعجیزەیە ....". زیرەکی و دانایی و لێهاتوویی خۆیەتی و هیچ شتێکی تیا نیە لە جادوو بازی کاریگەر.[١٣] ئەمەش حاڵەتێکی سەرسوڕهێنەرە و هیچ لە نهێنیەکەی کەم ناکاتەوە.

ئەم بەسەرهاتە سەیرانەی کە باسمان کرد لە بارەی سیحربازی ئەم سێ کەسەوە نابێتە پاڵپشتێك لەسەر سەپاندنی ڕاستێتیان، بەواتایەکیتر هێزە دەرونیەکان کار دەکاتە سەر ماددە دەرەکیەکان، هەندێ لە توێژەرەوان بە لای ئەوە دادەچن زۆربەی کردەوە سیحریەکان وا خەڵکی لە هەموو کاتێکدا باسیان دەکەن و دەیان گوێزنەوە لەم لا بۆ ئەو لا هیچیتر نین جگە لەبابەتەکانی جادووی چاو نەبێت.

 

جادووی چاویش جۆرێکە لە خەواندنی موگناتیسی کە ڕوو دەدات لە مرۆڤ بە بێئەوەی هەستی پێ بکات، وەکەسی خەوێنراو تێیدا هەست دەکات بە هەموو ئەو شتانەی کە لە دەور و بەری ڕوو دەدەن بە بێ ئەوەی شتێکی نائاسایی لێ ڕەچاو بکرێت، بەڵام توانای بۆ وەرگرتنی ئیحا زۆر توونـد و بەهێزە. لەم حاڵەتە دا ساحیر هەڵدەستێت بە دەوری خەولێخەر، هەر ئەویشە کە ئیحا دەدات بە ئامادەبووان پاش خەواندنیان بەوەی کە ئەوان چەند شتێکی دیاریکراویان پێشان دەدرێت و زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی دەیبینین، کەچی لە واقیعدا بوونیان نیە.

هەندێ تاقیکردنەوەی زانستی کراوە لەسەر ئەو کەسانەی کە بەم شێوەیە خەوێنراون، ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیشی زیاد لە پێویست سەرسوڕهێنەر بوون، پیاوێك دەخەوێنرێت و پارچە قوماشێك دەبرێت بەرەو ڕووی، پاشان پێی دەووترێت ئەوە سەگە، کابرایش بڕوا دەکات بەو ئیحایەی کە دەیدرێتێ و وادەزانێ کە پارچەقوماشەکە هەر بەتەواوی سەگە. وە پیاوێکی تر ئیحای دەدرێتێ بەوەی کە هیچ کەس لەدەور وبەریدا نیە و ئەو ناوە چۆڵە، یەکسەر لەو کاتەدا ئامادەبووان لە بەرچاوی وون دەبن و دەشارێنەوە.

ئیحا دەدرێتە کەسێکیتر و پێی دەوترێت ئەوەتا دوو شاخ (قۆچی ئاژەڵ) ڕوواوە بەسەر سەری ئەو پیاوە کە لە ناو ئامادەبووان دایە، ئەویش یەکسەرباوەڕ دەکات و هەر دوو شاخەکەی زۆر بە ڕوونی و جوانی لێوە دیارە کە بەسەری کابراوەیە.[١٤]

بەم جۆرە ئەوانەی گومانیان هەبوو لە کردەوەکانی (هۆم) یان (پلادینۆ) یان (هۆدینی)، هیچیتر نیە تەنها وەهم و خەیاڵێك نەبێت کە ئەوان بە ئیحا دەیاندا بە زیهنی ئامادەبووان، هەر چەندە هەندێ لە زانایان سەرپێچی ئەم ڕاڤەکردنە دەکەن و ئەوە ڕادەگەیەنن کە ئەو شتانەی بینیویانە هیچیتر نین جگە لەڕاستی و واقیع نەبێت.

هەروەها لە ڕاپۆرتی مامۆستایانی زانکۆی (تۆرین) دا هاتووە ئەوانەی کردەوەکانی (پلادینۆ) یان بینیوە ئەمەی خوارەوەیە:

"سەرپێچی لەوە ناکەین هەندێ لە خەڵکی تووشبوو بە بوونی کەم و کوڕی لەمێشکیاندا یان مل کەچ بوونیان بۆ دەسەڵاتی وەهم و خەیاڵ، ئەوانە گاڵتەیان پێ دێ و لەوێناکردنی خۆیاندا بۆ شتەکان لە بینین و بیستنیاندا هیچ شتێك بوونی نیە تەنها ئەوە نەبێت کە لە خەیاڵی خۆیاندا وێنای دەکەن و هیچیتر، داوای لێبوردن دەکەین کە هەموو

خەڵکی قەناعەت پێبێنن کە ئێمە لە تووشبووانی ئەو کەم و کوڕیانە نین، لە بەر ئەوە توێژینەوەکەمان کورت کردەوە لەسەر ئەو نیشانەی کە شوێنەواری لێ بەجێما لە کۆتایی دانیشتنەکە دا بۆ رۆژی دوایی بینیمانەوە لە بەر رۆشنایی رۆژی رووناکدا و هەر ئەوە بوو کە بینیمان و دەستمان لێدا، زۆر ئەستەمە کە وەهم و خەیاڵ پەیوەندی بەمەوە هەبێت". [١٥]

بە هەر حاڵ ئەم بابەتە ڕاماندەکێشێتە ناو موناقەشەیەکی توند و تیژەوە، لەکۆتاییدا (ڕاین) هەوڵیدا کە بچێتە ناو ئەم بابەتەوە و بیخاتە سەر مێزی تاقیکردنەوەیەکی زانستی وەهاوە کە ڕێچکەی گومانی لێ نەبێتەوە.

(ڕاین) لەم پێناوە دا ڕێچکەیەکی تایبەت بە خۆی وەرگرت. لە تاقیکردنەوەکانیدا زاری تاوڵەی بەکار دەهێنا، ئەو دەرئەنجامەشی کە دەستی دەکەوت زۆر سەرسوڕهێنەر بوو لەراستیدا. هەر ئەو لەم بوارە دا دەڵێ: "پاش چەند ساڵێك لە لێکۆڵینەوەی فراوان ... گەیشتنە بەرهەم هێنانی ئەوەی کە هەندێ لە تاکەکانی خەڵك خاوەنی توانایەکی سادەن لەسەر کارتێکردن لەهەڵدانی زاری تاوڵەدا. بە چاوی ڕەزامەندیەوە ڕێگای هەڵدانی زاری تاوڵەمان وەرگرت هەروەها شێوە و ووردی لە دروستکردنیدا، لە پێناوی ئەمەشدا هۆکارە ئالەتیە هەمە جۆرەکانمان بە کارهێنا بۆ هەڵدانی شەش پاڵووەکە(زارەکە). هەروەها هەستابووین بە دابین کردنی لە بەرچاوگرتنی پێویست بۆ ئەوەی کە شەش پاڵووەکە (زاری تاوڵەکە) هاوسەنگیەکی تەواوی تێدا بێت لە کاتی کەوتنە خوارەوەیدا...". [١٦]

سەیر لەوە دایە قومارچیەکان دەرکیان بەم ڕاستیە کردووە پێش ئەوەی کە (ڕاین) بیدۆزێتەوە بە ڕێگازانستیەکەی خۆی، چوونکە ئەوان هەستیان بەوە دەکرد لە حاڵەتە دیاریکراوەکاندا دەتوانن کار بکەنە سەر کەوتنە خوارەوەی زارەکە باش بێت یان خەراپ. هەروەها ئەوەشیان پەی پێ بردبوو کە ڕووەکانی شەش پاڵووەکە(زارەکە) لەسەر ئەو شێوازە دەردەکەوێت جارێك بگونجێت لە گەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا و جارێکیتر پێچەوانە بێت لە گەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا، ئەوان ئارەزوویان بەلای ئەوە دا دەچوو بۆ شیکردنەوەی ئەم دیاردە سەرسوڕهێنەرە کەشی کەنەوە و پاساوی بۆ بهێننەوە بەوەی کە دەگونجێ لە گەڵ دەرك پێکردنەکانیاندا. وە زۆر جار هەڵدانەکەیان دەدایە پاڵ بەختی خۆیان وە یان دەیان دایە پاڵ بەختی ئەوەی کە لە تەنیشتیاندا دانیشتبوو، وە هەر چەند

لەوانەش بوو لەو کارەیاندا گەشبین یان رەش بین بوونایە چونکە لەوەشدا شوێنکەوتەی شێوازە تایبەتیەکانی خۆیان بوون و کەسی‌تر جگە لە خۆیان نەیدەزانی بەو حسابە.

بەڵام (ڕاین) لەمە دا گەیشتە ئەنجامی کۆتایی ئەویش ئەومیە کە دەروونی مرۆڤایەتی دەتوانێت کار بکاتە سەر ماددەی دەرەکی بە بێ هاوکاری ناوەندێکی هەستیاری، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دان بەوە دادەنێت کە ئەم کارتێکردنە زۆر لاوازە و لەناستی ڕێکەوت (الصدفە) تێناپەڕێت تەنها بە ڕێژەیەکی زۆر کەم نەبێ و جار و بار نەبێت ئەوەش دەرناکەوێت.

ئەمەش بەو مانایە نایەت کە هەموو خەڵکی وەك یەکن لەم کارتێکردنە دا. گومانی خەڵکی جیاوازن لە بەهێزی و لاوازیدا بە نیسبەت ئەوەی کە تێیاندایە لە ڕادەی گەش بینی و خۆڕسکی و بیر و باوەڕ.

بۆمان دەرکەوت لەوەی پێشەوە کە چۆن دەروون دەتوانێت بە هۆی بیر و باوەڕی بەهێزەوە کار بکاتە سەر ماددەی جەستەکەی خۆی کارتێکردنێکی گەورە. لەوانەیە بە هەڵە دا نەچووبێتین ئەگەر دابێتمانە پاڵ دەروون هەندێ لەو کارتێکردنە لە ماددەی دەرەکی.

هەر چەندێك کارتێکردنی دەروونی لاواز بێت لە ماددەی دەرەکی ئەوە هەندێ جار دەبێتە هۆی ڕێگری گەورە. ڕووداوەکانی ژیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هێزێکی زۆر بچووك بەدی هێناوون، لە بارودۆخێکی دیاریکراودا، بۆ ویرانکردنی شارێك بە هەموو پێکهاتەکانیەوە، یان گۆڕینی چارەنووسی تاکێك یان نەتەوەیەك.

بۆ نموونە ئۆتۆمۆبیلێك بە هەموو سەرنشینەکانیەوە بێنەرە پێش چاوی خۆت لە کاتێکدا بە خێرایی دەڕوات و لە ڕێگا بەربەستێکی زۆر بچووك و ئاسایی دێتە ڕێی و دەبێتە هۆی وەرگەڕان و مردنی سەرنشینەکانی، زۆر جار ئۆتۆمبیلێك هۆکاری ناخۆشی و کارەساتە. چونکە هاوسەنگیەکەی لە چرکەیەکی سوڕانەوەی کت و پڕ دا لەق دەبێت یان خێرایی زۆر لە کاتی لێخوڕیندا دەبێتە هۆی وەرگەڕانێکی قورس و زیان بەخش. لەوانەیە هێزێکی دەروونی کز لەیەکێك لەسەرنشینەکانی ئۆتۆمبیل یان بە پێچەوانەوە ببێتە هۆی زیان گەیاندن و پەك خستنی ئەو ئۆتۆمبیلە و بیکات بە چاوەوە.

وا دەگێڕنــەوە لــە شــوانی هێــسترەکانی ســەربەرزایی چــیاکانی ئــەلپ هەڵدەســتن بــە کپکردنــی دەنگــی زەنگۆڵــەکانی ملــی هێــسترەکان چونکە دەنگــی زەنگۆڵــەکان دەبێتــە هــۆی ڕووخــان و هــەرەس هێنــانی رووکارێــك لــە ڕووکارەکــانی چــیاکە. هــەروەها پــسپۆڕان و شارەزایانی ئەو بوارەش کە لەوێ ئامادەن خۆ دەپارێزن لـە دەنگـی بـەرز و بانگەواز کـردن یان گوللەی ئاگرین تەقاندن بە ئاسماندا، چونکە وا دەگێڕنەوە لەو رووداوانە کە جـاری وا هەیە پارچەی زۆر گەورە لەشەختە و سەهۆڵبەندان یان تاشەبەردی (گابەرد)ی زۆر گەورە بە هەڵواسراوی ماونەتـەوە لـە کـاتی هـەرەس هێنانـدا بـە حـاڵ گیرساونەتەوە بـە شـوێنی خۆیانــەوە، کــەمترین لەرینــەوە لــە گڤــەی بایــەك بــەهۆی دەنگــی زەنگۆڵەکانــەوەیان هــەر دەنگــێکیتره وە دەبێتــە هــۆی جوڵانەوەیــەکی لاواز و پاشــان خولخــواردنی ئــەو پارچــە هەڵواسراوانە بە مۆلەقی و ئەنجا بەربوونەوەی لە شوێنی خۆی.

زۆر جاریش کە لە ئەنجامی ئەو غلۆربوونەوانە دا دەبێتە هۆی وێرانکردنی گوندەکانی دامێنی چیاکان و لەناوبردنی کێڵگە و بەر و بومـە کشت و کاڵیـەکانیان و ئەمـەش دەبێتـە هۆی کەم بوونەوەی بەرهەمە کشتیاریەکان.

لەبــەر ئــەوەی خوومــان گرتــووە بــە ژیربێژیــەکی کۆنــەوە لەســەر ئــەوەی دەڕوانــین بۆشتەکان بەڕوانینێکی زۆر جدی و بابەتی و جیاوازیان لە نێواندا دەکـەین بـەو پێودانگـە لەسەر بنەمای پێچەوانە هەیە لە نێـوان پەسـەند کـردن و نـەکردن دا. بـۆ نموونـە ئـەوەی دەڵــێین لــە بــارەی هێزێــك لــە هێزەکــان بتوانێــت یــان نــەتوانێت لەبەرهــەم هێنــانی کاریگەریــەکی دیـار و لەبەرچـاو، بـەڵام ئێمـە لێـرەدا ئـەوەمان لـەیاد چـووە سـەبارەت بـە سروشتی بارودۆخە ئاڵۆزەکـان زۆر جـار وا دەکـات هێزێکـی بچووك توانـای زیـاتر بێـت لـە هێزێکــی گــەورە لەســەر بەرهــەم هێنــانی دیاردەیــەك لــە دیاردەکــان. زۆربــەی هۆکــارە (کەونییــەکان) بوونەوەریــەکان هاوســەنگیەکەیان هاوســەنگیەکی مۆلەقــە، لـە بەرئەمەشـە گەر هات و هێزێکی زۆر کز خۆی بدات بەسەریا دەبێتە هۆی ڕوودانـی کودەتایـەکی سـەرلێ تێکدەر بۆ عەقڵەکان.

دەگێڕنەوە (مارکۆنی) توانیویەتی رۆژێك لە رۆژان ئاهەنگێکی گەورە ڕوونـاك بکاتـەوە لە ئوسترالیا، بەمەرجێ لەو کاتە دا خۆی مەلاسدا بوو لـە ناوکەشـتیە گەشـتیاریەکەیدا لـە ئاوەکانی ئیتاڵیادا. لـە واقیعـدا هیـچی نـەناردووە بـۆ ئوسـترالیا تـەنها نیـشانەیەکی لاسلکی

 

سادە نەبێت، وە ئەم نیشانەیە گەورە بووە لە ئوستراليا بەهۆی تۆپەوانە تايبەتەكان بەشێوەیەك كە لە تواناياندایە دوگمەیەكی دیاریكراو بخەنە جوڵە، بە جوڵانەوەی ئەو دوگمەیەش تەزووی كارەبای ناوخۆیی هەڵدەبێت و ئاهەنگەكەی ڕووناك كردووەتەوە.

لە هاوشێوەی ئەمەش ڕوویداوە لە ئەمەریكا بە كرانەوەی ئەو دەرگایانە لە خۆیانەوە لە كاتێكدا كەسێك دەڕوا بەرەو ڕووی هەر یەكە لەو دەرگایانە، بەو كارلێكردنە سادەیەی سێبەری كەسە ڕۆشتووەكە دروستی دەكات لەسەر ئەو ئامێری چاو (كارۆ ڕووناكی)یەی لە دەرگاكە دایە دەبێتە هۆی كردنەوەی تەزووی كارەبایی، ئەم تەزووەش بەكاری خۆی هەڵدەستێت بۆ كردنەوەی دەرگاكە.

هەروەها لەبارەی بۆمبای ئەلەكترۆنی كە دەبێتە هۆی هەڵتەكاندنی شاخەكان و وێرانكردنی شارەكان ئەویش بەهۆی دابەش بوونی ناوكییەك گەردیلەوە بۆ دروست بوونی زنجیرەیەك كارلێكردن ـ وەك زانراوە لە لایەن پسپۆڕەكانی گەردیلەوە... ئەم كارلێكردنانە بۆ دواجار كۆتایی دێن و دەبنە هۆی كارەسات و ماڵوێرانی بە هەموو جۆرە جیاوازەكانیەوە بۆ سەر و ماڵی خەڵك.

ئەوەی دەیگێڕنەوە لە بارەی (چاوپیسی)یەوە دەكرێ بەم جۆرەی خوارەوە ڕاڤە بكرێت:

لە ڕاستیدا چاو هیچ كەس تووش ناكات، بەڵام ئەوە دەروونە لە پشت چاوەوە شەپۆلە كارەباییەكان بڵاو دەكاتەوە لەسەر خەڵك، ئەم شەپۆلە كاریگەرانەش وەك یەك كاریگەری نیە لە هەموو تاكەكاندا.

چاو هیچ كەس گیرۆدە ناكات تەنها ئەو كەسە نەبێت كە بڕوای پێیەتی. ئەم بڕوا پێبوونەش وا لە شەپۆلە دەرچووەكانی خاوەن چاو (چاوپیس) دەكەن بارگاوی بن بە زنجیرەیەك كارلێكردن لە مێشكی كەسە نێچیرەكە و كوتانی بەزەویدا.

ڕووداوەكانی تووش بوون بەچاوپیسی جێگایان نابێتەوە تەنها لە كۆمەڵگا دوا كەوتووەكاندا نەبێت كە بڵاوبوونەوەی ئەفسانە و خورافات تیایاندا ئاسانە، چەندمان بیستووە لە خەڵك لەبارەی كەسی "چاوپیس"ی كاریگەرەوە كە تەنانەت ئەوانەی بە گاگۆلكێ بڕۆن بەرێدا لەترسی ئەو چاو پیسە هەر بە غار ڕا دەكەن و خۆیان وون دەكەن

لە بەر چاوی. ئەم کەش و هەوا دەروونیە ترسێنەرەیە دەبێتە هۆی یەخسیرکردنی زۆربەی قوربانیەکان بەڕێگای ئیحا...

لەیەکێ لە ڕۆژنامەکانی بەغدا دا پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر هەواڵی ئەوە بڵاو کرایەوە کە پیاوێك بەهۆی چاویەوە بزوێنەرێکی کارەبایی لە "کارگەی شووشەی سوریای گەورە" لە دیمەشق تووشکردووە، لە ئەنجامی ئەمە دا بزوێنەرەکە توانای سوڕانەوەی نەماوە و لە کار کەوتووە, وەك لە هەواڵەکەدا هاتووە پاش توێژینەوە و لێکۆڵینەوە ئەندازیارەکان بۆیان دەرکەوتووە، ئاوە هەویری شووشەکە دەبێتە بەربەستی ڕێگای بزوێنەرە گەورەکە بەوەی کە لەسەر ڕووی ئاوە شووشەکە وێنەی چاو کێشراوە.(١٧)

ڕۆژنامەکە بۆی زیاد دەکات و دەڵێ: شووشە "تووشبووەکە" برا بۆ تاقیگەکانی زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت بۆ تاقیکردنەوە و پشکنینی.

من خۆم ناتوانم ئەم هەواڵە سەیرە ببەستمەوە بە هیچ شتێکیترەوە، بەڵکو زیاتر بە لای ئەوە دا دەچم بە درۆی دابنێم. بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا دەڵێم: هەموو شتێك لەم سۆنگەوە دەگرێ ڕوو بدات لەم سەردەمە دا - سەردەمی دۆزینەوەی ووزەی ناووکی و کاریگەریی نەستیەکان (ناهەستیەکان) -.



زۆرینەی خەڵك لەو بڕوایە دان کە مەترسیەکانی دەروون و چەواشەکاریەکانی کار ناکاتە سەر شتە دەرەکیەکان کارتێکردنێکی ماددی هەستپێکراو. خەڵکی خۆیان گەش بینن یان ڕەشبینن، دڵخۆشن یان غەمبارن، خەڵکی دەرك ناکەن بەم هەڵچوون و پەرچەکردارە دەروونیانەی وا کار دەکەنە سەر هەموو لایەنەکان و مادده بێگیانەکانی دەوربەریان جا زۆر بێت یان کەم، بگرە هەندێ جار دەبێتە هۆکار بۆ ئامانجە کرداریەکان تا ئەوپەڕی گرنگی.

لەوانەیە زۆر لەوکەسانەی بەختیان ڕەشە، ئەو بەخت ڕەشیەیان بە دەستی خۆیان خستۆتە نێو دەروونی خۆیانەوە. چوونکە ئەوانە چاودێری ڕووداوەکان دەکەن و ڕەچاوی هیچ ناکەن لەو ڕووداوانە تەنها شتی خراپە نەبێت،لە بەر ئەوە ڕێژەی ڕووداوە نالەبار و خراپەکان وا لێیان ڕوو دەدات زۆرتر و گەورەتر لەو ڕێژەیەی وا دێت بەسەر ئەوانە دا کە

گەشبین و راڤەكەری شتەكانن. ئەو جۆرە كەسانە دژی بەرژەوەندیەكانی خۆیان كاریگەریەكان ئاوەژوو دەكەنەوە، وەك ئاراستەكردنی ئەو قومارچیەی دەیكاتە سەر زاری تاوڵە لە كاتی هەڵدانیدا.

لەوانەیە ئەوانەی وا رەش بینن دەستیان نەبێت لە دروست كردنی ئەو رەشبینیەدا لە نێو دەروونیاندا، ئەوانە قوربانیی ئەو بارودۆخە نالەبار و خراپەن كە تێیدا هاتوونە نێو ژیانەوە، بەجۆرێك وا راهاتوون هەر لەمنداڵیانەوە كە لە ژیاندا دەست لەملانی ئاسودەیی نابن جگە لە چەوسانەوە و رسوایی و دەركردن نەبێت، بەم جۆرە ئەوانە بەرهەم هێنەر و جێگیركەری وێناكردنە خراپ و بێئومێدیەكانن لە نێو خەیاڵ و بیركردنەوەكانیاندا، دووبارە بەم وێناكردنە دزێوانەش بڕیاردەدەن بە سەر هەموو ئەو شتانەی كە دێتە رێگایان.

بۆچوونی بێهیوایی هەمیشە بێهیوایی راناكێشێت، بەلام هەمیشە دەبێتە هۆی زیادكردنی لە كۆی رووداوەكانیدا.

رێكەوت هەمیشە جیاوازی ناكات لە نێوان كەسێك و یەكێكیتر دا، دێت بەسەر هەموو مرۆڤێكدا بە چاكی و خراپیەوە لە سەر رێژەیەكی نزیك لەیەك. نموونەش بۆ ئەمە وەك نموونەی زارە شەش پاڵووە یەكسانەكەی لێدێت كە چاوەڕوانی دەركەوتنی ئەو رووەی لێ دەكرێ و بۆی هەیە هیوا بەخشێكی دوور و درێژ بێت وەك ئەوەی كە هیچ گریمانەیەكیتر دابنرێت بۆ دەركەوتنی روویەك لە رووەكانیتری.

تاقیكردنەوەكانی (راین) بەڵگەن لەسەر ئەمە، وەك لەمەوپێش ئاماژەمان پێدا، لەسەر ئەوەی دەروونی مرۆڤایەتی كاریگەری هەیە لە كەوتنە خوارەوەی زاری تاوڵەدا، وا روو دەدات لە دەركەوتنی یەكێك لە رووەكانی بە رێژەیەكی گەورەتر لەوەی تەنها بەرێكەوت بێتە ئاراوە. بەو مانایەی: مرۆڤ دەتوانێت بەهێز و توانا دەروونیەكانی تەحەدای رێكەوت بكات و زاڵ بێت بەسەریدا.

خەڵكی لەم چاخە نوێیە دا چەمكی بەختیان داناوە لە بەرامبەر چەمكی رێكەوتدا و بە هەر دووكیان دەووترێت شانس (Chance چانس) نەخوێندەوارەكانمان لە رۆژهەلاتدا ئەم ووشەیان (لەمفزەیان) عەرەبانددووە و بەكاری دەهێنن لە هەموو گفت و گۆ ئاساییەكانیاندا. بۆیە دەیانبینین لە بارەی "چانس"ەوە ووتوویژ دەكەن لە كارەكانی وەك:

 

پێشبڕکێی ئەسپ سواری ـ لە بازرگانی و لە هەڵبژاردن و لە ئەنجومەنی خوێندنی باڵا و ئەم جۆرە شتانە ...

لە راستیدا رێکەوت تەنها خۆی بەس نیە بۆ راڤەکردنی بەخت، هێزە دەروونیەکانیش گاڵتەی پێناکرێت لەو کارلێکردنەی هەیەتی لە پێکهاتەیدا بە چاك یان بە خراپ.

هێزە دەروونیەکان تەنها کار ناکاتە سەر رێڕەوی کار و بارەکان بەڵکو لەتوانایدایە ئەوەی پەنهان و شاراوەیە دەریخات یان هەروەها ئەوەی کە هێشتا نامۆیە لەسەری ـ وەك لە بەشی پێشوو دا باسمان کرد. ئەو هێزانەن کە هاندەر و گومان دروستکەرن پێکەوە، بەرێکەوت زاڵە بەسەر کارلێکردنەکەیدا و بە گومانیشە لە ڕکەبەرایەتیەکەیدا. کەسی خاوەن بەختی باش دووبارە دوو توانای هەیە. چونکە ئەو کەسە بە پاکی زیهن و دڵنیابوون لە دەروونی و بڕوابوون بەسەرکەوتنی دەتوانێت کار بکاتە سەر رووداوەکان، هەندێ لەو کارلێکردنانەی بەرەو رووی دەبنەوە لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیدا کەم بێت یان زۆر. بەڵام ئەوەی دابڕاوە لە کارلێکردن لە رێگایەکیترەوە چارەسەری دەکرێت ئەویش رێگای گومان و پێشبینی کردنە: بەمەش دەتوانێت دڵخۆش بێت بەوەی بەیانی پێی دەگات لە ئیش و کارەکانیدا و دوور دەکەوێتەوە لە زیان هەنگاوێك و نزیك دەبێتەوە لە قازانج هەنگاوێکی تر.

ئەو کەسە کارلێکردنە دەروونیەکانی ئاڕاستە دەکات لەسەر کاروبارەکانی لە لایەکەوە و لە لایەکیتریشەوە ڕووبەڕووی ئەو گومانە ئاشکرایە دەبێتەوە کە لەسەریەتی.

کەواتە بەمجۆرە چارەنووسی دەبێتە ئەو زارەی کە لەهەوا دا هەڵدەدرێت و حەز دەکات بەو ڕووە دا بکەوێتە خوار کە ئەو دەیەوێت یان پێشبینی بۆ کردووە. ئەو کەسە ئەم کارە بە شێوەیەکی نەستی ئەنجام دەدات، بەڵام ئەو کەسە زۆرسەری سوڕ دەمێنێت لە دەروونی خۆی و لەو توانا سەرسوڕهێنەرەی لەسەر بەدەست هێنانی قازانج و دوورخستنەوەی زیان کات لە دوای کات هەیەتی.



بۆمان دەردەکەوێت لەوانەی کە ڕابووورد لێرەدا ئاستێکی روون و لە بەرچاو نیە لەنێوان خەیاڵ و راستیدا، زۆر جار خەیاڵ دەبێتە هۆی دروستکردنی راستی.

تۆ ئەگەر خەیاڵت رۆشت بۆ شتێك و لەو بڕوایەشدا بوویت کە ئەو شتە هەیە بە حوکمی بوونی کاریگەرە جیاوازەکانی ئەو شتە، بەلاّم حەقیقەتی بوونەکەی راستەوخۆ وەك ئەو کاریگەریە نیە کە هەیەتی لە ژیانی کرداریدا، بۆیە لەم کاتەدا مرۆڤ بوونەکەی پشت گوێ دەخات و پێی ئاشنا نابێت.

بۆ نموونە دەگونجێ بڵێین (لویس پاستۆر) لە کاتی دۆزینەوەی میکرۆبدا دروستی کردووە بە دروست کردن، هەر چەندە باو باپیرانمان میکرۆبیان پشت گوێ خستبوو، لە بەر ئەوە میکرۆب بە مانای یەکێ لە ماناکان، بوونی نەبوو. بەلاّم پاش ئەوەی (پاستۆر) دۆزیەوە بوونی هاتە کایەوە، ئەو کاتە خەڵك کەوتنە ترس لێی و کەسانێکی زۆریش لە ئەنجامی ئەمەدا گرفتار بوون بە نەخۆشی "واسواسی - ڕاڕایی".

ئەوە شتێکی زانراوە ئەو کەسەی لە نەخۆشی بترسێت هەر تووشی دەبێت، وە ئەو ترسە هەمیشەییەی بیری نەخۆشی بەهێز دەکات لە دەروونیا، بەم شێوەیە میکرۆبەکانی نەخۆشی دەگاتە نێو بەدەنی و دەبێتە خاکێکی بە پیت بۆ گەشەکردن و زا و زێ(زۆر بوون).

یەکێ لە پزیشکە ناودارەکان رۆژێ لە رۆژان لە راگەیاندنێکدا وتی: "گرنگی پزیشك لەوە دایە یارمەتی نەخۆش بدات بە شفادانی دەروونی نەخۆشی بەهۆی دەروونی خۆیەوە. چونکە پزیشکەکان شفای کەس نادات. ئەوە دەروونە دەبێتە سەرچاوەی شفا(چاك بوونەوە)، پزیشکیش کارێکیتری نیە جگە لەوەی یارمەتی دەروون بدات بە کارلێکردنەکانی".

دکتۆر (دۆراند) تاقیکردنەوەیەکی ناوازەی کرد لەسەر نەخۆشەکانی. بەوەی شروبێکی پێش کەش کردن کە هیچ شتێکی لە دەرمان و ماددەی پزیشکی تیا نەبوو, پاش تێپەڕبوونی چارەکە سەعاتێك دوکتۆرەکە لە نێوان نەخۆشەکاندا راوەستابوو هەر دوو دەستی دەدا بەیەکدا و بەداخ و پەژارەوە خۆی پیشان دەدا و بە قورگی گیراوەوە بە شێوەزارێکی لێبوردنەوە پێی وتن: "ئەو شروبە هی ڕشانەوە بووە و من بە هەڵە داومە بە ئێوە..." بۆیە پشێوی و ژاوەژاو ڕوویدا لە نێوان نەخۆشەکاندا و هەندێکیان یەکسەر راستەوخۆ قوڵپ و قۆ ڕشانەوە.[٨]

بانگەوازچیانی راستی و حەقیقەت لە هەموو کاتێکدا هەوڵ ئەدەن بۆ نەهێشتنی وەهم و خەیاڵ لە نێوان خەڵکدا، بەڵام نازانن کە خەیاڵ زۆر جار لەوانەیە بەسوودتر بێت لە راستی. هەر چەندە مرۆڤ هەر لە دێرزەمانەوە تەنها لەسەر حەقیقەت ژیاوە و هەر لەسەر ئەویش فرێ تێکەوتووە.[19]

هەر چەندە شارستانێتی نوێ ئامادەی کردووە بۆمان زۆربەی داو دەرمانە باشەکان و هۆکارە سوودمەندەکان کە وامان لێدەکات بە هۆیانەوە بتوانین دوور کەوینەوە لە خەیاڵات و درۆ و دەلەسە و شتە پڕوپووچەکان، بەڵام ئەی ئەو ساویلکە و گێلۆکانەی وا لە بێشەڵانەکانی ئەفەریقا دا دەژین چۆن ئەتوانن ئەم دا و دەرمانانە دروست کەن؟! یان ئەو گوندنشینەی لە لادێیەکی دوورەدەست و دابڕاو دایە و لە بەردەم نەخۆشی و مەترسیەکاندا رووبەڕووە، خاوەنی هیچ هۆکارێکی ماددی نیە تا بتوانێت زاڵ بێت بە سەر ئەو نەخۆشیانە و خۆی بپارێزێت لە تووشبوونیان پێی؟! دووبارە بە زەرەر دەشکێتەوە بە سەرماندا ئەگەر داوا لەو ساویلکە و گێلانە بکەین تا واز بێنن لە خەیاڵات و ئەفسانە پڕوپوچەکانیان و ببنە کەسێکی واقیعی لە بیرکردنەوەکانیاندا.

لە زۆربەی شارستانێتی و کۆمەڵگا جیاوازەکاندا وەهم و خەیاڵ ئەرکی تایبەتی خۆی جێبەجێ دەکات. لە شێوەی دا و دەرمان لەو ژینگانەی کە داو دەرمانی تێدا نیە خۆی دەنوێنێت، یان لەشێوەی بەردێکی تەندروستی (بەردی ئازار شکێن وەك ئەو بەردە تەنکیلە بچووکەی بۆ ناووك گرتنەوە بەکار دێت. وەرگێڕی کوردی) لەنێوان ئەوانەی کە هێشتا نازانن بە حەقیقەتی نەخۆشیەکان و سەرچاوە ڤایرۆسیەکان.

سەیر لەوە دایە دەبینین هەندێ لە تێگەیشتووە بایی هەواکان لە عێراق و وڵاتانی تریش داوا دەکەن لە گوندنشینەکان تا واز بێنن لە وەهم و خەیاڵ و خەونەکانیان لە کاتێکا خۆیان دوورەپەرێز و دابڕاو وەستاون لە درێژکردنی دەستی یارمەتی وگەیاندنی هۆکارەکانی چارەسەرە نوێیەکان بۆ ئەو گوندنشینانە. ئەوانە بە لادێیەکان دەڵێن ئامێر و هۆکارە کۆنەکانتان فڕێ دەن پاشان خۆشیان هیچ ئامێر و هۆکارێکی تازەیان پێناگەیەنن. نموونەی ئەمانە لەمەدا وەك نموونەی ئەو پادشا ساویلکەیەی لێدێت کە چەك و تفاقە جەنگیەکان لە پاسەوانەکانی خۆی دادەماڵێت بە بیانووی ئەوەی کۆنن و بەکەڵکی

 

بەكارهێنان نایەن، خۆی كەڕ دەكات لەم ئیشە و بە دابڕاوی جێیان دێڵێت بێئـەوەی هـیچ چەك و تفاقێكی پێویستی تازەیان بۆ بخاتەوە شوێنی كۆنەكانی خۆیان.

خـەیاڵ و راسـتی لـە ململانێیـەكی دوور و درێـژدان هـەر لەسـەرەتای دروسـت بـوونی مرۆڤەوە.

مـرۆڤ لـە هەوانتـە هەنـدێ كـات چاكەی وەهـم و خـەیاڵ نـادات بـە سـەر حەقیقـەت و راستیدا. چونكە لەخەیاڵدا سوودێكی گەورەی دۆزیوەتەوە و بـەكاری هێنـاوە وەك چـەكێك لە ڕابووردوودا و پارێزگاری تەنگژەكانی ژیانی پێكردووە.

مــرۆڤ هەنــدێ جــار داوای راســتی دەكــات بــەڵام ناتوانێــت بیدۆزێتــەوە. دووبــارە زەرەرمەندیش دەبێت ئەگەر بە خەیاڵی خۆی ڕاستییەكی تایبەت دروست بكات و جێگای نەهێشتنی تەنگ و چەڵەمەكانی ژیانی پێبگرێتەوە.

باو باپیرانمان نهێنی نەخۆشیەكانیان پشت گوێ خستبوو، ئـەوان ئەگـەر بیـان ویـستایە ئەو نهێنیانەیان بزانیایە ئەچوون خۆیان لێ ئەشاردەوە و لێی دائەبڕان.

تەنانەت "پاستۆریش" خۆی لەتوانایدا نەبوو و نهێنی میكرۆب بدۆزێتـەوە ئەگـەر لـە ژینگەیەكی تری جیاواز لە ژینگەی خۆیدا نەژیایە، یان ئەگەر لـە پـێش ئـەو زەمانـەوە لـە دایك بووایە كە زەمانی توێژینەوە پزیشكی و كیمیاویەكانی بەشێوەیەك تیـا پـێش كـەوت كە ئەوی تیا لە دایك بوو.

لـە سـەر ئـەم بنەمایـە بـاو باپیرانمـان پـەنایان بـردووە بـۆ تەلیـسم و نوشـتە و دۆعـا و چارەسەری نەخۆشەكانیان پێكردووە. ئێمەش ئەمڕۆ پێكەنینمان دێت بە ئەفسانە و پـڕ و پووچەكانیان كە ئەمەش زوڵم و دوژمنایەتیە ـ ئێمە زانیاریمان نیە لە بارەی ئەو تەلیـسم و دۆعایانەوە، لە كاتێكدا نەخۆشەكە بڕوای پێیەتی و سوودی لێ وەردەگرێت زیاتر لـەوەی كە داو دەرمانی ماددی گومان لێكراو سوودی پێدەگەیەنێت لەو حاڵەتەدا.

بیر و باوەڕی چەسپاو سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت لـە زۆر لایەنـەوە. وە لاریـشمان لـەوە نیـە كـە زیـانی پێدەگەیـەنێت لـە چـەند لایـەنێكیترەوە, كێشەی ئـەم ژیانـەش ئەوەیـە ناتوانیت لە شتێكدا قازانج بكەیت و سوودی لێوەرگریت بە بێئەوەی زەرەر و زیـانی تێـدا نەكەیت یان زیانت لێ بكەوێت بەبێسوود و قازانج ـ لەهەموو كاتێكدا.

 

بیر و باوەڕ بڕواكردن لە مرۆڤدا دەژێنێتەوە و ئیحای دەداتێ بۆ سەركەوتن و چاك بوونەوە و دڵنیا بوون، بەڵام لەهەمان كاتدا ڕێگری دەكات لە هەڵس و كەوتكردنی ژیان بە هەڵس و كەوتكردنێكی واقیعی و ژیرانە و وای لێ دەكات حەز و خولیای بڕوات بۆ ئاوێزان بوونی لە گەڵ شتە بێماناكان و درۆ و دەلەسە و پڕ و پووچەكان لە بەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستیەتاڵەكان.

ئەو شارستانێتیە ساویلكەیەی كە لە دارستانەكانی ئەفەریقا و بیابانەكانی ئوستڕالیا و دووڕگەكانی ئوقیانووسی هێمن و ئەوانیتر دا بڵاو بووەتەوە، كاریگەریە دەروونیە بەهێزەكان لە خۆ دەگرێت لەوانەی وا مرۆڤ سەرسام دەكەن.

ووتووێژەكانمان زۆر درێژ دەبێتەوە و كاتێكی زۆر دەخایەنێت بۆ لێدوان لەبارەی شتە سەرسوڕهێنەرەكانی ئەوانەی وا عەقڵ نایبڕێ بڕوای پێبكرێت لەم ناوچانەدا. لەم شارستانێتیە ساویلكانە دا كاریگەری هێزەدەروونیە ئاشكراكان دەبینین بە هەر دوو ڕووەكەیەوە ـ سوود بەخش و زیان بەخش: تێیدا ئەو داب و نەریتە بێمانا و بیر و باوەڕە پڕووپووچانە بەر چاو دەكەوێت كەلە پلەی زیادەڕۆییش تێپەڕی كردووە، لە هەمانكاتدا ئەو كاریگەری و شتە سەر سوڕهێنەرانەشی تێدا دەبینین كە مرۆڤ واقی وڕ دەمێنێت لێیان.

ساویلكەكان جیاوازن لە پێشكەوتووەكان لە چوارچێوەی بیر و هزر و شێوازی عەقڵیەت و بۆچوونیاندا. ئەوان بەو شێوەیە ڕاڤەی بوونەوەر ناكەن، وەك ئەوەی پێشكەوتووەكان ڕاڤەی دەكەن، لە ڕووی مل كەچ بوون و گوێڕایەڵی بۆ فەرهەنگە سروشتیە جێگرەكان یان گرتنەبەری ڕێگا بە پێی بیر و باوەڕی هۆ و ئەنجامەكەی. ئەوان بە ڕاستی بیر و ئەندێشەیان بۆ ئەوە دەچێت كە بوونەوەر پڕ بێت لە هەموو جۆرەكانی گیان(ڕۆح). ئەمرۆش ئەمە ناو دەبرێت بە ڕووانینی "دەستنیشانكردن" لە بوونەوەردا.

ساویلكەكان لەو بڕوایە دان هەر دیاردەیەك لە دیاردەكانی سروشت هۆكەی دەگەڕێتەوە بۆ توانایەكی دەرچوو لە ڕۆحێكی دیاریكراوەوە. لە ڕووانگەی ئەواندا ئەو ڕۆحانەی بوونەوەر دەبەن بەڕێوە وەك ئەو كەسانەی (تاك) خۆیان وایە كە كۆمەڵگاكەیانی پێك هێناوە.[٢٠]

لە بەر ئەوە دەیانبینین رۆحەکان لە خۆیان قایل دەکەن لە هەموو ئیش و کارێکدا کە پێی هەڵدەسن بۆ ئەوەی رۆحەکان لێیان تورە نەبن و ببنە هۆی کارەسات بۆیان. بەڵام پێشکەوتووەکان هەوڵ ئەدەن کێشەکانیان چارەسەر کەن بە چارەسەرکردنێکی ژیرانە و زانستییانە، دەبینین ساویلکەکان کێشەکانیان چارەسەر دەکەن بە هونەرەکانی سیحر و جۆرەکانی نوشتە و تەلیسمەکان. وە لەمەشدا ئەوان قسە لە گەڵ رۆحەکاندا دەکەن و پەنایان دەبەنە بەر و تکایان لێدەکەن بەڵایان لێ دوور خاتەوە و خێر و خۆشیان بە نسیب بکات.

یەکێ لە گەڕیدەکان دەگێڕێتەوە جارێکیان لە ناو ساویلکەکاندا دانیشتبوو لە یەکێ لە گووندەکانی ئەفەریقای قوڵەڕەشەکاندا، بەرێکەوت روویدا ژنێکیان دیار نەما و بزر بوو لە نێوانیاندا، هەموویان یەکێ لە جادوو بازەکانیان تاوانبار کرد کە لەوێ بوو، پێیان دەگووت گوایە ئەو دەستی بە سەردا گرتووە بەهۆی جادووەکەیەوە. پاش چەند رۆژێك کابرای گەڕیدە تیمساحێك دەبینێت لە نزیك کوخەکەیەوە و دەیکوژێت، پاشان لە ناو سکی تیمساحەکەدا هەندێ خرخاڵ و بازن دەدۆزێتەوە کە لەهی ژنە بزر بووەکە دەچێت. کابرای گەڕیدە هەڵدەسێ خرخاڵ و بازنەکان پیشانی خەڵکی گوندەکە دەدات، ئەوانیش دان بەوە دادەنێن کە بەڵێ ئەمانە هی ژنە وونبووەکەیە بەڵام لە گەڵ ئەمەشدا هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی کە جادووگەرەکە (ساحیرەکە) بەهۆی سیحرەکەیەوە ژنەکەی کوشتوە و تیمساحەکە هیچ پەیوەندیەکی بەم مەسەلەیەوە نیە, وە لەوانەش بوو وا گومان بکەن کابرای ساحیر بەهۆی بەکارهێنانی تیمساحەکەوە ژنەکەی کوشتبێت.

ئەم چیرۆکە بە روونی بۆمان دەردەخات کە ئەو دوو عەقڵیەتە پێچەوانەی یەکترن ـ عەقڵیەتی ساویلکەیی و عەقڵیەتی تێگەیشتوو. کابرای گەڕیدەی تێگەیشتوو لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی بەرهەم دێنێت لە سەر پشت بەستن بە بیر و باوەڕی(هۆکارەکان)، بەڵام ساویلەکان باوەڕیان هەیە بە کاریگەری سیحر و توانا رۆحیەکان لە ئیش و کارەکانیاندا و هەرگیز لەمە لا نادەن و لێی جیا نابنەوە.[21] ئەم پێچەوانەیەش لە نێوان هەر دوو عەقڵیەتەکە دا روو دەدات لە هەموو شوێنێکدا بە پێی جیاوازی کەم و زۆری پلەکانی رووداو لە نێوانیاندا.

هەروەها چەند نموونەیەك دەبینین هەندێ جار لە عەقڵیەتی ساویلکەکان لە نێوان گەلانی پێشکەوتوودا، پێش چەند ساڵێك لەوبەر لە هەندێ قوتابخانەکانی ئەمەریکادا ڕوویداوە کە دایك و باوکی قوتابیەکان کوتانی نەوەکانیان ڕەت کردووەتەوە بە کوتانی لە دژی نەخۆشی (کۆلێرا) بە بیانووی ئەوەی کە ئەوان وا ڕاهاتوون ئەمە دژی کار و فرمانەکانی بڕوابوون بە خوایە.

من تا ئێستاش بیر لەو چیرۆکە دەکەمەوە کە خۆم بینیومە پێش ماوەیەك: کابرایەکی نەخوێندەوار بە توندی چووە بە گژ برادەرەکەیدا بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین و ناشایستە لە بەرئەوەی کە ووتوویەتی: "باران هەڵمە". چونکە کابرای نەزان و نەخوێندەوار گومانی وا بووە کە ئەم قسەیە کوفرێکی ڕووتە و پێچەوانەی ئەرك و فرمانەکانی بڕواهێنانە بە ڕێکخستنەکانی دروستکەر (خالق ـ عزوجل!)

هەروەها لە کاتێکدا نەخۆشی سك چوون بڵاو بوویەوە لە عێراقدا ساڵی ١٩٢٦ خەڵکی هەموو ڕایانکرد لە خواردنی چارەسەرساز و پەنایان برد بۆ سازدانی ئاهەنگە ئایینیەکان و خوێندنی دوعا و شتی لەم بابەتانە.[٢٢]

بۆ هەر یەکێك لەم دوو عەقڵییەتە، ساویلکە و پێشکەوتوو، چاکەکانی و خراپەکانی ـ وەك لە پێشەوە باسمان کرد. عەقڵییەتی ساویلکە مرۆڤ کێش دەکات بۆ بیر و باوەڕێکی چەسپاو لە گەڵ دڵنیاییەکی وا لە لایەك سنووری نەبێت، هەر ئەو دڵنیاییەش وای لێ بکات کە درۆ و دەلەسە پڕوپووچەکان بەڕاست بزانێت لە لایەکیترەوە. بەڵام عەقڵییەتی پێشکەوتوو وا لە مرۆڤ دەکات باوەڕی لاواز بێت و لەهەمان کاتیشدا بڕوای بە ئەفسانە و پڕ و پووچ زۆر کەمە.

ئەمە کێشەیەکە و دوو ئاستی هەیە. وە ژیانیش پڕە لە نموونەی وەك ئەم کێشەیە کە مرۆڤ ناتوانێت ڕزگاری بێت لە یەکێك لە ئاستەکانی بۆ ئەوەی گیرۆدەی ڕووبەڕوو بونەوە بێت لە گەڵ ئاستەکەیتر دا.

خاوەنی عەقڵیەتی پێشکەوتوو ئەوەیە هەمیشە ژیری و دانایی زۆرترە و دووربینە و ووردبینە لە ڕێکخستنی کاروبارەکانیدا لە عەقڵیەتی ساویلکە.

ئەمــە و بــەڵام گومــانكردن و دوودڵــی و ڕاڕایــی وای لێــدەكات لاوازتــر بێــت لــەوەی ڕووبەڕووی كێشەكان بێتەوە جاروبار، ئەومیە وەك لەپێشەوە باسمان كرد، بۆیە لە ژیانیـدا كاریگەریەكانی مادده بەكار دێنێت و كاریگەریەكانی دمروون فەرامۆش دەكات.

★ ★ ★

ئەگەر ساحیرێكی ساویلكەكان بیەوێت بە سیحرەكەی یەكێك بكوژێت ئەوا پەیكـەرێكی بچووكی لە قوڕ بۆ دروست دەكات و پاشان مینگەمینگێك دەكات بەهەندێ ووشـەی شاراوە و چەقۆكەی بەرز دەكاتەوە و لەهەوا دا ڕای دەوەشێنێت و ئینجا نووقمی دەكات لـە سـنگی پەیكەرەكـەدا. (فریــزەر) توێژەرەوەیــەكی شارســتانی ناســراوە دەڵێــت: ئــەو پیــاوەی كــە دمیەوێت بیكوژێت ناتوانێت گوێ بگرێت لەوەی ساحیرەكە دمیكات لە دژی بۆ ئــەوەی پــەنا بەرێتە لای ساحیرێكیتر و ئەو كارلێكردنە كوشـنـدمیەی لێ دوور خاتــەوە ... ئەگـەر هـاتوو بێ ئومێد بوو لە دۆزینەوەی ساحیرەكەیتر بۆ ئەوەی لەشەڕی كوشتن ڕزگاری كات، ئەوسا ئامادە بێت بۆ بەڵاكە و مان دەگرێت لە نان خواردن ... تا ئەو كاتەی دەمرێت.[٢٣]

بێگومـان پیـاوی عەقڵیـەتی پێـشكەوتوو دەگمەنـە بمرێـت وەك ئـەم مردنـە ناشیرین و قێزەوونە... تەنانەت ئەگـەر ساحیرەكە هـەزار پەیكـەری قـوڕی بـۆ دروسـت كـات و هـەزار چەقۆش لە سینگیاندا نقوم بكات! ئـەو سـاحیرەی كـە بـەم ڕێگایـە خـەڵك دەكوژێـت لـەناو سـاویلكەكاندا بێگومـان دەتوانێـت چاكیـشیان كاتـەوە لـە كـاتی تووشـبوون بـە نەخۆشـی و بریندارببوونە كوشندەكانیان. چونكە هێزی دەروونی ئەگەر خەڵكی بڕوایان پـێی هـەبێت دەبێتە خاوەنی كاریگەریەكی چالاك لە هەر دوو لایەنی چاكی و خراپیەوە پێكەوە.

ئـەوەش زینـدوو دەبێتـەوە و دەمرێـت ـ قـازانج دەكـەیت و زەرەریـشت لێ دەكـەوێت ـ گەڕانەوە نیە لە بڕیاردانیدا.

بەڵام ساویلكەكان لە بەرهەم هێنانی هێزە دەروونیەكانیاندا گەیشتوونەتە ئاستێك كە تێگەیشتووەكان ناتوانن بگەنە دە یەكی ئەو ئاستە.

(سینڵ) بۆمان دەگێڕێتەوە: لەكاتێكدا جەنەڕاڵ (غردون پاشا) كوژرا لـە (خـەرتوم) لـە كـاتی بزووتنەوەیـەكی مەهدیـدا، یـەكێ لـە سـاویلكەكان لـە خـوارووی ئەفـەریقا هـەواڵی

مردنەکەی ڕاگەیاندبوو لە هەمان سەعاتی ڕوودانی کارەساتەکەدا، ئەمە و بۆ زانین ماوەی نێوان هەر دوو شوێنەکە نزیکەی چوار هەزار میل دەبێت.[٢٤]

هەروەها یەکێ لە ڕۆژنامە ئینگلیزیەکان باسی چیرۆکێك دەکات لە ژێرناوی "لاسلکی ئادەمیزاد" کە تیایدا هاتووە: پیاوێکی بەتەمەنی ئەسکیمۆیی رایدەگەیەنێت بە هەندێ لەو گەڕیدانەی کە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کەنەداوە هاتبوون کە گوایە هاوڕێیەکیان کوژراوە "لە هەمان ئەو چرکەیە دا کە ئەم قسەیەی تیا کردووە" لە یەکێ لە شارەکانی ئەمریکای ناوەڕاست، هەروەها ئەم پیاوە پیرە بە جۆرێك ڕووداوەکەی بەدوور و درێژی باس کردووە هەروەك ئەوەی خۆی لە شوێنی کارەساتەکەدا ئامادە بووبێت. پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ڕووداوەکەدا گەڕیدەکان سەردانی شوێنی ڕووداوەکەیان کرد و بۆیان دەرکەوت ئەوەی پیاوەکە ووتوویەتی هەمووی راست بووە لە دوورترین لایەنی گێڕانەوەکەدا.

هەروەها (سینلێ) بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە لە بارەی کوڕەکەیەوە کە ئەندامی دەستەیەکی هەناردە بووە رۆشتووە بۆ گەڕانی هەندێ لە ناوچەکانی سودانی خواروو. پوختەکەی ئەمەیە: کوڕەکەی بەتەنها وون بووە لە ناو دارستانەکاندا، پاش ئەوەی شەوێك بەسەر دەبات لە وونبوون و تەنهاییدا ئەوسا پیاوێکی لەساویلکەکان بە خۆی و بارگیرەکەیەوە لێی پەیدا دەبێت، لە کاتێکدا پرسیارمان کرد لە کابرای ساویلکە چۆن شوێنی کوڕە گەڕیدە وونبووەکەی زانیوە لە ناو دار و درەختی ئەو دارستانە دا کە چەند میلێکی زۆر دوورە لە ڕێگای ئاسایی کوتراوە و چەوڕێژ کراوە و زۆر بە سادەیی وەڵامی دایەوە: "بە هۆی خواوە!".

لەوانەیە بڵێم زیادەڕەویم نەکردبێت ئەگەر بڵێم مرۆڤ هەر چەندە شارستانێتی ماددی ئاڵۆز بێت و ڕۆشنبیری عەقڵی لەزیادبووندا بێت بەو پێیەش هێزە دەروونیەکانی بەرەو لاوازی دەڕوات. وەك ئەوە وایە دەروون و ماددە لە دوو لای جیاواز لە یەکتر دابن، هێزی یەکێکیان گەشە ناکات ئەگەر لەسەر حسابی هێزی ئەویتریان نەبێت.



 

(سمنــر) توێژەرەوەیــەکی کۆمەڵایــەتی بەناوبانگــە دەڵــێ: ســاویلکەکان ئەگــەر دوو ڕووداویــان بــینی یــەك لــە دوای یــەك ڕوویانــدا خێــرا ڕادەکــەن بــۆ بەســتنەوەی هــەر دوو ڕووداوەکە بەیەکەوە بە پەیوەندی "هۆ و ئەنجامەکەی".

(سمنر) گێڕانەوەی زۆری لایە لەو چیرۆك و بەسەرهاتانە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئـەم بـیر و بۆچوونە، ئـەویش لـەو گەڕیـدە توێژەرەوانـەی وەرگرتـووە کـە تێکـەڵاوی ساویلکەکانیان کردووە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ژیانیان ئەنجامداوە ـ لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانە.

جارێکیــان لــە یــەکێ لــە دوورگــەکانی ئۆقیانووســی هــێمن دا ڕوودەدات یــەکێ لــە ساویلکەکان دەست دەکات بە پیشەسازی خەزەف بەڵام بـە ڕێکـەوت مـردووە، بۆیـە هـەموو خەڵکی دوورگەکە وای بۆ دەچن کە هۆی مردنەکەی لە ئەنجامی ئـەو پیشـەیەوە بـووە، لە بـەر ئــەوە مومارەســەی ئــەو پیــشەیان لــە خۆیــان قەدەغــە کــرد بــە قەدەغــەکردنێکی یەکجارەکی، پیشەسازیەکەش لە دوورگەکەیاندا بۆ هەتا هەتایە سەری نایـەوە و ئاسـەواری نەما.

هەروەها جارێك ڕوو دەدات پیاوێکی سپی گۆچانێکی نەخشێنراو پێش کەش دەکات بـە یەکێ لە ساویلکەکانی خوارووی ئەفەریقا،وا ڕێدەکـەوێت کـابرای سـاویلکە پـاش وەرگـرتنی گۆچانەکە یەکسەر دەمرێت، لە کاتێکدا کوڕی کابرای مردوو گۆچانەکە وەردەگرێتـەوە بـۆ خۆی دووبارە ئەویش دەمرێت.

لەبەر ئەوە ساویلکەکان لەمەوە داهێنانێکیان هێنایە بەرهەم کە ئەو داهێنانەش گومان هەڵناگرێت و ئەوەیە کە دەڵێ: فریشتەی مەرگ خۆی حەشار داوە لـە نـاو ئـەو گۆچانەدا. بە پەلە بیگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی بۆ ئەوەی مەرگ پەیوەندی نەکات بە هەموو ئەوانەی وا لە ناو گوندەکەدان....

هەروەها جارێکی تر هەموو خـەڵکی گوونـدێك لـە گونـدەکانی ساویلکەکان کـۆك بـوون لەسەر ئەوەی کە تەنها جارێك لە ژیانیاندا ئەویش یەکەم جار بـووە چـاویان کـەوتووە بـە حوشترێك، پاشان نەخۆشی (کۆلێرا) بڵاو بووەتەوە لە ناویاندا بە هـۆی ئـەو نەخۆشـیەیان دایە پاڵ هاتنی ئەو حوشترە بەستەزمانەوە.

هــەروەها (سمنــر) دەیگێڕێتــەوە: ڕۆژێــك لــە ڕۆژان کۆمــەڵێك لــە ئەســکیمۆییەکان دەردەچـن بـۆ ڕاو و بــەڵام هیـچیان دەسـت ناکـەوێت, یـەکێکیان دەگەڕێتـەوە بـۆ شـوێنی

هەڵخلیسکانەکەی و ئێسقانێکی گرتووە بە دەستیەوە و لە ڕێگا فەقمەیەك (گۆلکی دەریا)یەك دەبینێ و ڕاوی دەکات، ئەم سەرکەوتنەی بەوە لێك دەداتەوە کە ئەنجامێکە لە ئەنجامەکانی هەلگرتنی ئێسقانی سەگەکە، لە بەر ئەوە هەر جارێك دەرچوایە بۆ ڕاو ئیسقانەکەی لە گەڵ خۆی دەبرد.[٢٥]

بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە بیرکردنەوانە لە ناو ساویلکەکاندا بێگومان دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی درۆ و دەلەسە و پڕ و پوچەکان و داب و نەریتە بێ‌ماناکان. بۆیە یەکێکیان نیە بتوانێت سەرنجی حاڵەتێکی دیاریکراو بدات و پاشان تێیدا سەرکەوێت، پاش ئەوەیە یەکدەنگی خۆیانی لەسەر دەردەبڕن تا ئەو حاڵەتە بەوە لێك بدەنەوە کە لە ناوەڕۆکیا لە سەر ڕۆحێکی شاراوە بۆتە هۆکاری سەرکەوتنی ئەو حاڵەتە لە هەموو کاتێکدا. بەم جۆرە حاڵەتەکە (بڕیارەکە) دەچێتە ریزی داب و نەریت و هەڵسوکەوتە میراتیەکانەوە، پاشان بەرە بەرە پیرۆز دەبێت.

لەسەر ئەم تان و پۆیە کۆ دەبێتەوە شتە بێ‌مانا وپڕ و پوچە پیرۆز کراوەکان لەنێوان ساویلکەکاندا کەوە لە دوای ئەوە.

سەرپێچی لەوە ناکرێت ئەم شێوە بیرکردنەوەیە هەندێ جارسوودی لێ بەدی دەکرێت بەو ڕێژەیەی کە زەرەر و زیانی لێ بەرهەم دێت. ئەو کابرا ساویلکەی ئێسقانی سەگ لە گەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت لە کاتی ڕاودا هەر ئەویشە باوەڕی هێناوە باوەڕێکی نەگۆڕ بەوەی کە ڕۆحی ئێسقانەکە دەپارێزێ و سەری دەخات، بێگومانیشە لەوەی ئەم بەهێزترە لە ڕاو دا لەو کەسەی ئێسقانی هەڵنەگرتووە و خاوەنی بیر و باوەڕ نیە.

ڕاوچی دڵنیا لە دەروون و بڕوادار بەسەرکەوتنی ئەهوەنترە لە بەرامبەر مەترسیەکاندا تا ئەو ڕاوچیە ترسنۆکەی وا ناتوانێت تەنانەت بڕوانێ بۆ ئاژەڵە زیان بەخشەکان.

ڕاوچی ترسنۆك دەردەچێت بۆ ڕاوکردنی نێچیرێك لە ئاژەڵەکان بەڵام خۆی دەبێتە نێچیری ئاژەڵەکە.

ئەو ئەوروپیانەی دەڕۆن بۆ ڕاو لە دارستانەکانی ئەفەریقا و هیند و ئەوانی‌تر ئەم ڕاستیە باش دەزانن. چونکە لەوێ چاویان دەکەوێ بە ڕاوکەری بلیمەت و بەتوانا کە بڕوای بە خۆی هەیە تا پلەیەکی سەرسوڕهێنەر چونکە ئەو ڕاوچیە لەو بیر و باوەڕە دایە

 

بەخت یاوەریەتی یان پارێزگاری لێدەكرێت لە لایەن هەندێ لە هێزە شاراوەكانەوە (نادیارەكانەوە).

زۆر جار شتێكی یادگاری پێیە كە دڵخۆشی دەكات و گەش بین دەبێت پێی، ناچێت بۆ راو لە كاتێكدا ئەگەر ئەو شتەی پێ نەبێت[٣٦] ئەو كاتە وای لێ دێت رێویەكان میزی پیا بكەن.

بیركردنەوەی زانستی كەسەرتاپای ژیانی پێشكەوتوو دەگرێتەوە لەسەر ئەو شێوازە ناڕوات. چونكە بیركردنەوەی زانستی داوا لە هۆكار دەكات تاچەند جارێك خۆی دووبارە كاتەوە، وە لە هەر جارێكدا هەمان ئەنجام بەدەست دەهێنرێت، هەتا وای لێدێت بەهۆكارێكی ئاراستەكەر دەژمێردرێت.

پێشكەوتوو باوەڕی بەو یاسا سروشتیانە هەیە كە لەسەر یەك شێواز دەڕوات لە هەموو كات و شوێنێكدا، ئەو یاسایانەش بەوە لێك دەداتەوە "كەسایەتی نیە" بەوەی دەسەپێنرێت بەسەر هەموو خەڵكێكدا بەبێ جیاوازی (ئەمە لە روانگەی كەسی پێشكەوتوەوە). ئەم بیركردنەوە زانستیە وا لە كەسی (مەدەنی) پێشكەوتوو دەكات تا بتوانێت نهێنیەكانی سروشت بدۆزێتەوە و زۆربەی ئاڵۆزیەكانی شیكار بكات.

پێشكەوتوو جڵەوی ماددە دەگرێت بەدەستیەوە، بەڵام جڵەوی دەروون بە دەستیەوە بەرەڵا دەبێت لە هەمانكاتدا، بۆیە واقیعی و ژیر و وردبینە، هەروەها دوودڵ و ڕاڕاشە، دەگمەنە لە ناو خەڵك دا بكرێت: "كۆكردنەوەی نێوان ژیریی بیركردنەوەی پێشكەوتوو لەلایەك و دڵنیایی بیركردنەوەی لە لایەكیترەوە".

لەمەو پێش ئاماژەمان پێدا بەوەی دەگمەتە عەبقەرەیەك هەبێت بتوانێت هەموو شتەكان كۆ بكاتەوە لە نێوان ژیری و شێتیدا، لە نێوان كۆشش و تەمەڵیدا، وە لە نێوان توانا و فەرامۆش كردن دا بەو ئومێدەی ئێستا بتوانین ئەم زیادەیەش بخەینە سەر: "بەوەی كە بتوانێت هەردوو وەسفی بیركردنەوەی ساویلكەیی و بیركردنەوەی پێشكەوتوو پێكەوە گرێ بدات". لەوانەیە راست بێ بڵێین: عەبقەریەت ئەوەیە ناتەواویەكان كۆكاتەوە لە یەك كەسایەتیدا.

ئەو كەسەی خاوەن ژیریە لە هەموو كاتێكدا هەر ژیرە، وەك ئەو شێتەی كە هەمیشە هەر شێتە، لە چاكە بەرهەم ناهێنرێت تەنها كەمێك نەبێت.

 

ئەو کەسە چوست و چالاکەی هەموو کارەکانی بە پەرۆشیەوە ئەنجام دەدات هەندێ جار جیا ناکرێتەوە لەو تەمەڵ و تەوەزەلەی کە تەنها دروێنەی گەمەی ژیان و تاڵیەکەی دەکات.

خاوەن بیرکردنەوەی زانستی لە ژیاندا سەرناکەوێت زیاتر لەوەی کە پێی سەردەکەوێت خاوەن بیرکردنەوەی ساویلکەیی، چونکە ئەو لە ڕوویەکەوە قازانجی لێدەکات و لەڕووەکەی‌ترەوە زەرەرە.

بێت و گەر لێکۆڵینەوەی کەسایەتی هەر یەك لە سەرکەوتووە گەورەکان بکەیت ئەوا ناوازەییەکانیمان بۆ دەردەکەوێت. لەوەدا کە قاڵبێکی دیاریکراو وەرناگرێت و تیایدا بمێنێتەوە ماوەیەکی دوور و درێژ هەر ڕۆژەو لە دۆخێکدایە، ئالێرەدا جیاوازی سەرکەوتووی گەورە لە گەڵ پیاوی ناسایی دەردەکەوێت.پیاوی سادە و ئاسایی کەسایەتیەکی بەبەردبوو (کۆنکرێت)ی هەیە نەگۆڕانی بەسەر دادێت و نەئاڵ وگۆڕیش لە خۆیدا دەکات مەگەر بەدەگمەن. تۆش دەتوانیت بە سیمایا بیناسیتەوە لە هەموو کاتێکدا. بەڵام پیاوی گەورە دەبینی شپرزە و بزێوە و لە یەك شوێندا ئارام ناگرێت، جارێك دەبینی سارد و سڕە و گوێ ناداتێ جارێکی‌تر دەبینی تووڕە و هەڵمەت بەرە و بۆکسێك بهاوێژێت نایکات بە دوو. هەندێ جار ژیر و دانایە و هەندێ جاریش خورافیە، جارێك عاقڵە و جارێك شێتە. باوەڕدارە لە هەندێ کاتیدا، لە پاشماوەی کاتەکانی‌تریدا گومانی هەیە.

لە واقیعدا کەسایەتی گەورە شتێکی شازە. جێگای شەرمەزاریە دەبینین خەڵکانی سادە نەیانەوێت لاسایی گەورە بکەنەوە و هەوڵ دەدەن وەکو ئەویان لێبێت.

(بلیمەتی) گەورەیی گیراوەیەکی ـ پێکهاتەیەکی ـ سەرسوڕهێنەرە لە نێوان بەهرەکانی هەست و نەستدا، گەورە تێدەکۆشێت ڕەنجدەرە، ووردبین و ڕاستی دەرخەرە، هەتا ئەو ئاستەی دەگاتە لێدانی زەنگی سەعاتی کۆتایی و یەکلاکەرەوە ئەوسا گورزی خۆی دەوەشێنێت کە گورزێکی شکێنەرە و لەو کاتە دا مل کەچ ناکات بۆ ووردەکاری و لێکۆڵینەوە.

لەسەر هەمان نموونە بڕوانە بۆ پێغەمبەری عەبقەری ـ موحەممەدی عەبدوڵڵا د.خ ـ ئەم پێغەمبەرە عەبقەری و دەگمەن و ژیر و دانا و واقیعی و دووربین بووە، کاتێك پلانەکانی داناوە یان ڕێبەرایەتی جەنگەکانی کردووە یان خەڵکی خستۆتە دوودڵیەوە.

 

بەڵام ئەگەر ئەو کاتەی ڕووی دەکردە خوای خۆی ئەوا خۆی لەبیر دەچووەوە و لە ئیمان و باوەڕیەکی وا سەرسوڕهێنەردا نقوم دەبوو، خەڵکی وایان دەزانی شێت بووە بەڵام خۆ ئەو شێت نەبوو ـ پەنا بۆ خوا ـ

دەگێڕنەوە لێی کاتێك پێش ئەوەی جەنگی بەدری گەورە ڕوو بدات ئاماژەی کرد بۆ هاوەڵانی شارەزا و کارامە لە بواری جەنگدا تا خۆیان کۆ بکەنەوە و لە گەڵیا بن بەهەموو سەربازە ئازا و چاونەترسەکانەوە و ئەمیش وەك هەر پێشەوایەکی هەڵکەوتە و دیار لە گۆڕەپانی جەنگەوە هەتا ئەو کاتەی سەعاتی تێکۆشان و خەبات هاتە پێشەوە و وادەی جەنگ دەستی پێکرد، کەچی لەوکاتەدا هەر دوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و حەپەسابوو لە دەروونی خۆی و دەستی کردبوو بە پاڕانەوە و دۆعاکردن لای خوداکەی، دوعاکردنێکی بەجۆش و گڕاوی و سوورەوە بوو کە لە جۆری ئەو دۆعایانە بوو بەردی بێگوێی دەقڵیشاندەوە.

ئەوە بوو کە ئا بەم شێوەیە لە قۆناغی ئامادەباشی و چاونەترسیدا بەهۆی کاریگەری دەروونیەوە هەموو شتەکانی ئاوەژوو کردەوە لە قۆناغی هێرشکردندا، بۆیە ئا بەو شێوەیە دوو لایەنی دژ بە یەکی کۆکردەوە لە خۆیدا، جا بۆیە لەم بارەیەوە ئەبی عەلای مەعەڕڕی دەڵێ: شوێنکەوتوانی موحەممەد ئەوانەن: ئەگەر عاقڵ و زیرن ئەوا دینیان نیە یان ئەگەر دیندارن ئەوا عەقڵیان نیە ـ وە لاحول و لاقوە الا باالله...



 

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم

Joad, Guide To Modren Thonght,P.٣٦(١)

(٢) بڕوانە/ مجلة الثقافة، العدد(٥٢) من السنة الأولى.

(٣) لەو کاتەدا هەندێ لەو خوێنەی پرژایە سەر جلەکانم چونکە لە نزیکییەوە دانیشتبووم.

(٤) بەهەرحاڵ لەوانەیە ئازارێکی کاتی پێ گەیشتبێت، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم گەڕایەوە بۆ هۆشی خۆی و چاك بوویەوە. بۆ بەیانیش ڕۆشتەوە بۆ ناو کەس و کاری و هەروەکو هیچیش رووی نەدابێت وابوو.

(٥) بڕوانە: عباس العقاد، الله، ص٢٨٧.

(٦) بڕوانە: يعقوب صروف، رسائك الأرواح، ص٩٣ ـ ٩٤.

(٧) هەمان سەرچاوە، ص١٢٠.

(٨) وليم جيمس، اراده الاعتقاد، ص٢٤.

(٩) Tyrrell, op. cit. P.٢١٨ – ١٩

(١٠) يعقوب صروف، رسائك الأرواح، ص١٦٦.

(١١) مجلة المختار، المجلد الثالث، العدد ١٤، ص١٢٠.

(١٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١١٠

(١٣) يعقوب صروف، رسائك الأرواح، ص١٨٣.

(١٤) بڕوانە: Humphrey, The Story Of Mans Mind,P.٢٦٧-٧٠

(١٥) يعقوب صروف، رسائك الأرواح، ص٩٣.

(١٦) بڕوانە: Rhine. New of The Mind,P.٢١٦

(١٧) جريده الهاتف: العدد ١١٩٨، في ١٦ تموز ١٩٥٢.

(١٨) وليم سرجيوس، الايحاء، ص٧٤ ـ ٧٣.

(١٩) بڕوانە: Vaihinger The Philosophy of 'As If'

(٢٠) بڕوانە: Kelsen, Society and Nature

(٢١) بڕوانە: Levy – Bruhl, Primitive Mentality

(٢٢) لەو کاتەدا من خۆم قوتابی بووم لەیەکێ لەقوتابخانە سەرەتاییەکانی ئەو کاتەدا, بۆیە لەهەندێ لە ئاهەنگە تایبەت و دیاریکراوەکاندا دوعایەکی تایبەتم دەخوێند بۆ خۆ پاراستن و چاو و نفوس و دوور بوونم لە بەلا و نەگبەتی. بەلام من ئێستا دڵنیام کە ئەو دۆعایە منی پاراستووە لە هەندێ نەخۆشی و دەردی سەری بۆیە بەهەموو شێوەیەك باوەڕیم پێی هەبووە لەو کاتەدا. هەر چۆنێك بێت ئەو ڕۆژانە گوزەشتن و تێپەڕین ــ بەلام زۆر بەداخەوە.

(٢٣) لەم کتێبە وەرگیراوە: Ehrenwld, OP. cit. P. ١٥

(٢٤) بڕوانە: سینل، الحاسە السادسە، ص٦١

(٢٥) بڕوانە: Sumner, Folkways, P. ٢٦ – ٣٢

(٢٦) زۆر بەڕوونی ئەمە هەست پێدەکەین لەنێوان بازرگان و سەرباز و قومارچییەکان و موجازەفەچییەکاندا و هەر یەکیان شتێکی یادگاری لەگەڵ خۆیدا هەلگرتووە پێی وایە دەبێتە مایەی خێر و بەرەکەت و پیت و فەڕ بۆی. بۆ نموونە سەیر ئەکەی هەندێکیان خانووە شڕۆڵەیەکی هەیە دڵی نایە جێی بهێڵێت و دەستکاری کات چونکە زۆر دڵی پێ خۆشە و خێری لێ دیوە، یان هەندێکیان دەبینیت موستیلەیەك یان کلکەوانەیەك دەکاتە یەکێ لە پەنجەکانی و پێی وایە مایەی خۆشی و بەختەوەرییە و بەهۆیەوە سەردەکەوێت لە کاروبارەکانیدا. هەموو ئەم حاڵەتانە هەندێ جار سوود بەمرۆڤ دەگەیەنن بەلام بەمەرجێك ئەو کەسە سیقەی بەدەرەوونی خۆی بێت و بڕوای بەو شتە هەبێت کە پێڕەوی دەکات "لەکوردەواری خۆشماندا ئەو بەزمە هەیە گەر بێتوو یەکێك شانسی هەبێت و ڕوو لەقازانج بێت و ئافرەتی جوان دەورەی بدەن، پێی دەڵێن بابە وازی لێ بێنە ئەوە کوزە کەمتیاری پێیە کێ ئەتوانێ ئەو بەخت و ناوچەوانەی ئەوی هەبێت. و: کوردیی".

(٢٧) عومەر ئەو حەقیقەتە گەورەیەی کورتکردۆتەوە لەووتە بەناوبانگەکەیدا کە دەڵێت : "اعقل و توکل".

 

# پاشكۆی ئەم كتێبە

لە قۆناغە جیاوازەكانی مێژوو دا چینە فەرمان ڕەواكان پلەكانی فەرمان داریان بڕیوە لەسەر ئەو پاساودانەی كە هێناویانەتەوە بۆ فەرمانڕەواییە ناڕەواكانیان بە هەموو جۆرەكانی بڕ و بیانوو. بۆ نموونە لە چاخەكانی ناوەڕاست دا بەوە پاساوی فەرمانڕەواییەكانیان دەهێنایەوە گوایە لە حەقێكی خواییەوە وەریان گرتووە، ئەوان سەربازی خوان یان سێبەری خوان لەسەر زەوی.

پاش ئەوەی شۆڕشی پیشەسازی سەریهەڵدا لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، پیاوانی فەرمانڕەوا پەنایان بردە بەر بڕوو بیانوویەكیتر بۆ پاساودانی فەرمانڕەواییەكەیان ـ ئەویش بیانووی ((بۆ هەر كارێك تێبكۆشیت وەدەستی دێنی)) بوو. ئەوان بە چاوێكی سووكەوە سەیری میللەتیان دەكرد لەسەر ئەو لێكدانەوەیەی گوایە پێكهاتوون لە خەڵكانێكی بازاڕی و ساویلكە و نەزان و تەمەڵ و تەوەزەل لە وانەی وا دابڕاون لە سەركەوتن بەسەر پەیژەی بەختەوەریدا.

لەمەو پێش باسمان كرد بیر و باوەڕی ((بۆ هەر كارێك تێبكۆشیت وەدەستی دێنیت)) سوودی لێ وەردەگرێت بۆ پەروەردەكردنی منداڵی ورد و بچووك، بەڵام دەست لێدانی بیر و باوەڕێكی ترسناكە ئەگەر بخرێتە ئەستۆی گەورەكان، چونكە ئەگەر ئەوە بڵاو بێتەوە لە نێوان گەورەكاندا ئەو كاتە دەبێتە بیانوویەك بە دەستی بەهێزەكانەوە تا بێهێزەكانی پێبخۆن و ڕسوایان كەن و بەكاریان بێنن. ئەگەر هاتوو بێهێزەكان داوای مافەكانی خۆیان بكەن ئەوا بە لاف و گەزافەوە پێیان دەڵێن: ((بۆ هەر كارێك تێبكۆشیت وەدەستی دێنیت)).

هەر چەندە ئەم بیر و باوەڕە قێزەوەنە بڵاو بووەتەوە، لە شارستانیەتی ئیسلامیدا، لە سەرەتای سەردەمی بڵاوبوونەوەیدا، پێش بڵاوبوونەوەی لە ڕۆژئاوادا. ئیسلام ئایینێكی

زۆر چاك بوو بۆ نەهێشتنی جیاوازیە چینایەتیەكان و ئاشكراكردنی یەكسانیەكان لە نێوان خەڵكیدا، لەبەرامبەر ئەمەشدا فەرمانڕەوا خۆ بە گەورەزانەكان چاریان نەما بەرامبەر موسڵمانەكان ئەوە نەبێت بیر و باوەڕی ((بۆ هەر كارێك تێبكۆشیت وەدەستی دێنیت)) بخەنە ئەستۆیان بۆ داپۆشینی.

فەزڵی كوڕی یەحیای بەرمەكی دەڵێ: كۆمەڵانی خەڵك پێك هاتوون لە چوار چین:

"لە پێش هەموویانەوە چینی مەلیك و پادشاكان كە بەشی شێریان هەیە، پاشان وەزیرەكان كە بەچاكە و پیاوەتی و زرنگی و وەرگرتنی بیر و ڕایان ناسراون، دوای ئەمانیش چینی باڵادەست و ناوەندە خۆشگوزەران و خانەدانەكان دێن، ئیتر چینی كۆتاییش خەڵكانی ڕەش و ڕووت و بێبایەخ و بلقی سەرئاون".[1]

ئەم وەزیرە (خۆ بەزانا و تێگەیشتوو دانەرەی) عەباسیەكان لە خۆی بایی بوو بەو ئاسوودەیی و كامەرانی و خانەدانیەی كە بەدەستی هێنابوو لەو سەردەمە هەڵوەشاو و ڕزیوەدا، لەو بڕوایە دابوو ئەو بەدەست هێنانەی بە هۆی تێكۆشان و عەقڵ و كارە بەجێییەكانی خۆیەوە هاتۆتە دی.

ئەو وای بۆ دەچوو هەموو چینەكانی سەرەوە كە گەیشتوون بەو پلە و پایەی وا تێیدا دەژین بە هۆی كۆششی خۆیانەوە بووە. ئیتر پاشماوەی خەڵك هەموو كەفە ژیلەی سەر ئاون (لە ڕوانگەی ئەو دا) و هەرچی و پەرچی و بێڕێزن و مافی ژیانیان نیە.

ئەم وەزیرە لە خۆبایی بووە بۆ دوا جار دەركی بە حەقیقەتی دەروونی خۆی و هاوشێوەكانی خۆی لە هەمان چین كرد، كاتێك كە وا هاروونەڕەشید لێی تورە بوو خستیە زیندانەوە لە (طامور).. لەوانەیە ئیتر لەو كاتە دا هەستی بەوە كردبێت چۆن سەركەوتووە بۆ پلەی وەزیری و پاشان لێی هاتۆتە خوارەوە تەنها لە بەر خاتری مەترسیەك لە سەر ئاگاداریكردنی چێژ و خۆشیەكانی خوا پێداوێكی وەك هارونەڕەشید.

بەڕاستی جێگەی شەرمەزاریە دەبینین ئەدەبی عەرەبی پڕە لەم جۆرە ووتانە كە لە زاری فەزڵی كوڕی یەحیا و نموونەكانی وەك ئەم بوغراو بایی هەوایەوە هاتوونە دەرێ. ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نیە چونكە ئەوە ئەدەبێكە گەشە و نەش و نمای كردووە لەسەر پارمەتیدانی ئەو جۆرە لە خۆباییبووانە و هەروەها لەسەر پاشماوەی سفرە و خوانی ئەوانە ژیاوە.

هەر ئەم ئەدەبەش بۆتە هۆکاری مانەوەی ئەو بێبار و دووروووانەی لەوانەی وا توانیویانە بگەنە پلە و ئاستە بەرزەکان بەو ڕێگا گونجاوانەی پێی چوونەتە ناو ئەم ئەدەبەوە و برِ و بیانووەکانی شانازی کردن و لەخۆبایی‌بوونیان لێوەرگرتووە و لاسایی فەزڵی کوڕی یەحیایان کردووەتەوە لە چەوسانەوەی ڕەش و ڕووتەکانی ژێردەستیان لە داماو و زوڵم لێکراوەکان.

لە واقیعدا پێغەمبەری ئیسلام ڕوانیویەتی بۆ هەموو کۆمەڵانی خەڵك و هەژارەکان بە پێچەوانەی ئەو ڕوانینانەی کە خوا پێداوەکانی دوای خۆی پێیان دەڕوانیە خەڵکی. لە یەکێ لە فەرموودە کاریگەرەکانیدا دەفەرموێ: (إن أهل الجنة كل أسعث أغبر ذي طمرين لا يؤبه له، الذين إذا استأذنوا علىالأمراء لم يؤذن لهم، و إذا خطبو النساء لم ينكحوا، و إذا قالوا لم ينصت لهم، حوائج أحدهم تتخلخل في صدره لو قسم نوره يوم القيامه على الناس لوسعهم)[٢]

پێغەمبەر بە ڕەش و ڕووت و داماوەکانی نەگوتووە "کەفەزیلەی سەر ئاو" وەك ئەوەی فەزڵی کوڕی یەحیا پێی گوتوون، بەڵکو پێغەمبەر ئەوانی زۆر بەرزتر لە مەکانەی فەزڵی کوڕی یەحیادا داناوە، وە سەیر کردن و ئاوڕدانەوەی خوا بۆ ئەوان و بۆ ئەمیر و وەزیرەکان هەمان ئاوڕدانەوەیە و بە قەدەر باڵی مێشێ جیاوازیان ناکات.



ئەوە ڕوون بوویەوە بۆ خوێنەر لە بەشەکانی پێشوو دا کە چۆن سەرکەوتن بە هەموو شێوەکانیەوە هۆکارە جۆراوجۆرەکانی خۆی هەیە.

لەم بەشانەدا هەوڵمانداوە کە توێژینەوە لەبارەی هۆکارە دەروونیەکانەوە بکەین بۆ سەرکەوتن. لە گەڵ ئەمەشدا سەرکەوتن دووبارە هۆکاری کۆمەڵایەتی خۆی هەیە. لەوانەیە وا ڕوو بدات هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان هەندێ جار گرنگتر بن لە بەدەست هێنانی سەرکەوتن دا لە هۆکارە دەروونیەکان. ئەگەر ئادەمیزادێك لە ماڵێکی هەژار و بێنەوا لە دایك بوو هیچ توانا و دەسەڵاتێکی نیە، وە هەر لەو ماڵە و ئەو ژینگە دیاریکراوەی خۆیدا کە ناتوانێت سەرکەوتنی تێدا بە دەست بێنێت ژیان دەگوزەرێنێت و پاشان دەمرێت و هەر لەوێ دەشارێتەوە لە خاکدا، هەرچەندە ئەو مرۆڤە مەوهیبە و هۆکارەکانی سەرکەوتن و

عەبقەرێتیشی تێدا بێت. كەواتە چونە سەرەوە بە سەرپلیكانەكانی سەركەوتندا هەمیشە پشت نابەسترێت بە كۆششی تاك و بیركردنەوەكانی. چونكە تاك لەم پێناوە دا وابەستەیە بەو كۆت و بەندانەوە كە لە ژمارە نایەن. بۆ نموونە ئەگەر توانی رزگاری بێت لە كۆت و بەندەكانی دەوری خۆی، ئەو كاتە كۆت و بەندە كۆمەڵایەتیەكان دێنە رێگای و دەكێشن بە تەپڵی سەریدا.

لەم لایەنەوە عێراق تووشبووە بەو دیاردە كۆمەڵایەتیە كە لەوانەیە زۆر نالەبارتر بێت بۆی لە نەخۆشیە لەناوبەرەكان.

. كاسەلێسەكانی عێراق،[٢] لەو ئاوڕدانەوەیانەوە كە ئاوڕیان پێ دەدایەوە لە مەرایی و مامەحەمە كردنیان و ویژدان و دادگەرێتی تێكەیشتووەكانیانەوە دەیانڕوانی بۆ میللەتی هەژار. روانینێكی پڕ لە سوكایەتی و بچوككردنەوە. لەوانەیە هەستیان كردبێت بەو سوكایەتیكردنەی كە كردوویانە بەرامبەر بە ڕۆڵەكانی میللەت، ئەوە سووكایەتی پێكردنێكە هەڵقوڵاوی ناخی كاریگەریە نەستیەكانیانە لە دەروونیاندا و ئەوانە پێی راهاتوون و تەنانەت جار و باریش ڕێ نابەنە سەری.

رۆژێكیان قسەم دەكرد بۆ قوتابیەكی میسری لە رۆڵەكانی (بەشوات) ئەو كاتە لە گەڵما پێكەوە دەمانخوێند لە ئەمەریكا. كەوتبوومە گفت و گۆ لە گەڵیا لە بارەی سروشتی (تەبیعەت) میللەتی میسریەوە كە بەراووردی ئەوەم بۆ كرد بە چیا بیناسێتەوە لە سروشتی میللەتی سوری... وە پێم ووت: "میسری كابرایەكی جوتیارە و سوریش بازرگانە". كە وام ووت كوڕی پاشا بە تووڕەییەوە لێم دوور كەوتەوە و قسەكەمی بەوە دایە قەڵەم گوایە ئەمە ئیهانەكردنە بۆ گەلی میسری. لەڕاستیدا من ویستم مەدحی میللەتی میسری بكەم بەوەی سروشتیان كە سروشتێكی (تەبیعەتێكی) فەلاحیە.

وە لەو بڕوایەشدا بووم جووتیار لە زۆر ڕووەوە خاوەنی چاكە و پیاوەتیە كە لە بازرگاندا نیە، ئەمەو بەڵام كوڕی پاشا تێنەگەیشت لەم دەربڕینەم. چونكە لە ناخی عەقڵی نادیاریدا گرێكوێرەیەكی شاراوە هەیە هەستی پێناكات كە بۆتە هۆی ئەوەی بە چاوێكی سووكەوە بڕوانێتە جووتیار و وای دابنێت جۆرێكە لەو خەڵكانەی وا ڕێز و نرخیان نیە.

باو باپیرانی پاشا جووتیاریان چەوساندۆتەوە و بەکاریان هێناوە و لەسەر عارەقی نێوچەوانی ئەو ژیاون و لە پاشاندا سووکایەتیشیان پێکردووە و پاشا بە ڕەچەڵەك بۆی ماوەتەوە هەڵگری ئەم ڕەفتاری چەوسانەوە و بەسووك سەیر کردنە بێت بە شارەزایی لە دەروونیا.

وا دێ بە خەیاڵما کە چڵکاو خۆر و کاسەلێسەکانی عێراقیش هیچیان کەم نەبێت لەم پاشایە لەبارەی ڕسواکردن و بەسووکی تەماشاکردنیانەوە بۆ جوتیار و هەژار و مسکێنەکان، بەجۆرێك ئەمەیان بە میراتی ڕەچەڵەك بۆ ماوەتەوە، ڕەچەڵەکی نەستی یان (رەچەڵەکی هەست پێنەکراو و شاراوەیی)، لە عوسمانیەکانی پێش خۆیانەوە...

چەند کەسێك لەو گروپە دەناسم کە پەیوەندیەکی شاراوەیان بە یەکێ لە گەورە کاسەلێسەکانی بەغداوە هەیە، بۆیە ئەو برادەرانە ئیستغلالی ئەو پەیوەندیەیان کردووە لە ئازاردانی خەڵکیدا و بوونەتە ئەو کەسانەی کە ڕزگاریان بووە لە سزا یاساییەکان لەم ماوانەی دواییدا وا ڕوویدا یەکێ لەوانە سەگێکی دڕندە و پەلاماردەری لە بەر دەرگاکەیدا دانابوو هەر کەسێك لەوێوە دەهات و دەچوو قەپاڵی لێ دەگرت و ئازاری دەدا. سکاڵاکانی خەڵك زۆر زۆر بوو لە دەست ئەم سەگە دڕندەیە و کەچی پۆلیس هیچ وەڵام و کاردانەوەیەکی نەبوو لە بەرامبەر ئەو گلەیی و گازندانەدا.

جارێکیان ئەم سەگە هارە قەپ دەکا بە منالێکی هەژار دا و بەدانە تیژەکانی پارچەیەك گۆشت لە قاچی منالەکەوە دەکاتەوە و بە جێی دێڵێت و نزیکی دەخاتەوە لە مردن. خۆم باوکی منالەکەم بینی بە چاوی خۆم کە پیاوێکی هەژاری نەوت فرۆش بوو، نەوتی دەفرۆشت بە عارەبانەی دەستی و هەموو ڕۆژێك ئیشەکەی واز لێ دەهێنا و دەچوو بۆ نەخۆشخانە بە خۆی و منالەکەیەوە بۆ چارەسەرکردنی جێقەپاڵی ئەو سەگە هارە.

یاسا ناتوانێت سزای سەگێك بدات کە پەیوەندیەکی ناڕاستەوخۆی هەیە بە چڵکاوخۆرێکی چڵکاوخۆرەکانەوە، ئەی یاسا دەتوانێت چی بکات بەرامبەر خودی ئەو چڵکاوخۆرە؟!

تۆ ناتوانیت بچیتە ژوورەوە بۆ حەرەمسەرای یەکێ لەو چڵکاوخۆرانە لە فەرمانگەکەیدا هەتا ببینیت کە چۆن لووتی بەرز کردۆتەوە بە حەوادا و ڕووی خۆیت لێ وەردەگێڕێ بەو لادا و ووشەیەك نایەت بە دەمیدا تا ناچار و ناڕەحەت نەبێت.

 

چونكە فیكری جەنجاڵە وەك خۆی پێوەی دەنازێت بە خۆشەویستی نیشتمان و خزمەتی گەل و نەتەوەكەی ـ هەروەها ئەو كاتی نیە بە فیڕۆی بدات بە گوێگرتن لە سكاڵاكانی ئەو موراجیعە هەرچی و پەرچیانەی سەردانی ئەكەن ئەوانەی وا نەخێر و نەسوودیان هەیە بۆ نیشتمان.

لەسەر ئەم پێودانگە دنیا دەسوڕێتەوە لەم وڵاتە هێمن و ئاسوودەیەدا!.. كێشەكە لەوە دایە لەم وڵاتەدا چەوساوە ناتوانێت لە دەروونی خۆیەوە شتەكان دەربڕێت، لە كاتێكدا دەرگاكانی نووسین و وتاربێژی بەڕوویدا كراونەتەوە بۆ ئەو كەسەی دەیەوێت قسە بكات لەبارەی خواپێداوەكان و بڕیار بەدەستەكانەوە.

دەبینیت چەوساوە بێدەنگە و زۆردار قسە•دەكات. بەم شێوەیە زەحمەتە بتوانین دەرك بەو ماوە بكەین وا میللەتی سەركز و داماوی تێدا دەگاتە رزگاربوون لە ئازار و بێبەش بوونەكانی.



رۆژێكیان لە سەر شۆستەكانی یەكێك لە شەقامەكانی نیویۆرك پێڵاوەكانم بۆیاخ دەكرد، ساتێ ناساتێك بۆیاخچیەكە لە بۆیاخ كردن دەوەستا و دەكەوتە قسەكردن لە گەڵ ئەو پیاوەی لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو كە لە شێوە و سیمایدا پیاوێكی ڕێزدار و بەویقار بوو. هەردوكیان قسەیان لەسەر ئەو گەشتە دەكرد كە پیاوەكە تیایدا چووبوو بۆ ڕاو لەگەڵ ژنەكەیدا لە دەشتاییەكانی كالیفۆرنیا...

پاش رۆیشتنی پیاوەكە لە بۆیاخچیەكەم پرسی ئەو پیاوە كێیە؟ لە وەڵامدا ووتی: "ئەوە هاوڕێمە ... بەڕێوەبەری ئەو نەخۆشخانەیە" بە دەستی ئاماژەی بۆ خەستەخانەكە كرد كە زۆر لەوێوە نزیك بوو، لەوانەیە نەخۆشخانە حكومیەكانی لای خۆمان بەكەڵكی ئەوەش نەیەت كە لەو نەخۆشخانەیە دا بیكەن بە چێشتخانەش.

بەراستی سەرم سوڕما كاتێك ئەو بەڕێوەبەرە گەورەیەم بینی كە قسەی دەكرد بۆ ئەو بۆیاخچیەی وا پێڵاوەكانی منی بۆیاخ دەكرد. لەو كاتەدا ئەوەم بە بیر دا هاتەوە كە دەگێڕنەوە لە عەلی كوڕی ئەبی تالیب لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خەلافەتیدا لە كوفە بە

زۆری لە دوکانی بەقالێك دادەنیشت، ئەو بەقاڵە هاوڕێی بوو، هەر کاتێك ئەو لەوێ نەبووایە ئەوا خەلیفە لە جێگەی ئەو خورمای دەفرۆشت.

جەعفەری کوڕی موحەممەد دەڵێ: "پیاوێك نیە خۆی بە گەورە و سەپێنەر دابنێت تەنها ئەوە نەبێت کە خاوەنی دەروونێکی کەنەفت و کەساس بێت". ئەم ووتەیە ڕاست دەردەچێت لە زۆر کاتدا.

هەندێ لە توێژەران وای بۆ دەچن گەورەکان جارجار بەکاری دێنن وەك پەردەپۆش کردنێك لە بەردەم چەند کەسانێکدا. ئەوەی خاوەن جیاکەرەوەیەکی ڕاستەقینە بێت کە جیای کاتەوە لە کەسانیتر هەست بەوە ناکات پێویستی بەم پەردەیە بێت. چونکە ئەو لەسەر سروشتی نەگۆڕی خۆی دەچێتە ناو خەڵکەوە و هیچ پێویستیەکی بە خۆدەرخستن و بایی هەوایی و ڕیاکاری نیە.

بەڵام ئەوەی وا هەست دەکات لە خوار خەڵکەوەیە، یان لانی کەم وەك ئەوان وایە، ئەوا ئەو کەسە هەوڵ دەدات بەربەستێك دابنێت لە نێوان خۆی و خەڵکیدا، پەردەی بایی هەوایی و خۆبەگەورەزانین بۆ ئەوەی ڕاستیە سادەییەکەی دەرنەکەوێت لە ناو خەڵکیدا.

لە زۆر کاتدا لە پەنابردنیدا بۆ دانانی ئەم بەربەستە ڕوو دەکاتە ئەوانەی کە توانای بەدەست هێنانی پلە و پایەیان بە حەقی خۆیان بە دەست نەهێناوە، وە شایانی ڕاستەقینەی ئەو پلە و پایە نیە. ئەوانە ناچار دەبن لە وەها شێوەیەکی ئەم حاڵەتەدا هەڵس و کەوتێکی تایبەت بە خۆیان وەرگرن هەتا پێی جیا بکرێتەوە یان هیچ نەبێ وەکو خەڵك بن.

بەدەربڕینێکیتر: ئەوانە دەرکەوتە جیاکەرەوەکان بۆ خۆیان دادەتاشن. هەر بە دروستکردن دروستی دەکەن، تا جێگەی ئەو جیاکەرەوە ڕاستەقینە سروشتیەی پێبگرنەوە کە لە دەستیانداوە. دەستکردەکان کە ناتەواوەکان ئیلتیزامی پێوە دەکەن و دەمارگیرن تێیدا ئارەزووی نەستی تێیاندا تێر بووە بۆ سەرکەوتن و بەرزبوونەوە و شانازی کردن.

(فیلن) توێژەرەوەیەکی ئەمریکی ناسراوە دەڵێ: تاکەکانی چینی سەرەوە، یان چینی دەسەڵاتدار (predatory) وەك خۆیان دەڵێن: "هەوڵی زۆر دەدەن لە پێناوی داهێنانی ئەو جیاوازیە دەستکردانەی کە پێی جیا دەکرێنەوە لە چینە ڕەنجدەرەکان".[٤]

 

لەبۆچوونی ئەودا، گرنگترین ئەو جیاوازیە زمانە، دەسەڵاتدارەکان هەوڵدەدەن خۆیان وا دەربخەن لە بەردەم خەڵکدا کە ئەوان کاتیان بە دەستەوەیە (leisureclass)، لەمەشدا زۆر بەهێواشی و لەسەرخۆیی کاتێکی دوور و درێژ تەرخان دەکەن لە فێرکردنی دەستوور و ئاخاوتنی زمانی قورس و نارەحەتدا. بۆ ئەوەی ئەگەر قسەیان کرد بەو زمانە ئەوا ئیلتیزامیان هەبێت بەو رێزمانەوە لە قسەکانیاندا لەمەشدا ڕەنجدەران و هەژارەکان دادەبڕێن لە بەشداریکردن تێیدا ئەو کاتە هەست بە کەم و کوڕی دەکەن لە بەرامبەریاندا.

بەڕای (فبلن) ڕەنجدەرەکان بەتاڵیان بەدەستەوە نیە تا بتوانن بە هۆیەوە فێری رێزمان و دەستووری صەرف و نەحو و هونەرەکانی زمانی قورس و نارەحەت بن. چونکە زمانەکەیان هەمیشە تا ئەو پەڕی ئاسانی و کورتکردنەوە ئاسانە لەبەر ئەوەی ئەمان وەك هۆکارێك بەکاری دێنن نەك ئامانج. لەبەر ئەوە لە شێوەی نەزان و دواکەوتوو (بەجێماو)دا دەردەکەون بەرامبەر بە دەسەڵاتدارەکان، لەوانەی وا تەڕاتێن و فڕك و هوڕیانە بە ناو ئەماندا بە هۆی بەکارهێنانی لەفزە ناوازەکانیان و ڕێزمان و دەستووری نەحو صەرفە قورسەکانیانەوە.

ئەم بیردۆزەی (فبلن) هێنایە ئاراوە بایەخێکی گەورەی بە دەست هێنا لە ناوەندە زانستیەکاندا لە ئەمەریکا. لەڕاستیدا دەچەسپێت بەسەر واقیعی ژیاندا چەسپاندنێکی وا نکۆڵی تیاناکرێت.

بەڕوونی ئەم چەسپاندنەی دەردەکەوێت لەشارستانی ئیسلامدا پاش ئەوەی خەلافەت تێیدا قڵپ بوویەوە بۆ مەلیك (فەرمانڕەوا) قەپ گرەکان. چینی دەسەڵاتدار لەو شارستانیەتە دا چاودێری و گرنگی داوە بە بەرزکردنەوە بکەر و نزم کردنەوەی کارلێکراو زیاتر لەوەی کە گرنگی بدات بە سەرەتاکانی ئەو دادپەروەریە کۆمەڵایەتیەی کە ئیسلام بەهۆیەوە هاتەپێشەوە، ئەنجوومەنی دەوڵەت زۆر جار لەسەر ئەوە دەوەستێت لە هەموو کارەکانیدا بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر ئەو ناکۆکیە هەڵگیرساوەی لەنێوان نەحوی و موغنیدا ڕوویداوە لە بارەی نەصبی ووشەکەوە یان جەڕڕی ووشەکەوە یان رەفعی ووشەکەوە...

 

لە هاوشێوەی ئەمە ڕوویداوە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا لە عێراقدا. وەك ئەو "ئەفەندی"یانەی لەو سەردەمەدا زمانی میللەتیان سووك و ڕسوا دەکرد و شانازیان دەکرد بە زمانە تورکیە شکۆدارە خاوەن هاژوهوژەکەیانەوە.

لەکاتێکدا بۆدواجار دەوڵەتی عێراق دروست بوو، بەنەمری و پیرۆزی ناوەکانی (عدنان) و (قحطان) و (نزار) شوێنی ناوەکانی (حکمت) و (مدحت) و (حشمت)یان گرتەوە، "ئەفەندی" گەڕایەوە دواوە و لە دەستیان کەوتە خوارەوە. ئەوە بوو زمانی (سیبویە) و (نفطویە) شەرعیەتی پەیدا کرد و جێگای ئەو زمانە هاژوهوژ دارەی گرتەوە.

ئەمڕۆ بیردۆزی (فیلن) ڕاست دەردەچێت چەسپاندنی بەسەر تێکەیشتووەکان و ئەوانەی لە ڕیزی ئەواندان لە عێراقدا. ئەوان لە ڕوویەك لە ڕووەکانەوە نەمری باو باپیرانیان دەگێڕنەوە بۆ ئەوە، یەکێکیان نابینیت کاتێ قسە دەکات قسەکانی پڕ نەبێت لە وشەی شاراوە و زاراوەی نامۆ. لەوانەیە بەوە لاوازی خۆی داپۆشێت لە ڕووی زانستیەوە، لەوانەشە ئەم ووتەیە گونجاو بێت: هەر کاتێك زانیاریەکانی کەسێك کەم بوو یان ڕۆشنبیریەکەی لاواز بوو ئەوا پەنا دەباتە بەر زاراوەی شاراوە و نامۆ لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا دووبارەی دەکاتەوە و لە هەموو شوێنێکدا فڕێی دەدات.

ئەوەی لەم ڕێگایە پاڵنەریەتی پاڵپێوەنەرێکی نەستیە و هەوڵ دەدات بەمە ئەو گرێ و ئاڵۆزیەی نەهێڵێت کە دەروونی داگرتووە و هەمیشە وەك لە پارێزدایە بۆ جیاکردنەوە و بەرزکردنەوەی ... لەسەر هیچ بنەمایەك.

بینیومە هەندێ لە مامۆستایانی کۆلیژەکانی بەغدا هەوڵیان داوە لە ژووری وانە ووتنەوەدا بە شان و باڵی (بورجێکی عاجیدا) هەڵدەن بە ڕۆشنایی مانگ و بەرەبەیان، وە نایانەوێت دابەزن بۆ باسکردنی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی وا گەل بەدەستیەوە دەناڵێنێت چۆن ناڵاندنێك. ئەوان لەم دابەزینەدا سووکایەتی تیا دەبینن کە شایانی پیاوی ڕووناکبیر نیە و ناگونجێت لە گەڵیا. ئەمانە ئەوەمان بیر دەخاتەوە لە ئارەزووەکانی چینی باڵادەست (دەسەڵاتدار) هەوڵ دەدات بەهەموو شێوەیەك ئەوەی لە توانایدا بێ و پێی بکرێت، ئەو هۆکار و جیاوازیە دەستکردانەی پێ دروست کات لەوانەی وا پێی بەرز دەبێتەوە و شانازی پێوە دەکات لەسەر ئەوانەی کە لەخوارەوەی خۆیدان لە ڕەش و ڕووتی ناو خەڵك.

★ ★ ★

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی کۆت و بەندەکانی چوارچێوەی فیکریمان کرد، هەروەها ئەوەی کە چۆن مرۆڤ ناتوانێت لە بیرکردنەوە و تەفکیری خۆیی، داماڵێت بە داماڵینێکی یەکجارەکی. وابەستەیە بە کۆت و پێوەندەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و شارستانیەوە، ئەم کۆت و پێوەندانە وەك گوتمان، مرۆڤ هەستی پێناکات کاتێ بیر دەکاتەوە. چونکە حاڵەتێکی نەستیە(ناهەستیە). وە هەمیشە مرۆڤ لەو باوەڕە دایە کە گوایە ئازاد و سەربەستە لە بیرکردنەوەیدا بەڵام لە واقیعدا لەم کارەیدا بەستراوەتەوە بە چەند کۆت و بەندێکەوە.

لەبەشی چوارەمدا باسی هەندێ لە ناوەڕۆکەکانی شتە نەستیەکانمان کرد و چۆنێتی بوونیان بە سەرچاوەی خێر و داهێنان بۆ مرۆڤ لە هەندێجار دا، وە هەندێ جاریش دەبنە سەرچاوەی خراپە و چەوسانەوە و ڕسوایی. ئەوە ژیانەوەی کاریگەریە دەروونیەکانە لە لایەکەوە و لە لایەکیتریشەوە گەڕانەوەیە بۆ ئارەزووە خەفەکراوەکان. ئەوەی شایانی ئێمەیە، لەم قۆناغە شلۆق و ناسکەی مێژووەکەماندا کە پڕیەتی لە مت بوون و خەفەکردن، ئەوەیە دەبێ لەهەوڵ دابین بۆ گرنگی دان بە لێکۆڵینەوەی شتە نەستیەکان و تێکرای شتە شاراوە و نادیارەکانیشی کە تیایدایە لەو شتانەی وا مرۆڤ لە حاڵەتە کۆمەڵایەتیەکاندا لەسەری دەڕوات بێئەوەی هەستی پێبکات.

ئەو مەبەستە گەورەیەی هەمانە لەتووشبوونمان بەرهەمی ئەوەیە لە هەموو لێدوان وتار خوێندنەوەکانماندا، لە هەموو کۆڕ و کۆبونەوەیەکی وەعز و ئیرشاد و ئامۆژگاریەکانماندا، تەنها لەسەر هەست دەدوێین و قسە دەکەین، بەڵام ئیتر نەست پشتگوێ دەخەین.

ئێمە ئەگەر بمانەوێت مرۆڤێك چاك بکەین و بۆ دابین کردنی متمانەی ئەو بەخۆمان هاتوو گەر پەنامان بردە بەر ووتوێژێکی مەنتیقی و ژیرانە، بۆ سکاڵاکردنمان لە زوڵمی زاڵمێك ویژدانی بجووڵێنین و پەنامان بردە بەر عەقڵی ئەو کەسە و هەوڵ بدەین ئەو دژایەتیە بەدی بکەین کە ئەو دژایەتی پێدەکات لەبارەی زوڵمی زاڵمەکەوە ـ لەسەر ئەم

 

شێوازە بڕۆین ئەوا دەیەها سەدەمان دەوێت هاوار بکەین و بێن بە دەنگمانەوە، هیچ کەسێکیش وەڵامان ناداتەوە.

بەو هیوایەی ئێستا بتوانین لە ڕێگای پوختەکردنەوە ناوەڕۆکی نەست پۆلێن کەین بۆ سێ جۆر:

١- جۆری یەکەم پێك هاتووە لە کاریگەریەکانی نەست و بۆ لێدوانی ئەمەش مەبەستی گەورەمان لەم کتێبە دا بۆ تەرخان کردووە. لەماوەی توێژینەوەکەماندا ئەوەمان ڕوونکردووەتەوە بۆ خوێنەر چۆن بتوانێت لەسەر درەوشاوەترین ڕووخسار لە مرۆڤدا کاتێ بیەوێ وەسفی خۆی بکات و ڕزگاری بێت لە هەموو گومان و کۆت و بەند و گرێکوێرەکانی.

٢- جۆری دووەم لە ناوەڕۆکی نەست پێك هاتووە لە نارەزووە سەرکوتکراو و گرێدەروونیەکان. باسی ئەوەشمان کرد چۆن ئەم جۆرە لە ناوەڕۆك دەبێتە ئاستەنگ لەڕووی کاریگەریە داهێنەرەکاندا لە کارتێکردن و پیس کردنیەوە جاروبار.

٣- بەڵام جۆری سێهەم ئەوەیە جارێ بە شێوەیەکی کاتی ناوی دەبەین بە ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان. ئەم ئاکارانەش ئەوەیە کە بەشێکی گەورە پێك دێنێت لەو چوارچێوە فیکریەی وا لە پێکهاتەکەی دووایین لەبەشی یەکەمدا. بە زۆری چریە چرپەکانی ویژدان و ئازارەکانی پشت دەبەستێت بەم ئاکارانە.

زۆرینەی خەڵك لەوە دا زیادەڕۆیی دەکەن لە پشت بەستنیان بە ویژدانی مرۆڤایەتی و دانانی بەدەنگی حەقی ڕەها و دادەپەروەری لە مرۆڤدا. ئەمەش هەڵەیەکی نالەبارە. چونکە ویژدان لە ئاراستەی خۆیدا شوێن و جێگە و بەشی خۆی هەیە وەك چۆن بیرکردنەوەش هەیەتی.

نابێت چەوساوە و زۆرلێکراو متمانە بخاتە سەر ویژدانی زۆردار. زۆردار ئەو کاتەی زوڵم دەکات هەست بەوە ناکات کە زۆردارە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو ڕوانینەی ئەو هەیەتی بۆ شتەکان لەو ڕوانگە تایبەتەوەیە کە جیاوازە لەو ڕوانگەیەی وا زوڵملێکراو لێوەی دەڕوانێتە شتەکان. ویژدانی زاڵم و زۆردار لەسەر بنەمای ئەو ئاکارە کۆمەڵایەتیە بنیات نراوە کە زاڵم و زۆرداری پێ ڕاهاتووە لەسەر ڕێزلێگرتنی و باوەڕ پێهێنانی. ڕووانگەی زاڵم پێك هاتووە لەو پێوەرانەی کە پێی گۆشکراوە و خزاوەتە پێکهاتەیەوە لە

 

نێــوان دەســـت و پێوەنـــد و خـــزم و کـــەس و کاریـــەوە و هاوڕێکانیـــەوە و هاوڕێکـــانی قوتابخانەکەیەوە و ڕۆڵەکانی چین و توێژەکەی خۆی.

دادپەروەری و چەوسانەوە دوو شتی ڕێزەیین، هەر وەك چۆن لەمەو پێش ئاماژەمان پێداوە، زوڵملێکراو سەری سوڕ دەمێنێت لە کاتێکدا دەبینێ زاڵمەکەی هەتا بناگوێی ڕۆچوە لە زوڵم کردن و ویژدانیشی ئاسوودەیە بەوەی کە وەك هێشتا هیچی نەکردبێت. بەڕاستی حەق لە گەڵ زاڵمدایە لەو کاتەی وا ئاسوودەیە و زەردەخەنە دەیگرێت لەماوەی زوڵمکردنەکەیدا لەتۆ، چونکە ئەو کار و کردەوەکانی پێوانە دەکات بە پێوانەی ئەو کۆمەڵەیەی لە نێوانیاندا دەژی و ئەو هاوڕێیانەی دەوریان داوە و مەرایی و کلکە لەقێی بۆ دەکەن.

ئەو زاڵمە وا بیر دەکاتەوە و دێ بە خەیاڵیدا کە ئەوە پێوانەکردنێکی ڕاست و دروست و گشتگیرە ئەو لەسەری دەڕوات و بەکەڵکی هەموو کات و شوێنێك دێت ـ بەڵام هەست بەوە ناکات ئەو جۆرە پێوانە کردنانە ئیعتبارییە و تایبەتمەندە تەنها بەخۆی و کۆمەڵەکەیـــەوە. ئاکـــارە کۆمەڵایەتیـــەکان لـــە کۆمـــەڵ و گروپەکـــەی ئـــەو دا وەك گرێدەروونیەکەی تاکە کەسێك وایە!

هەر دووکیان ئاراستەی هەڵس و کەوتی خەڵك دەکرێن و بیرکردنەوەیان کۆت و بەند دەکەن بەبێ ئەوەی پێبزانن و هەستی پێبکەن.

لەیەکێ لەو ڕووداوانەی کە هەرگیز ناتوانم لەبیر خۆمی بەرمەوە ئەو ڕووداوە بوو لە (کازمیە) ڕوویدا پاش دەیان ساڵ لەمەوبەر. ئەوەش هەر چەندە شیتەڵمان دەکردەوە بەشیتەڵکردنەوەیەکی زانستی دەسکەوتووی خاوەن واتایەکی کۆمەڵایەتی لەبار.

ڕووداوەکەش ئەوە بوو کۆمەڵێك لە خەڵکی کازمیە خۆپیشاندانێکیان ساز دابوو، بەهەر هۆیەك لە هۆیەکان بێت، دەرچووبوونە دەرەوە بۆ شوێنە دیار و لەبەرچاوەکانی شارەکە و هات و هاوار و پشێویان نابوویەوە... یەکێ لە چڵکاوخۆرەکان بەسەر سەری چەند پۆلیسێکەوە هات و دەستی کرد بە تەقەکردن بەگوللەی ڕەشاشەکەی بەناویاندا و چەند کەسێکی لێ کوشتن. بەمەش وازی نەهێنا و ڕووی ڕەشاشەکەی کردە ئەو چاخانەیەی کە لەوێوە نزیك بوو پڕ بوو لە خەڵکی دانیشتوو لەوێش کۆمەڵێکی بێتاوانی

لێ کوشتن. ئەمەش بوو بەهۆی گوێپێنەدانی داخوازیەکان و مانەوەیان لە دواخستنی شارەکە دا.

من بۆ خۆم ئەوکاتە قوتابی بووم لە یەکێ لە قوتابخانەکانی ناوەندی، ئەمەش بوویە گەورەترین پەند و سەرەتاکانی ڕەهایی کە مامۆستاکان ئاوی گوێچکەمانیان پێئەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە مێشك و بیرکردنەوەمدا خۆی چەسپاند، لەبەر ئەوە هەستم بەسەر سوڕمانێکی زۆر توونـد دەکرد لە جورئەتی ئەو چڵکاوخۆرە لەسەر کوشتنی خەڵك، بەگوللەی ڕەشاش، بەبێ‌جیاوازی کردن لە نێوان گەورە و بچوکدا یان خۆپیشاندەران و سەیرکەراندا یان لە نێوان وەستاو و دانیشتوودا ـ بەجۆرێك لە شێوەی ئەم ڕووداوە ڕووی نەداوە تەنها ئەوەی ئیتالیەکان نەبێت لە حەبەشە لەکاتی داگیرکاریەکانیاندا کردیان بەخەڵکەکەی ئەوێ.

مامۆستاکان دەیانئاخنیە مێشکمانەوە و واعیزەکانیش وەعزیان دەدایـن بەوەی کە ویژدان نوکی ڕمی حەقیقەتە و دەنگی دادپەروەری و یەکسانیە لە مرۆڤدا. لەسەر ئەم بنەمایە خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو کە ئەو خوێن ڕێژە لە ئەنجامی ئەو خەم و مەراقەدا دەتوێتەوە کە دایکانی پێ سك سووتاو کرد و ژنانی پێ بێوەژن کرد و منداڵانی پێ هەتیو خست، بەوەی ویژدانی بەسەرشۆڕی و بێئابڕوویی دەمێنێتەوە هەتا لە ڕووڕەشیدا دەمرێت!! بەڵام لەکۆتاییدا زانیم بووە بە پاڵەوان و بەسەری پەنجە ئاماژەی بۆ دەکەن. ئیتر هەر لەو کاتەوە زانیم ویژدانی مرۆڤایەتی پشتی پێ نابەسترێت.



لە لێکۆڵینەوەماندا بۆ ناوەڕۆکی نەست شێوەی جیهان بە هەڵگەڕاوەیی دەبینین لەبەر چاوماندا، ئێمە لە پاش دەرخستنەکانمان بۆ ئەوشتانەی شاراوەییان تیا بوو لە کاتێکدا دەبینین شتەکان پێچەوانەی ئەو بینینەیە کە باوباپیرانمان پێیان بینیوە ـ خوا لێیان خۆش بێت.

پشت بەستنی پێشینیانمان بەتەنها عەقڵی کراوە و هۆشیار بۆتە هۆی بەخراپ شکانەوەیەکی زۆر بەسەریاندا. پشت گوێ خستن و نەزانینیان بە نەست (ناهەست) لەوەی کە تێیدایە لە بەخششەکان (بەهرەکان) و شاراوەکان و کۆت و پێوەندەکان وای لێکردوون

 

کە ئیمان بێنن بەوەی مرۆڤ توانای هەیە لەسەر بەدەست هێنانی سەرکەوتن و چاکە و پیاوەتی و راستی... کەی بیەوێ و کۆششی بۆ بکات و بیری لێ بکاتەوە.

ئەوە بوو ئەوان بە دۆڕاویان دەگووت: ((بۆ هەر کارێك تێبکۆشیت وەدەستی دێنیت))، بە تاوانباریان دەگووت: "بگەڕێوە بۆ عەقڵی خۆت"، بەزاڵم و زۆرداریان دەگووت:"ئایا ویژدانت نیە؟". ئەوان لە هەموو ئەم ووتانەیاندا بەهەڵە دا چوو بوون هەتا ڕادەیەکی زۆر دوور.

بەراستی جێی داخە دەبینین قوتابخانەکان و زانکۆکانمان لە پەروەردەکردنی قوتابیەکانیاندا گرنگی دەدەن تەنها بە (هەست) و (نەست) فەرامۆش دەکەن یان بەدەربڕینێکیتر: عەقڵی دیار و لەبەرچاویان پێ گۆش دەکەن و عەقڵی شاراوە و نادیاریش واز لێدەهێنن بە ئارەزووی خۆی چۆن گەشە دەکات با بیکات، بەمەش داواکارییەکانی دووفاقیەکی چاولێپۆش لەو پێکهاتەی کەسایەتیاندا دروست دەکەن.

عەقڵی شاراوە (نادیار) وەك چەند جارێك باسمان کردووە ئەو عەقڵەیە وا مرۆڤی لەسەر دەڕوات لە زۆربەی نیش و کارەکانیدا و هەڵس و کەوتەکانی ئاڕاستەی دەکات. بەڵام عەقڵی دیار و دەرکەوتوو هیچیتر نیە جگە لە ڕووکەش و ڕیاکاری نەبێت. ئێمە هەر چەند چاودێری و گوێڕایەڵی عەقڵی ڕواڵەتیمان دەکەین و زاخاودانی مێشکمان بە بیر و باوەڕە ئەفلاتوونیەکان و زانیارییە ڕەهاکان بۆتە هۆی دروست کردنی کەلێنێك لە نێوان عەقڵی دیار و عەقڵی نادیار دا لە ئەنجامی ئەمەشدا کەسایەتی تاکمان کردووە بە دوو کەرتەوە.

بەم کارەش تاك بەرکەوتەی دووڕوویی دەبێت بەوەی شتێك دەڵێت و کەچی پێچەوانەکەی جێبەجێ دەکات، یان بانگەشەی سیفاتێك دەکات پاشان هەڵدەسێ بە وتنی یان کردنی شتێکیتر کە پێچەوانەی ئەوەیە. ئەو لە کاتێکدا دەنووسێت یان ووتاربێژی دەکات یان ئامۆژگاری کەسانیتر دەکات دەبینین دووبارەکردنەوەی هەمان ئەو وشە و زاراوە باق و بریقەدار و پەند و نموونە پڕ و پووچانەیە کە پێشتر چەند جارێك دراوە بە گوێماندا و بیستومانەتەوە. بەڵام لە کاتێکا هەوڵ و تێکۆشان ئەدا بەدوای بژێویدا یان مونافەسەی هاوتاکانی خۆی پێدەکات ئەو کاتە عەقڵی شاراوە (نادیار)ی تێدا دەردەکەوێت کە ئەویش وەکو هەر کەسێکیتر لەو خەڵکە کەسێکی بازاڕییە و ئارەزووی عەقڵی نادیار

بەسەریدا زاڵە لە چاوچنۆکی و بێئابڕوویيدا یان لە ئارەزووە سێکسییە خەسێنراوەکانیدا یان لە ڕوانگە و نەزەری بۆ ڕاست و هەڵە (حەق و ناهەق) دا بەوەی کە بەیەك چاو سەیریان دەکات.

ئێمە لە قوتابخانەکانماندا گرنگی دەدەین بە جوانکاری و ڕواڵەتی ڕووکەشی دەرەوە، بەڵام کرۆك و ناخی شتە شاراوەکان لە قوڵایی کەسایەتی تاکدا فەرامۆش و لەبیر دەکەین، بگرە چاومان لە ئاستی ئەو لایەنە دەنووقێنین بەشێوەیەك بوونی هەر نەبێت.

مامۆستاکانمان خوا یارمەتیان بدات، نایانەوێت کەمێك بێنە خوارەوە لەسەر بورجە عاجیەکانیان. ئەوان باش دەزانن چی ڕوو دەدات لە پشتی پەردەوە لە هەڵوەشاندن و داڕزین و گلەیی وگازندەکان، لە پیلانگێڕی و فرت و فێڵەکان، بەڵام هەموو ئەمانە فەرامۆش دەکەن و بایەخی پێنادەن، خۆیان خاڵی دەکەنەوە بەسەر قوتابیاندا و بەلێزمە دادەبارێنن بەسەریاندا ئامۆژگاری و مەوعیزە خاڵی و خەوالآکانیان کە ڕاستی و بنەمایەکی واقیعیان نیە لە سەر هیچ شتێك.

ئەو کاتەی ئیتر قوتابی گەشە دەکات و وا لە ژێردەستیاندا، ئەوا داوای بیر و باوەڕە ڕەهاکان دەکات لە لایەك و مراوەغە و کێبەرکێش دەکات لە شتە سەرکوت و خەفەکراوەکانی ناخیدا لە لایەکیترەوە.

دیاردەیەکی سەیر و نامۆیە لەم نەتەوەیەدا، تێیدا کەسایەتی تاك جووتەکیە (دوولایەنە) و کۆمەڵگاش ویژدانی دوولەتە...



پرۆفیسۆر (لندس) مامۆستای کۆمەڵایەتییە لە کۆلێژی واشنتۆن، لەبارەی ویژدانەوە دەڵێ: "مرۆڤ دەتوانێت جۆرێك لەویژدان دروست کات تەنانەت لەسەگیشدا، ئەگەر لە کاتێکدا ئەوسەگە فێر بکرێت بەو کارە هەڵسێت لەسەر ڕێگایەکی دیاری کراو، چونکە لە کاتی فێرکردنیدا بێتوو گەر بە هەڵە کارەکان ئەنجام بدات ئەوا تووشی سەرکۆنە و سزادان دەبێت، لەو کاتەشدا کارە پێسپێرراوەکەی کۆتایی دێت ئەوا خۆی دەدات بە سەر هەر دوو دەستی دا و کلکی دەخاتە نێوان هەر دوو قاچیەوە، یان ڕادەکشێ لەسەر زەوی و ملی درێژ دەکات و بەزمانی حاڵ داوای لێبوردن دەکات ئەمەیان لە کاتێکدا ئەگەر خۆی وا بێتە

پێش چاو کە پێچەوانەی فێرکردنەکانی ڕاهێنەرەکەی جوڵاوەتەوە. ئەم جۆرە لە ویژدان جیاوازی نیە لە گەڵ ویژدانی مرۆڤ، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ دەتوانێت لەوەی کەهەیەتی بەشێوەیەکی فراوانتر هێز و بیرکردنەوەکانی لەسەر وەڵامدانەوەی هەست و سۆزە کۆمەڵایەتییەکان و توانای بۆ ئیلهام و بیرکردنەوەکان، لە دەروونی خۆیدا ویژدانێکی بەهێزتر گەشەی پێبدات لە ویژدانی سەگ..."

"ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی پێی دەووترێت دەرزی ئاژنی ویژدان ئەو کاتە ویژدان هیچیتر نیە تەنها هەست کردن بە پەشیمان بوونەوە نەبێت کە خاوەنەکەی پێ ڕادەچڵەکێت لەو کاتەیدا دەرك بەو خیانەتە دەکات وا ئەنجامی دا وە بەرامبەر بەکەسێك یان بەکۆمەڵێك، ئەویش لەوەدا کە ئەو کەسەیان ئەو کۆمەڵە سەرزەنشت و لۆمەی دەکەن. بەم مانایە ویژدان دەبێتە هۆیەکی چالاك لە هۆیەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی: کە ئەوەش لە بنەما کۆمەڵایەتیەکەیدا ئەو پەیوەست بوونەی کارەکەیەتی بەدەستە و ئاکارە کۆمەڵایەتیەکانەوە. لە واقیعدا ماوەی چالاکیەکەی لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە سنورداراوە بە سنوردارکردنی ئەو ئاکار و هەڵس و کەوتەی لەتاکدا گەشە دەکات"[5]

لەم ووتەیەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئاستی ئەو ویژدانی گەشە دەکات لە کەسێکدا هەموار ناکرێت بەسەر خەڵکیدا. کارا و چالاکە لای ئەو کۆمەڵەی کەتاکی تێدا گەشە دەکات، ناتوانرێت بێتە ئەژمار بەکارلێکردنی سنوورەکەی تەنها بەدەگمەن نەبێت.

بۆ نموونە ڕێگرێك (چەتەیەك) ویژدانێکی زۆر بەهێزی هەیە بەرامبەر کەسانی شەقاوەی وەك خۆی. لەبەرامبەریاندا سەر نەوی دەکات و لە پێناویاندا خۆیی و هەموو شتە بەنرخەکانی دەکاتە قوربانی بۆیان، هەروەها غەمبار دەبێت بەهەموو شێوەیەك لە کاتێکدا دەست درێژی بکرێتە سەر ئەو ئاکارەیان کەلەسەری پێگەیشتوون.

بەڵام لەکاتێکدا ڕووبەڕووی کاروانێك دەبێتەوە لە ڕێگا دا هەست ناکات بەهیچ سۆز و بەزەییەك یان سەری بۆ دانەوێنێت، لەو کاتەدا دەبینێت خوێنرێژێکی زۆر دڵڕەقە، کوشت و بڕ و تاڵانی و دەست درێژی و پێشێل کاری دەکات لەسەر کەمترین هۆکارێك بەبێ هیچ پاساوێك.

ئەو ڕێگرە (جەردە)یە پاش گەڕانەوەی خۆی و شەقاوەکانی بۆ حەشارگەیان دەبینێت پێدەکەنێت و دڵخۆش و موژدەبەخشە بەوەی گوایە خزمەتی نیشتمان دەکات و سوودبەخشە بۆ نەتەوەکەی.

گومانی تیا نیە ئەو نەهامەتی وماڵوێرانیەی دێت بەسەر هەر نەتەوەیەك لەنەتەوەکاندا دوو جۆر ویژدانی هەیە: ویژدانێکیان هی فەرمانڕەواکەیە و ویژدانێکیتریشیان هی رۆڵەکانی گەلە. ئەم کەرتبوونە لە ویژدانی کۆمەڵایەتیدا، وایکردووە لە فەرمانڕەواکان زوڵم و زۆر بخەنە سەر گەل لە کاتێکدا کە گومانیان وا بێت دادپەروەرن، وادەکات لەگەلیش کە هەڵگەڕێتەوە گەر هاتوو گومانیان هەبوو ئەو فەرمانڕەوایە گوێڕایەڵیانە.

عێراق لەم لایەنەوە گیرۆدە بووە بە بەڵایەکی کۆمەڵایەتی وا کەسنووری نیە زۆر بەداخەوە. دەڵێن حکومەت لە بەریتانیا سندوقێکی داناوە بە ناوی (سندوقی ویژدان) هەتا تاکەکانی گەلەکەی پاشماوەی باجەکانیانی تێکەن لەو باجانەی کە لە بیر کراون لەکاتی کۆکردنەوە دا. چونکە "سندوقی ویژدان" بانگهێشتێکە بۆ تاکەکانی گەل لەکاتێکدا کەهەست بە دەرزی ئاژنی ویژدانیان دەکەن لەو باجانەی وا دەیدەنە حکوومەت بێت و گەر کەمتر بێت لەوەی یاسا لە سەری داناوون.

ئێمەش ئەگەر سندوقێکی لەو چەشنەمان دابنایە لە بەغدا ئەو کاتە سندوقەکە خۆشی تاڵان دەکرا... ئەمەش بەو مانایە نیە قوڕی ئەو خەڵکەی ئێرەی لێ دروست کراوە جیاوازە لەو قوڕەی گەلی بەریتانی لێ دروست کراوە. هەموو خەڵکی لە بنەڕەتی پێکهاتەی سروشتیاندا وەك یەکن لە گشت وڵاتاندا. هیچ جیاوازیەك لەمەدا نیە لە نێوان عێراقیەك و بەریتانیەکدا، یان لە نێوان عەرەبێك و عەجەمیەکدا.

لەڕاستیدا جیاوازیەکە لە شۆکی (صدمە)ی ئاکارە کۆمەڵایەتیەکان و کەرت بوونی ویژدانەوە سەری هەڵداوە. ئەو گەلەی ئەو جۆرە فەرمانڕەوایانەی تێدا بێت وا قێز لە میللەت بکەنەوە و دژایەتی ئاکاری هەمان میللەت بکەن، ئەو گەلە ئارەزووی ئەوە بکات هەڵبێت لە دەست هەموو ئەو بڕیار و فەرمانانەی ئەو جۆرە فەرمانڕەوایانە دەیکەن،کە لەمەشدا چاکەخوازی و پاڵەوانبازی بەدی دەکرێت...

لەماوەی شەڕەکانی ئەم دواییەدا هەندێ لە فەرمانبەرە بەریتانیەکان هاتبوون بۆ عێراق و هەوڵی ڕێکخستنی کاروبارەکانی خۆراکیان دەدا تیایدا، یەکێکیان پاش شارەزاییەکی دوور و درێژی لەسەر عێراق ووتبووی: "عێراقیەکان هەموویان دزن!". ئەم فەرمانبەرە بەریتانیە هەڵە بووە لەو بڕیارەیدا کە داویەتی بەسەر گەلی عێراقدا هەڵەیەکی گەورەش - چونکە ئەو لە کۆمەڵگایەکەوە هاتووە خاوەنی یەك ویژدانە، کە هەموو فەرمانڕەوا و گەل دەگرێتەوە، ئەوەی لە بیر چووە کۆمەڵگای عێراقی دوو ویژدانی هەیە...

بازرگانەکانی بازاڕی بەغدا وەك بازرگانەکانی لەندەن نین لە ڕووی گوێڕایەڵیان بۆ بڕیارەکانی حکومەت و ڕێزگرتنیان لە زانیاریەکانی. بازرگانەکانی بەغدا دژایەتی هەر کەسێك دەکەن خەبەر لە حکومەت بدات لەبارەی سەرپێچەکانیانەوە و بەوەی دادەنێن ئەو کەسە سەرشۆڕ و ڕسوا و بۆگەنە. بەڵام لە لەندەن بازرگان لەو بڕوایە دایە ئەوەی خەبەر لەحکومەت دەدات لەبارەی هەستانی بەهەندێ سەرپێچی و تاوان کاری، ئەوا ئەو کەسە خاوەنی چاکە و پیاوەتی و ڕێز و شەرەفە.

دامەزراوە حکومیەکان لە بەریتانیا گەل وا حسابیان بۆ دەکات دامەزراوەی گەلن و لە بەرژەوەندی ئەو دامەزراوەن، بۆیە چاودێریان دەکات وەك چۆن چاودێری بەرژەوەندی خۆی و خێزانەکەی دەکات.

بەڵام لە عێراق پیاوکوژ دەشاردرێتەوە لە نێوان خەڵکدا و دەبینی شانازی پێوە دەکەن لەوەی دڵدەیان داوە و شاردوویانەتەوە. دز هەڵدێت و کەس خەبەری لێ نادات تەنها سیخوڕ و نەفەس نزمەکان نەبێت. خەڵکی بەئاشکرا هەڵدەسن بە سەرپێچیەکان. ئەگەر هاتوو حکومەت بیستیەوە لە خەڵك دەپرسێت: کێیە ئەو تاوانبارەی وا خەبەری ئەمەی داوە بەحکومەت؟

ئەمە ئەو جیاوازیە بوو کە وای کردووە لە حکومەتی عێراقی سەرکەوتوو نەبێت لە زۆربەی کارەکانیدا. وەك نمونەی ئەو ماڵەی لێهاتووە کە دووبەرە باب لە خۆ دەگرێت و بۆ هەر بەرەبابێکیش ئەوەی خۆی و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەیە و ویژدانی ئەم لە مەدای ویژدانی بەرەبابەکەی تر ناچێت.

بەهەر حاڵ ئەمە بڕیارێکە و هۆکاری مێژوویی کۆنی هەیە. ئەوە دیاردەیەکی تازە نیە سەری هەڵدابێت لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا. بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەومیە چڵکاوخۆرەکانمان هەڵنەساوون بە سووککردن و ئاسانکاری لە پێشێل کاریەکانیاندا. لەوانەیە ئەو قسەیە ڕاست بێت: (لۆنغریغ) ئاماژە بەسەربازکردنی زۆرەملێ (التجنيد الأجباری) دەدات لە سەردەمی عوسمانیدا کە گرنگترین هۆکارەکانی دوورکەوتنەوەی نێوان گەل و حکومەت بوو...[٦]

ئەمە بیر و بۆچوونی منە کە تا ئێستا پەیڕەو دەکرێت لە ڕووداوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ناوعێراقدا. تەنانەت ئێستاش گوند و ئاواییەکانی خەڵکی عێراق لە هەموو سەرژمێریەك دەترسن یان لە هەموو ناونووس کردن و بەدوا داچوونێکی فەرمانبەرەکان هەڵدێن، بەجۆرێك وا گومان دەکەن ئەو فەرمانبەرە هاتووە بۆ ناونووس کردنیان بۆ سەربازی پێکردنی زۆرەملێ.

تا ئەمڕۆش بەسەرباز گرتنی ئیجباری و زۆرەملێ هەر بەردەوامە، هەر وەك چۆن لەسەردەمی ڕابردووی عوسمانیەکاندا هەبوو، کە ئەوەش هۆکارێك بوو لە هۆکارەکانی دوو لەت کردنی ویژدان لە کۆمەڵگای عێراقیدا، وا پێویست دەکات پاش دروست کردنی دەوڵەتی عێراقی، حکومەت مەسەلەی بەزۆرگرتنی سەرباز بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە بیر بباتەوە بۆ ئەوەی بەو کارەی بتوانێت نەهامەتی و ئێش و ئازارەکانی تەجنیدی زۆرەملێ لەبیر خەڵکی بەرێتەوە کە لەسەر دەستی چڵکاوخۆرەکانی عوسمانیدا ئەو خەڵکە چەشتیان.

بەڵام بەداخەوە هێشتا هەر وازیان نەهێناوە (چ جای ئەوەی) تا بگەڕێنەوە بۆ تەجنیدی ئیجباری بەهەموو جۆش و خرۆشێکەوە! ئەوان یاسای تەجنیدی ئیجباریان کردووە بە ساڵانە لە کاتێکدا یاسای خوێندنی ئیجباریان فەرامۆش و پشت گوێ خستووە، وایان کردووە لە میللەت لە یادەوەریەکانی خۆیدا جارێکیتر بگەڕێتەوە بۆ هەڵدانەوەی قەتماغەی برینەکانی فەرمانڕەوایی عوسمانی قێزەوون.

لەو جیاوازیانەی کە لەم وڵاتە مسکێنەدا (هەژارە دا) ڕوو دەدات ئەومیە: حکومەت تەجنیدی زۆرەملێ دەسەپێنێت بەسەر دەست و پێوەندەکانیدا بەڵام پاشان ماوەیان نادات بەهەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ. ئەو دەیەوێت تاکی عێراقی ڕابێنێت لەسەر ئەوەی سەربازێکی

جێبەجێکەری داخوازیەکانی بەر لووتی خۆی بێت، نایەوێت لەسەر ئەوە ڕای بهێنێت هەتا ببێتە هاولاتیەکی باش و ئەندامێکی چالاك لە پێکهێنانی دام و دەزگاکانی دەولەتدا.

گومان لەوە دا نیە کە هەلبژاردنی ڕاستەوخۆ لە گرنگترین ئەو هۆکارانەیە کە دەبێتە پارمەتیدەرێك بۆ پرکردنەوەی ئەو کەلێنەی وا لە نێوان گەل و حکومەتدا هەیە.

لە واقیعدا ویژدانی هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی ئەم سەردەمە یەکناگرێتەوە. تەنها پاش ئەوە نەبێت گەل تیایدا هەست بکات بەهەستکردنێکی دوور لە ڕوالەتی و پەردەپۆش کراو کە پیاوانی حکومەتەکەی هەلدەبژێرێت بە ئارەزووی خۆی بە هەلبژاردنێکی ڕاستەوخۆ و دوور لە دەست تێوەردان.

گەل ئەو کاتەی پشت دەبەستێت بە ڕوانگەی نوێنەرەکانی کە بەناوی ئەوەوە قسە دەکەن و ڕەزامەندی ئەو دەردەبڕن و پارێزگاری لێ دەکەن، ئەوسا هەست بەوە دەکات ئەندامێکی چالاکە لە دەزگاکانی دەولەتدا، بە شێوەیەك لە گەڵ حکومەتدا یەکی گرتووە یەکگرتنێکی یەك ڕیز کە هیچ کون و کەلەبەرێکی تیا بەدی ناکرێت.

یەکێ لەوانەی کە متمانەم پێیەتی بەسەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە لەوانەیە کەس باوەڕی پێ نەکردایە ئەگەر لەم ولاتە دا نەبوایە و لە هەر ولاتێکیتر دا بوایە.

بۆی گێڕامەوە و وتی: ڕۆژێك لە ڕۆژان گوێم لێ بوو، لە وادەی یەکێك لە وادەکانی هەلبژاردنەکانی ڕابردوودا، بەوەی کە بروسکەیەك دابەزیوە بۆ سەر موتەصەریفی لیوای بەغدا و ئەمری پێکردووە بە هەلبژاردنی کەسێکی دیاریکراو. بۆیە پاشان ئەو و دەستە و دائیرەکەی لە هاوەلانی خۆی ڕۆشتوون بۆ پیرۆزبایی لێکردنی ئەو کەسە کە بەخت یاوەری بووە و ئەویش پێشوازی لە پیرۆزبایی‌یەکانیان دەکات. ئەمە و بۆ زانین ڕۆژی هەلبژاردنی ڕەسمی هێشتا وادەی خۆی نەهاتبوو کە هەلبژاردنەکەی تیا ئەنجام بدرێت، بەلام ئامادەباشی بۆ هەلبژاردن لەسەر قاچی خۆی دەوەستێت هەر وەك دەلێن، جێگرێك دیاری دەکرێت لە ئەنجومەنی نواب لەسەر ئەم شێوەیە، ئاساییە ئەو (جێگرە) ئەو کەسە هەست بەوە ناکات نوێنەری گەلە، هەروەها گەلیش هەست بەوە ناکات کە لە حکومەتدایە و کەسێك بە ناویەوە قسە دەکات و پارێزگاری لە مافەکانی دەکات بە ڕاستی.

لەسەر ئەم ڕێچکەیە کەلێنی نێوان گەل و حکومەت فراوانتر و بەربلاوتر دەبێت و ئەوسا ویژدانیش دوو کەرت دەبێت، پاشان بڕیاریش تەنها بە دەستی خوای تاك و تەنهایە.

★ ★ ★

وا دەردەکەوێت دوڕوویی کەسایەتی و کەرت بوونی ویژدان یەکێکیان ئەوی تریان تەواو دەکات لە بەرهەم هێنانی عەقڵیەتی چڵکاوخۆری لە عێراقدا.

توێژەرەوە سەری سوڕ دەمێنێت لە کاتێکدا دەبینێت نەوەی نوێ لە گەنج و لاوی خوێندەواری عێراق ناتوانێت خۆی بخزێنێتە نێو ئیش و کاری ئیداری و فەرمانگەکان هەتا بەرکەوتە نەبێت بە کاسە لێسیەوە لە ئارەزوو و ئاڕاستەی ویژدان و ئاستی بیرکردنەوەیدا.

ئاشکرایە ئەو ڕێڕەوی خوێندن و پەروەردە کردنە جیاوازە لە قوتابخانە و زانکۆکانماندا یارمەتیدەرە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەسەر بەرهەم هێنانی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتیە بۆگەنە لە عێراقدا.

ئێمە مێشکی قوتابیەکانمان دەئاخنین بە زانیارییە "عاجیبیەکان" و هیچ پەیوەندیەکی نیە بەڕاستیەکانی ژیان و کێشەکانیەوە. هەروەها ئێمە قوتابیاکانمان فێر دەکەین لەسەرخوێن گەرمی (حەماسە) لەپێناوی ڕاستی و دادپەروەری و چاکەخوازی بەڵام ڕێرەوی ئەم بیر و بۆچوونە ڕەهایە لە ژیانی کردەییدا نابینینەوە بۆیان. قوتابی خوێندن تەواو دەکات و دەردەچێت بەڵام دووبارە خوێن گەرمی و حەماسێکی ئاڵۆزی هەیە و خوازیارە لەسەر هەرشێوازێك بێت بیچەسپێنێت بەسەر هەر فیکرێکدا و دژایەتی بکات.

ئەگەر جڵەوی هێز بگرێت بەدەستیەوە ئەو کاتە دەبینیت سەرهەڵدانی حەماسەتی تێدا دردەکەوێت لە بواری خزمەتکردنی کەس و کاری خۆی و لایەنگران و شوێنکەوتووەکانی... لە ئەهلی ماستاوچی و پیاهەڵدانی زرینگەداری باق و بریق.

بەشێوەیەك دەیبینیت خەریکە گڕ دەگرێت لەو کاتەدا کە خوازیارە خزمەتی نەتەوەکەی بکات، بەڵام مەبەستی لەم خزمەتە خزمەتکردنی ئەوانەیە وا خۆی گەرەکیەتی و لەسەری بوونەتەماڵ لە قەوم و قیلە و هەوادارانی خۆی.. تەنها و و هیچیتر.

گەنجێکی نیشتمان پەروەرم دەناسی کە هەمیشە لە سەرووی هاوکارەکانی خۆیەوە بوو بەهۆی حەماسەتەکەی و خۆنەویستی و دڵسۆزیەکەیەوە، ڕێکەوت وای هێنا بوو بەیەکێك لە خاوەن پلە وپایەدارە گەورەکانی دەوڵەت لەشەو و ڕۆژێکدا ـ لەو کاتەدا بینیمانەوە بوو بە زاڵمێك کەبە زوڵمەکەی جیا دەکرایەوە لە فەرمانڕەواییەکەیدا و ستەمکاریەکەی لەسەر هەر کەسێك کە چارەیی نەویستایە...

ئەوە بەو مانایە نایەت کە ئەو کەسە ویژدانی ون کردووە، ئەو ویژدانەی وا لە ڕۆژانی لەمەوپێش خاوەنی بوو، تەنانەت ئێستاش ویژدانی هەر لێ دەدات لە قوڵایی دەروونیدا ئاڕاستەی دەکات بەرەو خێر و چاکە ـ بەڵام خێر و چاکە بۆ شوێنکەوتوانی و هاوڕێکانی و ماستاوچیەکانی دەور وپشتی.

لە ناو مرۆڤەکاندا کەسێك نیە ویژدانی نەبێت، ویژدانیش وەك کەسایەتی لە هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیە، بەڵام لەو ئاڕاستەیە دا جیاوازە کە ئاڕاستەی دەکات. ئەوەی کە لەبارەیەوە پێی دەڵێین "ویژدانی نیە" لەڕاستیدا ئەو کەسە خاوەن ویژدانە... ویژدانێکی بەهێزیش لە هەندێ جار دا، بەڵام ویژدانێکی بێلایەنە و لە تواناییدا نیە لەو مەدایەی تێپەڕ بێت لە سنووری ئەو کۆمەڵەی وا لەگەڵیان دەژی و گۆرانی دەڵێ بەسەر ئاکار و پێوانەکاریەکانیاندا.

ئەمەیە حەقیقەتی ویژدانی کەرت بوو کە دووچاری چڵکاوخۆرەکانمان بووە لەم سەردەمە فێزەوەنەدا. یەکێکیان زۆر بە ئاگا و نیەت پاك و دڵسۆزە بۆ ئەو کەس و کار و هەڤاڵان و قەوم و قیلەیەی وا لەسەری حسێب کراون، بەڵام ناتوانێت چاوێ هەڵبێنێ بەو موراجیعە دا کە نایناسێت و نامۆیە پێی، یان واسیتە و ناسیاویی نیە، تەنانەت بە شێوەیەك دەبینێت کە دەم و چاوی لە ئاستیا دەدا بەیەکدا و هەموو دونیای لێ دەبێتە شەوەزەنگ و دەبینێت شپرزە و تووڕە دەبێت و دەنەڕەنێت ... چەنەبازی و قسەی هەلەق و مەلەق دەکات و دەمی کەف دەچەرێنێت.

هەندێ لە مامۆستاکانمان، خوا لێیان ببورێت، چڵکاوخۆری دەستی مامۆستایان بوون. یارمەتیان پێشکەش دەکرد بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، لەسەر دوو لەت کردنی ویژدان لە ناو قوتابیەکانیاندا. دەتبینین لە هەموو کاتێکدا گۆرانیان دەگوت بە باڵای حەق و حەقیقەت دا، ئەگەر لێشت بپرسینایە حەق چیە و کامەیە حەقیقەت ئەوا ملیان

بادەدایـت و بـەكافر و بێدینیـان لـە قەڵـەم دەدایـت یـان... بـە لاوازی نیـشتمانپەروەریان دادەنا.

ئێمە دەمانەوێت قوتابیان لەوە تێبگەیەنین كـە حـەق ئـەو حەقەیـە زۆرینـەی خـەڵكی ڕەش و ڕووت لێی زەوت كراوە، حەقیقەتیش ئەوەیە كە ببێتە هۆیەك بۆ خۆشگوزەرانی و بەرزكردنەوەی ئاستی ئـەو خـۆش گوزەرانیـە لـە نـاو خـەڵكانی ڕەش و ڕووتـا (ڕەشـۆكیدا) دەمانەوێت تێیان بگەیەنین كە حەق تایبەتمەند نیە بە گروپێكی كەم لە شارەزایان و خوا پـێداو و خـۆش گوزەرانـەكان و ئـارام گرەكـان، هـەروەها حەقیقـەتیش لـە بۆشاییدا نـاژی بەڵكوو دەستكردی كۆمەڵگایە و دەنگدانەوەی ئامانج و هیواكانیەتی.

بەڵام مامۆستاكانمان ئەمە دادەنێن بە "شتێكی خنكاو و مردارەوە بوو" ... بەداخـەوە. خاوەن شكۆ ووتەیـەكی ناسـراوی هەیـە دووبـارەی دەكاتـەوە: "ئەگـەر بـەڕێز و گەورەیـەك مرد لە ناوماندا ئەوا یەكێكیتر لە هاوتای ئەو جێگەی دەگرێتەوە".

بۆیە هەقیانە چڵكاوخۆرە پێشینەكان ئەمڕۆ نموونەی ئـەم ووتەیـە بڵێنـەوە، بیكـەن بـە هات و هاوار و خۆهەڵكێشان: "ئەگەر چڵكاوخۆرێكمان لێ مرد ئەوا چڵكاوخۆرێكیتر دێتـە جێگای" وە ژمارەیان زیادی كردبوو لەم چڵكاوخۆرانە لە قوتابخانەكان و زانكۆكـانی وڵاتـدا و خزابوونە نێو ڕیزەكانی قوتابیـان و مامۆستایانیشەوە، بەچەشنێك متمانەیان بە خۆیـان پەیـدا كردبـوو هـەر كەسێك سەرپێچیان لـێ بكات ئـەوا بێگومـان دەگاتـە بـەر رەحمـەتی یـەزدان جـا زوو بێـت یـان درەنـگ. ئەوانـە نایانـەوێت نەمامۆسـتایان و نەشـارەزا و پرۆفیسۆرەكانی زانكۆكان گوێی قوتابیـان نـاو بـدەن بەوحەقیقەتـەی وا ئـەوان پـەیڕەوی دەكـەن لـە ئـیش و كارەكانیانـدا، چـونكە گـەر هەسـتیان كـرد ئەمـە ڕوو دەدات ئـەوا مستەكۆڵەی جەرگ بڕ دەسرەوێنە دەم و فڵقی ئەو مامۆستا و پرۆفیـسۆرانە و دەسـتبەجێ دەمكوتیان دەكەن.

ئێمە نەوەیەكی لێبوردە و لەسەرخۆمان دەوێت كە سەر نەوی نەكات لەئاستی هـەژاران و ڕەش و ڕووت و خەڵكی سادە دا و قێزیان لێ نەكاتەوە وخۆی بە گەورەتر نەیەتـە پـێش چاو بەسەریاندا. بەڵام لـە واقیعدا ئـەو چڵكاوخۆرانە باكیـان نیـە و نایانـەوێت بـە تـەنگ ئـێش و ئـازار و مەینەتیـەكانی هـەژاران و ڕووت و ڕەجـاڵ و برسـیەكانەوە بـن جـا ئایـا ڕاستەوخۆ ئەمە بكەن یان بەدەستی ئەنقەست وا بكەن ئەوەیان گرنگ نیە.

ئێمە پێویستمان بە چەشنێك لە شارەزایان هەیە کە دەرك بەو ڕاستییە بکەن هیچ چاکە و پیاوەتییەکی زیادە ڕەویان نیە بەسەر کەسدا بە هۆی ئەو سەرکەوتن و زانیاری و ئەدەبەی کە بۆ خۆیان بەدەستیان هێناوە، چونکە ئەوان فراژووی ئەو دەرهاوێشتە و دروستکراوانەن کە بەرهەم هاتووی هۆکارە کۆمەڵایەتی و دەروونیەکانن لەوانەی وا پێی دەورە دراون بەبێ ئەوەی خۆیان هیچ دەستێکیان تیایدا هەبێت.

ئێمە ئەو فەرمانڕەوا و دادوەر و ڕووناکبیر و شارەزا و دەوڵەمەندانەمان دەوێت کە سوپاسگوزاری بۆ یەزدان بکەن و خۆیان بەگەورە و سەردار نەزانن، واش تێنەگەن ئەو توانا و دەسەڵات و هێزەیان هەر وا بە ئاسانی بۆ دەمێنێتەوە.

پێغەمبەری ئیسلام لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێت: "ئەگەر خەڵکی ڕقیان لە هەژاران بێت و بەچاوی سوکەوە سەیریان کەن، ئەوا هەر چی هەیانە لە کۆشك و تەلاری دنیا و هەڵپە و پەلاماریان لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و سەروەت، خوا تەفر و توونای دەکات بەهۆی چوار خەسڵەتەوە: یەکەمیان بەهۆی وشکە ساڵی و بێبارانی ڕۆژگارەوە، دووەمیان بەهۆی زوڵم و ستەمی سوڵتانەوە، سێیەمیان بەهۆی تاوانباری و چەوسانەوە لە ولایەتی فەرمانڕەواکاندا، چوارەمیان بەهۆی دڕکی دوژمنانەوە". (٧)

زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت کە ئەم فەرمودەیە ڕێك دەچەسپێت بە سەرمانا چەسپاندنێکی گەورە و ئاشکرا. چونکە زۆربەمان خۆمان بە گەورە دەزانین بەسەر ئەوانەی لە خوار خۆمانەوەن بەڕێژەی ئەو سەرشۆڕیەی کە هەمانە لە ئاست ئەوانەی سەروومانەوە.

یان دەبینین خەڵکانێك هەن کورتانەکانیان هەڵئەکرێنن لە بەر دەستی زاڵم و زۆردارانەدا و پاشان دەنگی خۆیان بەرز دەکەنەوە بەسەر چەوساوە و زوڵملێکراواندا. ئەوانە کەسایەتیەکی دوو ڕوویان هەیە بە قەدەر ڕێژەی کەرت بوونی ویژدانیان. تێکشکان و سەرشۆڕیش بەشیانە لە هەموو گۆڕەپانێکدا...

عەلی کوڕی حسێن دەڵێ: "تۆ و چەوساندنەوە سەرکەوتنتان مەحاڵە مەگەر خوا ڕازی لەسەر بێت"(٨) مێژوو سەلماندوویەتی کە ئەوانەی گومڕا و زاڵم و زۆردارن و هەژاران دەچەوسێننەوە بڕوایان هەیە بەوەی تۆڵەیان لێ دەکرێتەوە، هەر دەبێ گیرۆدەی تۆڵەسەندنەوەی تاوانەکانی خۆیان بن هەر چەندە ماوەیەکی زۆریشی بەسەر دا تێپەڕێت.

 

ئەو زوڵم لێكراوەی كە چەكی ماددی نیە تۆڵەی زوڵمەكەی خۆی پێ بكاتەوە ئەوا چەكێكیتر شك دەبات كە لە چەكی ماددی تێپەڕاندووە و كاریگەرترە ــ ئەویش چەكی دەروونە كە پێك هاتووە لە نزا و پاڕانەوەی بڵێسەدار و هاواری پڕ بەدەمی ئاهو نزولە كە "بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان وەك پریشكی ئاگر".[٩]

ئەو كاتەی شارەزا و خوێندەوارەكان بەسووك سەیری نەزان و نەخوێندەوارەكان دەكەن و ئەو كاتەی دەوڵەمەند و زەنگینەكان بەسووك سەیری هەژاران و نەدارەكان دەكەن و ئەو كاتەی چڵكاوخۆر و كاسەلێسەكان بەسووك سەیری بێنەوایانی ڕۆڵەكانی گەل دەكەن، ئەوا لەو كاتانەدا بەو كارەیان پەردە لەسەر سووك و ڕسوایی دەروونی خۆیان هەڵدەماڵن و هەست بە كەم و كورپەكی شاراوە دەكەن لە خۆیاندا كە بەهۆی نقووم بوونی عەقڵی نادیاریانەوە بەو شتە شاراوانە دێتە ئەنجام. وە هەر ئەو كەم و كورپانەشە زاڵ دەبێ بەسەریاندا چ زوو بێت یان درەنگ.

گومانی تیا نیە هێزە دەروونیەكان یان هاوار و ناڵەی زوڵم لێكراوەكان ئەگەر ڕوو بكاتە مل هوڕ و زاڵمەكان ئەوا دەیانسووتێنێ بەسووتاندن.

چینە باڵادەستەكان كاتێك بە سووك و ڕسوایی دەڕواننە ڕۆڵەكانی چینەنزم و ژێردەستەكان، پاساوی ئەو بەسووك سەیركردن و خەشم و ڕقەیان بەوە ئەدەنەوە كە گوایە چینە ژێردەسە و نزمەكان خاوەنی داب و نەریتی چەوت و چەوێڵن و خوو و ڕەوشتیان خراپە یان ئاژاوەچی و بێسەروبەرەن و دەست نادەن بۆ دانیشتن لەسەر كورسی و تەختی فەرمانڕەوایی كردن.

ڕۆژێ لە ڕۆژان گوێم لێ بوو یەكێ لەوانەی چینە باڵاكان ئاماژەی دەكرد بۆ كۆمەڵێك لە جەماوەری خەڵك كە كۆبووبوونەوە لە ئاهەنگێكی میللی خۆیاندا و پێی دەگوتن: "بڕوانە بۆ ئەوانە... خوا بت پارێزێت لە بەڵا و نەهامەتیان... ئەوانە خوێن ڕێژ و ناڵەبارن و بەزەییان بەكەسدا نایەت گەر هات و ئاڵان بە كەسێكەوە".

لە واقیعدا ڕۆڵەكانی چینە نزم و ژێردەستەكان بەهۆی ناڵەباری بارودۆخیانەوە ناتوانن وەك ڕۆڵەكانی چینە بەرز و باڵادەستەكان بن لە ڕواڵەتەكانی ئەدەب و هونەرەكانی ڕەوشت چاكی و خاوەندارێتی پێكهاتەی نەرم و نیانی و سەلاریی. بەڵام ئەمە بە شوورەیی و نەنگیان دانانرێت.. بەڵكو ئەوە بە عەیب و نەنگ دەژمێردرێت كە چینە

بالادەستەکان لە فەرمانڕەوایەتیاندا بەسەر ئەماندا هەموو خێر و بێر و واریداتی ئەمان بۆ خۆیان لووش دەدەن و دەیدزن و ئەمانیش دەخەنە سەر ساجی عەلی و لە حاڵەتێکی ژێردەستی و زەلیلی دا دەمێننەوە و ناچار خوو و ڕەوشتیان خراپ دەبێت و هەڵس و کەوتی نالەبار دەگرنە بەر.

پەندێکی باو هەیە دەڵێت: "گەر کەسێك ڕۆژانی ژیانی نالەبار و خراپ بوو ئەوا خوو ڕەوشتیشی خراپ و نالەبار دەبێت" ئەم ووتەیەش تا ڕادەیەکی زۆر دوور زانایانی کۆمەڵناسی پشتگیری لێدەکەن. چونکە زۆربەیان وا دەبینن کە کەسێکی زۆر توونت و خاوەن هەڵسوکەوتێکی ئاژاوەگێڕی و نالەبار مل کەچ دەبێت و حەز دەکات لە گوێڕایەڵیکردن ... هەتا وای لێدێت حاڵی باش دەبێت و دەبێتە کەسێکی ڕووخۆش و خەندان و حەز بە هاریکاری و یارمەتیدان دەکات و ئارەزووی زیاد دەکات بۆ گفت و گۆ و زمان شیرینی و نەجابەت لە نێو کۆڕ و کۆمەڵ و هەڵس و کەوتی لەنێو خەڵکیدا.

پێشینیان لەو بڕوایە دان کە نالەباری و خراپی خوو و ڕەوشت و هەڵس و کەوتی مرۆڤ لەئەنجامی نەزانین و نەخوێندەواری و کەمی عەقڵ و ئاوەزی خۆیەوەیەتی، بۆیە هەمیشە ئەو قسە بەناوبانگ و بەنرخەی (سوقرات)ی فەیلەسووف دەڵێنەوە کە دەڵێت: "زانین و زانیاری چاکە و بەخشندەییە و نەزانین و جەهلیش خراپی و نەهامەتیە". بۆیە لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا هەندێ لە ڕووناکبیران و بیرمەندان لەسەر ئەو تان و پۆیە ووتەیەکی جوان و بەنرخ دەچنن و دەڵێن: "هەر کەسێك قوتابخانەیەك بکاتەوە ئەوە بەندیخانەیەکی داخستووە".

بۆیە زیادەڕەوی نیە ئەگەر بڵێین: قوتابخانە هیچ هۆیەکی پێشکەوتن نیە تەنها زاخاودانێکی مرۆڤ نەبێت و هیچ خۆشی و چێژێکی تیا بەدی ناکرێت تەنها وەك شتێکی ڕووالەتی نەبێت کە بە ڕووی مرۆڤەوە دیارە، بەلام ناوەڕۆکی خودی مرۆڤ خۆی و قووڵبوونەوەی لە ژیری و ئاوەزی نادیاری شاراوەی خوێدا ئەو قوتابخانە گرنگەیە کە ناچێ بە لایدا و خۆی نادات لە قەرەی تەنها کەمێك نەبێت.

هەڵس وکەوتی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتی بنیات نراوە لەسەر بنەمایەکی ناهەستی (نەستی) لە ئاکارە کۆمەلایەتیەکان و گرێ دەروونیەکان. لە چاککردنی مرۆڤدا تەنها ئەوە بەس نیە کە دووبارە بە ئامۆژگاری و فێرکاریەکانی ڕێگای "ببە و ... مەبە ... بکە و ...

مەكە" دا ببارێین بەسەریا، بۆیە دەبینین هەندێ خەڵك رۆچوونەتە ناو داب و نەریتە زیان بەخشەكان و بیر و باوەڕە چەوت و چەوێڵەكانەوە كە بۆتە هۆی ئەوەی خەڵكانی تر سەرزەنشتیان بكەن و بەسووك و ڕسوایی یەوە سەیریان بكەن هەر لەو پێناوە دا ـ بەڵام ئەو كەسانە بیئاگان لەوەی كە هەر كەسێك لە ئێمە بە دوور نیە لەوەی وەك ئەوانی لێ بێت گەر بێتوو لەو بارودۆخەی وەك ئەواندا بژی، هەر بۆیەشە بەبێ‌ئەوەی بە خۆمان بزانین بەو سووك سەیركردن و ڕق لێبوونەمان بەرامبەریان تۆوی خراپە و نالەباریمان لە دەروونیاندا چاندووە.

بۆیە هاوشێوەی ئەم ڕووداوە دەبینین لە لایەن چڵكاوخۆر و كاسەلێسەكانەوە بەرامبەر بەوەی كە ئەوان وا ئارەزوو دەكەن بەرهەڵستی گەل بكەن لە مافی ڕەوای خۆیان لە دەستووری هەڵبژاردنە ڕاستەوخۆكاندا، وە بۆ ئەم كارەشیان بەوە پاساوی بۆ دەهێننەوە كە گوایە: "گەل شایستەی ئەم جۆرە كارە نیە". وە زۆری تریش هەبوون پێش ئەمان لەم جۆرە قسەیان كردووە بەرامبەر بەگەل.

مل هوڕ و زاڵمان لە هەموو سەردەمێكدا خوازیاری ئەوەن كە پێویستە گەل خۆی پارێزگاری لە شەڕ و خراپەكاریەكانی خۆی بكات. بۆیە وابەستەدار بەم قسەیەی ئەمانەوە بە دیار دەكەوێت لای نووسەرێكی ئینگلیزی ناودار (جۆن ستیوارت مل) لەم بارەیەوە لە كتێبەكەیدا "لەبارەی ئازادیەوە" هاتووە و دەڵێت: "... نەتەوە پێویستی بەوە نیە خۆی پارێزگاری لە خۆی بكات. وە هیچ مەترسییەكی واش لە ئارا دا نیە كە خۆی زوڵم و زۆر بكات لە خودی خۆی. چونكە بانگی فەرمانڕەواكانیان بكە، دەبینی ئەوان خۆیان بە بەرپرسیار و دەمڕاست دەزانن و هەست دەكەن بە مەترسییەكان لە بەرامبەر ڕووداوەكاندا و خۆیانی بەرەو ڕوو دەكەنەوە... بۆیە لەم كاتەدا دەتوانن جڵەوی فەرمانڕەوایی بگرنە دەست خۆیان بە ئاسانی و بێ‌مەترسی...."[10].

ئای بۆ چڵكاوخۆر و كاسەلێسان كوانێ بتوانن و گونجاو بن تا فەرمانڕەوایی گەل بكەن و پاشان بەرهەڵستی بكەن لە فەرمانڕەوایی كردنی گەل بە خودی گەل خۆی. ئەوان خۆیان زوڵم و زۆر دەكەن لە گەل و پاشان خۆشیان دەترسن لەوەی كە گەل خۆی زوڵم بكات لە خۆی، ئەمە وەك نموونەی ئەو پیاوەی لێ دێت كە بەخراپی پەروەردەی

منداڵەکەی دەکات وپاشانیش لێپرسینەوە و سزای دەدات لەسەر خراپی پەروەردەکردن و هەڵس و کەوتی.

هەر لەم بارەیەوە ووتەیەکی بیستراویان هەیە دەڵێت: "گەل ڕۆشنبیر کە یەکەم جار پاشان دەسەڵاتی ئەوەی پێ ببەخشە تا مافی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی هەبێت" ئەمە لەو سۆنگەیەوە دێت کە ئەوان لەو بڕوایە دان ڕۆشنبیر کردن لە وەها حاڵەتێکی ئەو بڕیارەکردەییانە دا وا لەمرۆڤ دەکات هەموو شتەکان لەبەر بکات و هەستێ بە کارەکانی وەك ووتار خوێندنەوە و ئامۆژگاری و وەعز و ئیرشاد لە نێو خەڵکیدا.

چاککردنی خەڵکی بۆ هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ تەواو نابێت تەنها بە جێبەجێ کردنی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ نەبێت لە ناویاندا بە شێوەیەکی کردەیی (پراکتیکی) و ڕاهێنانیان لەسەر ئەو شێوازە جار لە دوای جار. لە واقیعدا هەموو نەتەوەیەك لە نەتەوە زیندووەکان لەسەرەتا دا لە حاڵەتێکی شیاودا نەبووە بۆ هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ پاشان چاکسازی تێدا کراوە و لەبار بووە و ڕاهاتووە لەسەری ئەوە لە دوای ئەوە.

دەگێڕنەوە کابرایەك دەبێت کوڕەکەی فێری مەلەوانی دەکات لەسەر ڕاخەر (ژێرخەری دانیشتن)... کاتێ لە گەڵیا دەڕوات بۆ ڕووبار و کوڕەکەی مەلە دەکات بەڵام کوڕە مەلە نازانێ و نقوم دەبێت لە ئاوەکەدا، کەچی باوکی لەو کاتەدا بەتووڕەییەوە بانگ دەکات لە کوڕەکەی: "مەگەر فێرم نەکردی!!" کوڕەکەشی کە لە دواچرکەکانی ژیانیدایە و ئیتر وا خەریکە دەخنکێت وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "بابە گیان... خەڵکی لەسەر ڕاخەرەکانی ژێریان فێری مەلەوانی ناکرێن!!!".

ئێمە ناتوانین خەڵکی فێری ئەوە بکەین کە هەڵس و کەوتێکی (خووڕەوشتێکی) دیاری کراوی هەبێت و هەموو مێشك و دەماغی بە ئامۆژگاری پڕ و پوچ و زانیارییە بەستووەکان "عاجیەکان" پڕ بکەین. چاکسازی مرۆڤ لە هەموو ڕووە جیاوازەکانییەوە تەواو نابێت تەنها بە پێلەبەرکردن و خوێندنەوەی شتەکان بەسەریدا و دەرس دادانی ـ وەك چۆن لە قوتابخانەکانماندا پەیڕەو دەکرێت. ئەوە "گۆڕان"ێکی دەروونی و کۆمەڵایەتیە، هەر وەك چۆن زانایانی کۆمەڵناسی بانگەشەی بۆ دەکەن، دووبارە ئەو گۆڕانەش نایەتە ئاکام و گەشە ناکات تەنها ئەگەر بێتوو هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتیە پێویستەکانی بۆ دەستەبەر نەکرێت.

★ ★ ★

لە ووتە بەناوبانگەكانی (ئەرستۆ)دا هاتووە و دەڵێت: "مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا كەسێكی مەدەنیە". مەبەستی ئەو قسەیەش ئەوەیە كە مرۆڤ لە پێكهاتەی سروشتی خۆیدا كەسێكی كۆمەڵایەتیە. لە واقیعدا مرۆڤ هەم مەدەنیە و هەم كۆیلەشە (وەحشیە)، یان كۆمەڵایەتیش و خۆپەرەستیشە لە یەك كاتدا. دووبارە ناگونجێ و ناكرێ هەمیشە پشت ببەستین بەسروشتی كۆمەڵایەتی مرۆڤ یان داوای فیداكاری و گیان بەخت كردنی لێبكەین لە پێناوی بەرژەوەندی گشتیدا هەموو كاتێك.

مرۆڤ داواكاری و ئارەزووی خۆی هەیە و دەیەوێت غەریزەكانی خۆی تێر بكات بەهەر شێوەیەك بووە. ڕاستی و حەقیقەتی خۆشی ناوێت هێندەی ئەو ئاستەی دەروونی حەزی لێدەكات و پێی خۆشە بۆ گەڕان بەدوای ئارەزوو بازیەكان و خولیاكانی خۆیدا. بۆیە كاتێك مرۆڤ هەستی بەوە كرد ئارەزووەكانی سەركوت و خەفەخان دەكرێت ئا لەو كاتانە دا جار و بار سەركێشی دەكات و حەز دەكات دەرچێتە دەرەوەی بازنەی كۆت و بەند و یاساكان یان هەر هیچ نەبێت پەنا دەباتە بەر فرو فێڵ و چاوبەست كردن لە گەڵ ئەو یاسا و كۆت و بەندانە لە پێناوی تێركردن و دامركاندنەوەی ئەو حەز و ئارەزووانەی كە هەیەتی.

حەز و خولیاكانی مرۆڤ هەمە جۆرن، زانایانیش ڕای جیاوازیان هەیە لە سەر ئەژماركردنیان. بەڵام لەبەر كورتكردنەوەیان لێرەدا دەتوانین بڵێن گرنگترین ئەو حەز و خولیایانە بریتین لە سێ شت:

١- ئارەزووە بژێویەكان.

٢- ئارەزووە سێكسیەكان.

٣- ئارەزووە خوازراوەكان (ئیعتباریەكان).

پێش هەموو شتێك مرۆڤ دەیەوێت بژی تەنانەت ئەگەر هەموو خەڵكیش مردوون بۆ ئەو ژیانە. بۆیە لە ووتەیەكی نهێنی دا هاتووە و دەڵێت: "ئەگەر لە تینووا مردوویت ئەوا دڵۆپێك ناوت بۆ نایەتە خوارەوە". بەڵام وا دەردەكەوێت هەندێ جار ئەم شانازی كردن و خۆهەڵكێشان و ریاكاریە بۆ ژیان پێچەوانە دەبێتەوە. هەر چەندە بینیومانە گومڕاكان و

 

خـۆش گوزەرانــەکان بانگەشــەی فیــداکاری و خۆبــەخت کردنیــان کــردووە لــە پێنــاوی بەرژەوەندییــە گشتیەکاندا، بــەڵام ئەمــە بەپێچەوانەوە ڕوویــداوە و تــەنها درۆ و دەلەســە بووە و هیچیتر. بێتوو گەر ئەوانە هەژار و بێنەوا و لە چینی ڕەنجدەران بوونایە و ئـەو کاتـە منداڵەکانیان دەورەیـان بدانایـە و بگریانایـە بەسـەریاندا لـە برسانا ئـەو کاتـە بۆتـان دەردەکەوت کە چەندە دوورن لە ڕاستی و حەقیقەتەوە.

لە یەکێ لە ئەفسانە ئایینەکانی سەردەمی ڕۆژانی لافاوەکەی (نـوح پێغەمبـەر ـ سڵاوی خوای لەسەر بێـت) دا هـاتووە و دەڵێـت: ئافرەتێـك منداڵەکـەی خـۆی پـێ دەبێـت و هـەڵی دەگرێت بەباوەشیەوە بەڵام لەو کاتەدا کە لافاوەکە ڕوو دەدات و وردە وردە ئاسـتی ئاوەکـە بەرز دەبێتەوە، ئیتر ژنەکە منداڵەکەی بەرز دەکاتەوە و دەیخاتە سەر تەوقی سـەری خـۆی لەبەر مەترسی نقووم بـوونی منداڵەکە.. بـەڵام تادێت ئاسـتی ئاوەکـە زیـاد دەبێـت و بـەرز دەبێتــەوە تــا دەگاتــە نزیکــی لــووتی ژنەکــە و لــەوەدا دەبێــت ئــیتر بخنکێــت لــەو کاتــەدا منداڵەکـەی دادەگرێـت و دەیخاتـە ژێـر پـێی خۆیـەوە بـۆ ئـەوەی خـۆی بـەرزتر بێتـەوە لـە مەترسی نقووم بوون لە ئاوەکە دا.

ئا ئەمەیە سرووشتی مرۆڤ لە هەموو کات و شوێنێکدا.

مرۆڤ تا دواچرکەکانی ژیانی و ئەو کاتەی ئیتر پێڵووی چاوەکانی لێـك دەنێـت و بـەرەو کۆتایی دەچێت هەمیشە هەر حەز و ئارەزووی لە ڕەگەزێکیتری بەرامبەرەکەیـەتی و بـۆی بەپەرۆشە بۆ چێژلێوەرگرتنی.

هەر بۆیەشە جاروبار دەبیستین کە هەندێ کەس بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە ئامـادەن بۆ گیانبازی و خۆبەخت کردن لە پێناوی خۆشەویستەکەیاندا. بۆیە دەبینین گەنجەکانمان ئــەم گۆرانیــە دەڵێنــەوە و چــەندەها جــار دووپــاتی دەکەنــەوە: "ژیــان خۆشەویــستیە و خۆشەویستیش ژیانە" ئەوان لەمەدا وەك ئەو برسییەیان لێهاتووە کە شـیعر و غـەزەلیاتی ئاسك و ئاوازەدار هەڵدەدات بە باڵای کولێرە و ناندا، بەڵام کاتێك خواردی و تێـر بـوو لێـی ئیتر هەر ئەڵێی ئەویش نیە و برسێتیشی نەدیوە لەمەوپێش.

پـاش ئـەوەی مـرۆڤ تێـر دەبێـت لـە نـان و چێژە سێکسیەکان ئـیتر هـەوڵی ناوبـانگ پەیـداکردن دەدات و تێدەکۆشـێت لـە پێناویـدا تـا هـەر چـۆنێك بـووە خـەڵکی بیناسـن و سـەدایەکی هـەبێت. ئەمـەش ئەوەیـە کـە نـاوی لـێ دەنرێـت بـە ئـارەزووە ئیعتیباریـەکان

(حساب بۆکراوەکان). چونکە هەر ئەو کەسەیە کە دەیەوێت لە ناو هۆز و کەس و کارەکەیدا موعتەبەر بێت و حسابی بۆ بکەن و بەپەنجە ئاماژەی بۆ بکەن لەناو خەڵکدا. هەروەها زۆربەی ئەو کەسانەش کە ئەمە دەکەن بانگەشەی ئەوە بۆ خۆیان دەکەن کە گوایە داواکاری حەق و حەقیقەت و ڕاستگۆیین، بەڵام ئەوانە لە دیوی ناوەوەی خۆیاندا تەنها داواکاری ناوبانگ پەیداکردن و خۆهەڵکێشانن و حەق و حەقیقەتیش بە لایانەوە شتێك نیە جگە لەوەی تەنها هۆکارێك نەبێت بۆ گەیشتن بەم ئامانجە زۆر خۆشەویستەیەیان.

ئەم سێ ئارەزووە (خولیایە) لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە بەشێوەیەکی نزیك لەیەك لەسەر پلە جیاوازەکان و شێوازی جیاجیا. دەشگونجێت بەشێوەیەکی مەڵاسدراو لە عەقڵی نادیار دا پاڵ بەمرۆڤەوە بنێین بەرەو ئاراستەی خواستەکانی پاڵپێوەنانێکی وا کە ئەو مرۆڤە وا هەست بکات لە وێناکردنی خۆیدا کە پاڵی پێوە نراوە (پەلکێش کراوە) لە پێناوی حەق و حەقیقەت دا...

ئەو مرۆڤەشی کە ئەتوانێت ئەم ئارەزووانەی تێر کات یان یەکێکیان فەرامۆش کات بەمرۆڤێکی ئاڵۆز و مت بوو دادەنرێت و خەفەخان دەبێت. ئا لەو کاتانەشدا ئەو کەسە هەوڵ دەدات هەناسەیەك بدات و ئاهێکی بێتەوە بە بەردا و لەو پیش خواردنەوانەی دەروونی خۆی ڕزگاری بێت جا بەهەر ڕێگایەك و هەر شێوەیەك بووە. هەر لە بەر ئەوەشە دەبینین وەك کەسێکی ئاژاوەگێر و سەرەڕۆ یان تاوانبارێك یان وەك کەسێکی بێ‌دین و کافر یان وەك دەست درێژکارێك یان وەك درۆزنێك یان وەك خوێنرێژێك دێتە پێش چاومان.

ئا لەو کاتەشدایە کە ئیتر مرۆڤ خۆی وا دێتە پێش چاو لە دەروونی خۆیدا کەسێکی بێبەش کراوە و دابڕاوە لە خەڵك و زوڵمێکی زۆری لێکراوە و کۆت و بەند کراوەتە ئەستۆی و خەڵکانی‌تری دەوروبەریشی بەکەسێکی گرفتاوی و ئاڵۆزی ڕەها سەیری دەکەن و دوورە پەرێز دەبن لێی، جا بۆیە ئەو کەسە تووشبووە لە ناخی دەروونیدا چەند هاندەرێکی نەستی گەشە دەکات و هانی دەدات بەرەو ڕووی خراپەکاری و ئازاردان و ئاژاوەگێڕی یان بۆ دزیکردن و درۆ و دەلەسە لەسەر ڕێکخستن و دەست درێژی کردنە سەر خەڵکانی‌تر هانی دەدات.

پێغەمبەری ئیسلام (موحەممەد) دەفەرموێت: "هەزاری مرۆڤ دەبات بەرەو ڕووی کوفر و بێباوەڕی". شتێکی ڕوون و ئاشکرا بە چەمکی (کوفر) لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر دا جیاوازیەکی جەوهەری وای نیە لەگەڵ چەمکی (تاوان کردن) لە پێناسەی کۆمەڵناسی نوێدا. هەردووکیان لەیەك سەرچاوەوە هاتوون بەشێوەیەك لە شێوەکان. ئەو هەژارەی لەبرساندا دەمرێت لەبەر ئەوەیە کە ناتوانێت یان چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێت وەکو (ئەبی عەتاهیە) شیعر و قەسیدە هەڵدات بە باڵای زوهد و زاهیددا و بە باڵایاندا هەڵخوێنێت، یان سرودی نیشتمانی بهۆنێتەوە بۆ نیشتمان وەك چۆن لەم سرووودە دا دەڵێت:

*"بڕۆن بۆ جەنگ بڕۆن بۆ جەنگ هەڵمەت بەرن ئەوەی عەرەب"*

جێگای خۆیەتی لێرەدا ئەم بەسەرهاتە بگێڕینەوە کە باوکم بۆی گێڕامەوە سەبارەت بەکارەساتی کابرایەکی دارتاشی هاوڕێی خۆی:-

کابرایەکی دارتاش دەبێت ڕۆژێك لە ڕۆژانی بێبازارِیدا دادەنیشێت لە دوکاندا و چاوەڕوانی ڕزق و ڕۆزی ئەو ڕۆژەی دەکات سا بەڵکو خوا بۆی بنێرێت، بەڵام زۆر دەمێنێتەوە و هەر چاوەڕوان دەکات تا تەواو بێهیوا دەبێت و نزیکی ئێوارە دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شك نابات تەنانەت نانێکی وشکیشی پێبکڕێت بۆ ژن و منداڵەکانی، لەکاتی ئێوارە و درەنگ وەختا بوو حەزی نەدەکرد بڕواتەوە بۆ ماڵەوە چونکە منداڵێکی بچووکی هەبوو وا ڕاهاتبوو هەموو ئێوارەیەك پێش گەڕانەوەی باوکی بۆ ماڵەوە ئەو لەسەری کۆڵانەکە دا ڕادەوەستا و چاوەڕوانی باوکی دەکرد پێش کاتی نان خواردن بۆ ئەوەی مژدە بدات بەوانیتر کە وا باوکی خواردنی بۆ هێناونەتەوە.

گێڕەرەوە لەسەری دەڕوات و دەڵێ: بەهەر حاڵ هەر چونێك بێت کابرای دارتاش دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە بە بێئەوەی هیچ شتێکی خواردەمەنی پێ بێت بۆ ماڵ و منداڵەکەی، منداڵەکانی دێن و لە دەوری کۆ دەبنەوە و بەدەم گریان و هەنسکەوە پرسیاری خواردنی لێدەکەن، ئەویش لەو کاتەدا سەری بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و پڕبەدەم هاوار دەکات و دەڵێت: "ئەی خوایە... تەنانەت حەرمەلەش وەك ئەم کارەی نەکردووە کە تۆ کردت بەرامبەر بە من!". [11]

ئەمە بەکوفرێکی ڕوون و ئاشکرا دادەنرێت لە ڕوانگەی پیاوانی ئایینیەوە ئەوانەی وا هەموو مەبەستێکیان خۆشگوزەرانی و یاوەریکردنی (هاوڕێیەتی کردن) ملهوڕ و زاڵمانە لەبارەی زانین و دەرك بردنیانەوە بەوەی کە دێت بەسەر خەڵکیدا بە هۆی نەهامەتی و کەبت بوونیانەوە. بەڵام بەهەر حاڵ کوفر دەبێتە پاڵنەری ئەو پیاوە لە پاڵنەرە بەهێزەکانیش دەبێت کە سەرچاوەی گرتووە لە ئارەزووە سەرکوتکراو و خەفەخانکراوەکانیەوە. هەروەك ئەو مەنکوبەی (سەرکوتکراوەی) کاتێك دەبینێت وا خوشکەکەی لەبرساندا دەمرێت، ئەویش پەلاماری نانێك دەدات لە یەکێ لە نانەواکان تا بۆی بێنێت و بیداتێ کەچی پیاوانی پۆلیسیش دەنێنە شوێنی و کونەوکون دەیفرێنن بە هەموو هێز و توانایانەوە!

شتێکی ئاساییە ئەو خەڵکانەی وا خۆشگوزەران دەژین و بەختەوەرن بەچێژ و خۆشیەکانی ژیان و ئاسوودە ئەژین ئەوا هەرگیز وەك ئەو زەلە و پەلەیە (کوفرە) نایەت بەدەمیاندا کە کابرای دارتاش کردی و ئەو دزیەش ناکەن وەك ئەو مەنکوبە نەگبەتەی نانەکەی دزی بۆ خوشکەکەی تا لەبرساندا نەمرێت، چونکە ئەمانە ئیش و کارەکانیان بەچاکی و لەسەرخۆیی بێتەنگ و چەڵەمە مەیەسەر دەبێت و بەختەوەری و ئاسوودەیی ژیانیش وای لێکردوون کە بیر لە کوفرکردن و ئەنجام دانی تاوان و دزی نەکەنەوە.

چونکە هەر ئەمانە سەرقاڵی ئەوەن دەم و دووی وتار خوێندنەوەیان تا دێ زیاتر پەرە پێبدەن و وشەی بریقەدار و وتاری ئاوازە و بەجۆش لە پیاهەڵدانی دادپەروەری و ڕاستی و بەخشش و پیاوەتی و چاکسازی ڕێك بخەن و خەڵکانی دەور و بەر و تەماشاچیانیشیان چەپڵەیان بۆ لێدەن و هات و هاواریان بۆ بکەن.

با هەر بۆ نموونە ئەو حیکایەتی ژیانە پڕ چێژەی هارونەڕەشید کە خواپێی بەخشیوە بگێڕینەوە: ئەم خوا پێداوەی ژیان پڕ لە بەختەوەری و ئاسوودە و خۆشگوزەرانە ئیمانداریکی زۆر بەهێز و تووند و تۆڵە و بیر و باوەڕی جێگیرە بەشێوەیەك ئامۆژگاری کار ناتوانێت ئامۆژگاری بکات و وەعزی دابدات تەنانەت گەر بیشیەوێت بچێتە لای ئەو سا دەبینێت چۆن هارونەڕەشید بە دەم کەف و کوڵی گریانەوە لە هۆشی خۆی دەچێت.[١٢]

ئەو بارودۆخە ئاسان و نەرم و نیان و لەبارەی هارونە ڕەشیدی تیادا ژیاوە و ئەو هەزاران کەنیزەکانەی وا ناوقەدیان دەلەرزاندەوە و سەمایان دەکرد لە نێوان دەستەکانی

ئەودا بێگومان هەر دەبێ وا لە هارونەڕەشید بکەن کەسێکی ئیماندار بە خوا و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بێت بە پاکی و پوختی. چونکە دەروونی ئەو ئارەزووە سەرکوتکراوو خەفەخانکراوەکانی تێدا نیە تا ببێتە هۆی لاسەنگ کردنی گومانەکانی، بێگومان هەر ئەو هارونە ڕەشیدەشە مەیل و ئارەزووی هەیە بۆ وابەستەبوون بەو ئایینەوە کە وای کردووە لە میلۆنەها خەڵك ڕەنجی بۆ بدەن لە پێناوی تێرکردنی ئارەزووە شەهوانیەکانی و چێژلێوەرگرتنیان تا ئەوپەڕی خۆشی.

بێتوو گەر تۆ دەیەکی ئەو کەنیزەك و سەماکەر و گۆرانیبێژانەی هارونەڕەشید ببەخشی بە منیش ئەوا بێگومان من لە ئەو زیاتر خواپەرەستی و نوێژ دەکەم و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی یەزدان دەکەم... هەروەها ڕۆژێ سێجار هێندە دەگریام لە ترسی خوا تا بەتەواوی لەهۆش خۆ دەچووم و دەبوورامەوە.

جێگای سەرسوڕمانە ئەم هارونەڕەشیدە ئیمانداره داوا دەکات لە هەموو خەڵکی کە وەکو ئەو ئیماندار بن. هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆری لەچڵکاوخۆر و کاسەلێسە دڵ ڕەقەکان تەرخان کردووە بۆ گەڕان بەدوای کافر و بێباوەڕاندا و تا دەستگیریان بکەن و بیان کوژن.

بۆیە من ئێستا هەزار جار سوپاسی خوا دەکەم کە لەو سەردەمەی ئەو فەرمانڕەوا بەختەوەرە دا دروستی نەکردم. چونکە خۆشگوزەرانی ئەم فەرمانڕەوایە و بەفیڕۆدان و لووت بەرزیەکەی لەسەر حسابی نەتەوە بێگومان وای لێدەکردم کافر و بێباوەڕ بم، جا ئەو کاتەش وەیل جێگەم دەبوو لە دەست چڵکاوخۆر (جەللاد) و جەندرمەکانی ئەهلی ئیمان.



هەر چەندە ئێستاش وا دەردەکەوێت چڵکاوخۆر و جەندرمەکانمان جیاوازیەکی زۆریان نەبێت لەگەڵ ئەو فەرمانڕەوا بەختەوەرەدا. چونکە ئەمانەی ئێستا باوەڕیان بەدیموکراتیە و فرمێسکی گەرمی بۆ دەڕێژن و هەروەك تینووی بەر ئاون بۆی و بەتەنگیەوەن، وە هەر لە پێناوی ئەو دیموکراتیەشدایە خەڵکی زیندانی دەکەن یان دەیانکوژن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان جێبەجێی ناکەن و پەیڕەوی لێ ناکەن، ئا لێرەدایە کە ئەمانەش وەك هارونەڕەشید وان و هاوشێوەی ئەون، چونکە ئەویش لەترسی

خوا گریانێکی زۆر بێشومار دەگریا و فرمێسکی هەڵدەڕشت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای نەدەکرد. زۆر بەئاشکرا دەبینرا ماڵ و موڵکی نەتەوە و دەوڵەتی بە هەوانتە دابەش دەکرد بەسەر کەنیزەکانی و دەست و پێوەندەکەی خۆیدا بە بێئەوەی هیچ لەخوا بترسێت...

تەنانەت ئەو کاتانەی ئیتر لێ دەبوویەوە لە دابەش کردن و پەخشان و تەخشان کردنی ئەو شتانەی دەیبەخشیە کەسانی دەور و پشتی، ئەوجا دەهات دادەنیشت و چێژی وەردەگرت و ئاسوودە نەبوو بەیادکردنەوەی خوا و چاوەکانی لە تاوان هەڵدەنیشتن لە فرمێسك.

بۆیە ئێستا دەبینین چڵکاوخۆر و جەندرمەکانمان دەیانەوێت ئەو نەمری و شکۆمەندیەی هارونەڕەشیدمان بۆ بگەڕێننەوە سەردەمی ئێستامان بەهەموو وێرانکاری و کوشت و بڕەکانیەوە، پەنا بەخوا. چونکە ئەم جەندرمە و کاسەلێسانەی ئێستامان هەستاون بە ناونانی هەموو ئەوشتە گەورە و پیرۆزانەی کەبە لای خۆیانەوە گرنگە ناوزەدیان کردووە بەناوی ئەوەوە هەر لە ئەنجامی ئەم کارەشدا ئەم شێوەناولێنانانە هاتوونەتە ئاراوە بۆ نموونە وەك: شەقامی ڕەشید ـ پایتەختی ڕەشید ـ سەربازگەی ڕەشید و چەندانیتریش لەم بابەتە، هەروەکو ئەوەی مێژوو خاڵی و خەواڵا بێت لە هەموو ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزانەی کە چاکەخواز و شکۆمەند بوون، کەس دەست ناکەوێت تەنها ئەم نەبێت جێ ناوی بگرنەوە.

وەرە بڕوانە بزانە ئەم نەتەوەیە پیاوانی وەك: موحەمەد و ئەبوبەکر و عومەری کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی وە بەرهەم هێناوە و پێگەیاندووە، گوایە شکۆمەندی و ڕێز و پیرۆزی ئەمانە ناگەنە ئاستی ئەو پیرۆزیەی هارونە ڕەشیدێك کە خاوەنی کەسایەتیەکی دووفاق (دوو ڕوو) و هەروەها ویژدانێکی دوو لەت بووە.

من هەر لەوە دەترسم ئەم بارودۆخە یارمەتی دەر بێت بۆ ئەم چڵکاوخۆر و جەندەرمانە تا وای لێ بێت بتوانن بەتەواوی هەموو نەمری و شکۆمەندیەکانی ئەو پیاوەمان (هارونە ڕەشید) بۆ بگەڕێننەوە و زیندووی کەنەوە بەسەرماندا بە تەواوی و بێ نووقسانی و کەم و کوڕی ـ جا ئەو کاتە کارەسات و بەڵا گەورەکە ڕوو دەدات.

★ ★ ★

ئێمە ئەو ئایینەمان ناوێت کە بەهۆیەوە پیاوانی هاوشێوەی وەك هارونە ڕەشید یان ئەوانەی ماڵ و سەروەتی نەتەوە بە فیڕۆ دەبەن بۆ خۆیان و دەست و پێوەند و کاسە لێسەکانیان، یاخود ئەو ملهوڕ و زاڵمانەی وا گەل دەچەوسێننەوە و پارووی دەمی خەڵکانی ڕەش و ڕووت گل دەدەنەوە.

ئێمە بەئازادی و ڕاشکاوانە دەڵێین ئەو ئایینەمان دەوێت کە بەهۆیەوە پیاوانی وەك: "موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا"مان پێشکەش دەکات. چونکە سەیری ئەم فەرموودە بەنرخەی دەکەین دەفەرمووێ: "خوایە بەهەژاری بمژێنە و بەهەژاریش بممرێنە و لەگەڵ هەژارانیشدا حەشرم بکە" ئەوسا دەزانین چەند گەورە و بەڕێز و پایەبڵندە.

یان سەیری پیاوێکی وەکو عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەکەین کاتێ ئامۆژگاری یەکێ لە کاربەدەست و فەرمانڕەواکانی خۆی دەکات و پێی دەڵێت: "پایەکانی ئایین و کۆکردنەوەی موسڵمانان و خۆسازدان بەرەو ڕووی دوژمنان: بە هەموو چین و توێژەکانی نەتەوە دەکرێت، لەبەر ئەوە گوێیان لێبگرە و لەگەڵیاندا بە بەهەموو دڵێکەوە... ئیتر خۆشیت".

ئێستا بۆمان روون بوویەوە کە ئەوەی دیمان لەمەوپێش دوو ئایینی جیاوازن لەیەك، هەر ئێستاش وەختی ئەوە هاتووە یەکێکیان بۆ خۆمان هەڵبژێرین!



دەبێ ئەوەش بزانین کە شارستانی و پێشکەوتووەکان مێژووی نەتەوەکانی خۆیان لەبەر رۆشنایی بیر و باوەڕەکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتیدا دەنوسنەوە، ئەو دادپەروەریە کۆمەڵایەتیانەی وا لەم چاخەی ئێستاماندا پرشنگی ڕووناکیەکەی بڵاو بۆتەوە و پەخشان دەبێت بەهەموو لایەکدا.

بۆیە پێویستە لەسەر ئێمەش لەم کاتەدا مێژووی نەتەوەکەی خۆمان بنووسینەوە لەبەر رۆشنایی ئەو بیر و باوەڕە دادپەروەریەی کە ئیسلام هێنای لە گەڵ خۆیدا.

